✓ ناوی کتێب : سیخوڕە مەترسیدارەکان لە مێژوودا
✓ نووسەر : جمال الکشف
✓ وەرگێڕان : ڕەوەند حەسەن
✓ تایپ : مەریوان مەنتک
✓ دیزاین و بەرگ : خەلیل هیدایەت مام شێخ " ٤٩٢٤٢٦٣ "
✓ تیراژ : (١٠٠٠) دانــە
✓ نرخ : (٤٠٠٠) دینار
✓ شوێنی چاپ : چاپخانەی ڕۆژهەڵات / هەولێر
✓ لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمـارەی سپاردنی ( ٨٠٢ ) سـاڵی ٢٠٠٩ ی پێ دراوە.

◆◆ لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر ژمارە ٣٨

## ◆ پێشەکی ....

.سـیخوڕی پرۆسـەی تینوشـکاندنی سـەربزێوی و تێرکردنـی ئـارەزوی سووسەکردنە، خولیایەکی زکماکیە بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری و، ئاشکراکردنی نهێنیە شارستانی و سەربازییەکان لەڕێگای: کۆڵینەوە، بەدواداگەڕان، سـەرنج و تێبینـی و، پـشکنین و بەدواداچـون و دزینـی بەڵگەنـامەو دیکۆمێنـت و وێنەگـرتن و لەبەرگـرتنەوەی بەڵـگەو ڕاپۆرتەکان، هەروەها زانیاری دەربارەی پرۆژەکان و سەربازگەو چەک و دامەزراوەکـان، لەگەڵ گەلـێ شـێوازی ئاشـکرای ڕەوا و ئـامرازە قەدەغەکراوەکـان کە ئەنجامـدانیان: یـان تـاوانێکە بەرەو هەڵـدێری

خیانەتی گەورە، کەژیانی ئەنجامدەرانی هەندێ جاردەگەیەنێتە سزای هەڵواسین یاخود قارەمانیەتیەکە خاوەنەکەی دەگەیەنێتە پلەی ڕێزلێنان و هەڵنان سیخوڕی یەک لەم دوانەیە: یاخائینە، یاخود پاڵەوان.
سیخوڕی کارو کردەوەیەکی ناپەسەندو قێزەوەنە، چی لەدژی کەسێک یاکۆمەلە کەسانێک یا دەوڵەتێک بووبێ...
تاوانێکە لێ خۆشبوونی نییە ئەگەر دژی نیشتیمان بێ. مێژوونوسان ڕایان وایە، سیخوڕیکردن ناشرینترین پیشەیە لە جیهاندا، یەزدانیش نەفرەتی لێ کردووە کەدەفەرمووێ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ ﴾[1]
زۆربەی کۆمەڵگەکان بێزانـدویانە، ئەم بێزانـدنەش لەکۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی دیدیکە دەگۆڕێ، هەندێ کۆمەڵگا بەکارێکی تەنگ و پڕ لەشەرمەزاری دادەنێ، کۆمەڵگەش هەیە لەو بڕوایە دایە سیخوڕی بە خزمەتێکی گەورە دادەنێ، بەهەمووو پێوەرێکیش سیخوڕی کردن لەناو چوارچێوەی خۆماڵیدا کارێکی قێزەوەنە. مێژووی نزیک ئابڕو چوونەکەی (ووتەرگیت)مان بیردەخاتەوە، کە ((نیکون)) سەرۆکی ئەمریکا بە هۆی سیخوڕی کردن بەسەرپارتی نویوسزیونەوە لەسەرۆکایەتیەوە لابرا.
سیخوڕی خراپەیەکی ڕەهانیە، لەگەڵ باردا خزمەتێکی نیشتیمانی پیرۆزە کەتەنها ئازاو بوێر وسەرکێشەوێرەکەکان دەتوانن ئەنجامی بدەن، ئەوانەی خاوەنی ئامادەی خۆبەخت کردنن و پڕکێشن و خودان ویستن، ئەوانەی لەلایەن گەل و حکومەتەکانیانەوە لە بیرناکرێن و ڕێزیان لێ

[1]- الحجرات( ١٢)

دەنرێ، ئەوەنـدەش دوژمنـان نەفرەتیـان لـێ دەکەن . ((ناسـان هیـل)) سـیخوڕی ئەمریکـی، پێشی لەسـێدارەدانی لەلایەن ئینگلیـزەوە بەدەنگـی بەرزهـاواری کـرد ((بەداخەوە لەژیانێـک زیـاترم نییە تـا بە وولاتەکەمـی پێشکەش بکەم..))..ئەم وتـانە، تائێـستا هەمـوو سـاڵێ لە ئـاهەنگی یـادی لەسێدارەدانی لەکۆتایی شەڕی ڕزگاری ئەمریکاوە تاکوئێستا دەوتـرێتەوە. بێگومـان، بۆچـونی ئینگلیزیەکـان بەرامـبەربە ((ناسـان هیـل)) جیـاوازەو نەفرەتـی بـۆ دەنێـرن. ئەویـش بەهـۆی کوشـتن و لەنـاو چـونی ئەوژمـارە زۆرەی سەربازانی بەریتانیاوە بەهۆی ئەو کردەوە سیخوڕییەی ((ناسـان)) کە کۆکردنەوەی زانیاریەکان بوو بۆ جەنەڕاڵ ((جورج واشنتون)) هەمـان شت دەربارەی سیخوڕی ڕوس ((ریتشاردسورگ)) دەوترێـت، کە ڕوسـیا بەوە ڕێزی لێنا، پـولێکی پۆسـتەی بەناوەوە دەرکرد، دوای لەسـێدارەدانی بە ٢٥ ساڵ لەلایەن یابانیەکانەوە.

چـونکی وشـەی ((سـیخوڕیکردن)) هێـشتا ناشـرین و قیـزەوەنە، بـۆیە ڕێکخراوەکـان بەنـاوی ((دەزگـای موخـابەرات)) نـاوی دەهێـنن، سـیخوڕەکەش وای پـێ باشـە لەکاروبـاری فەرمیـدا نـاوی ((ئەفـسەری موخـابەرات))ی پـی بڵـێن. پیـشەکەشی بـۆکەس ئاشـکرا ناکـات. نەوەکـو ڕێزو دەسەلاتی خۆی لەدەست بدا، سیخوڕی گرنگی و پێویـستێتی خـۆی لەکـاتی شـەڕو ئاشـتیدا سـەلماندووە، هەر لەو دەمەوە کە ((تەحتمـسی سـێهەم)) سیـستەمێکی بۆدانـا. تـاکو ئێـستا فەرمانـدەکان پـشتیان پـێ بەسـتووەو یـارمەتی داون بۆشکستی بە دوژمـن هێنـان بەزیـانێکی کەم و لەمـاوەیەکی کورتـدا. نـاپلیون لەم بـارەیەوە وتـویەتی((یەک سـیخوڕ هامتەقای ٢٠٠٠٠ شەرکەرە)).

هەر کەسـەدەی بیـستەم بەشـەڕە یەک لەدوای یەکەکـانەوە هـات، دەوڵەتە زل هێزەکـان گرنگیـان بە ئامـادەکردنی سـوپایەکی سـیخوڕو مەشـق پێکـردن و بلاوپێکردنیـانی دا. ژمـارەی سـوپای موخـابەراتی

سـوڤیاتی لەپـۆپەی هێزیـدا گەیـشتە ٢٠ ٠٠٠ سـیخوڕ. لەجیهانـدا بڵاوبوونەوە. ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش هەروای کرد، هەروەها بەریتانیاو فەرەنساو چین و یابان و ئیسرائیل و مسر و ولاتانی دیکەش هەمان هەنگاویان نا. ئەستەمە لەسەدەی بیستەمدا ولاتێک هەبووبێ بێ سیخوڕی کردن، ئەگەر هەبووبێ، ئەوا دەبێ پشت بە باڵیۆزخانەکانی ببەستی بۆ پەیداکردنی ئەو زانیارییانەی کە مەبەستێتی، هەروەها ــ دەبێت ــ بۆ پێویستی ئاسایشی نەتەوەیی خۆی دەستەی قەلاچۆکردن و لەناو بردنی سیخوڕێتی دامەزرێنێ، ئەمەش جۆرێکی دیکەی کاری سیخوڕی دەوێ.

لەوکاتەوە شەڕی دووەمی جیهانی کۆتایی پێهات سیخوڕی کەوتە چالاکی و بلاوبووەوە، کەوتە کۆکردنەوەی زانیاری لەدوژمنان و هاوپەیمانان ولاتە بێ لایەنەکان. گرنگی بە زانیاری سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتی و پیشەسازی و بەڕێوەبردن دەدا سەرەڕای سەربازی، ئەویش بە بەکارهێنانی هەر ڕێگایەک کە زانیاری دەست بکەوێت لە وشکانی و دەریاو ئاسمان، بەهۆی فڕۆکە وا غەواسەو مانگە دەسکردەکان و بۆقەمرۆییەکانی ژێر ئاوو نیراوە دیبلۆماسی و بازرگانی و ڕۆشنبیری و وەرزشی. سیخوڕی قوتابخانەو شێوازی تایبەتی خۆی پەیدابوو. کە سوپایەک لەسیخوڕان کاری بۆ دەکەن و ڕۆڵێکی گرنگ و ناسک دەبینی لە دروستکردنی مێژوودا. هیچ نووسەرێکیش ناتوانێ سەرجەم سەرکێشیەکانیان بخاتەڕوو تۆمار بکات بە ملیۆن سیخوڕ بە درێژی زەمەن پەیدابوون کەپێی دەڵێن ((هونەری ڕەش)) بەلام زۆر کەمیان توانی جێ پەنجەی خۆی لەسەر لاپەڕەکانی مێژوو بە جێ بهێڵێ...

چونکی ڕاستەوخۆ دەستیان هەبوو لە دارشتنی قەدەر و چارەنووسی میللەتان. لەزاکیرەی زەمەندا ناوی خۆیان لەنێوان فەرماندە نەمرەکاندا

هەڵکۆڵی، یا لە نێوان تاوانبارانـدا، سیماو خەسڵەتیان دەکەوێتە نێوان ئـازایەتی و ترسنۆکی، لەنیـوان ئـاوەزی و بـێ مێـشکیدا، هـیچ شـتێکش بەیەکیـانەوە نابەسـتێت غەیـرە: توانـای سـەرنجدانی بەهێـزو قـوڵ، زۆر وریایی، نەهێنی نەدرکاندن...

ئەم کتێبە دەربارەی مێژووی سیخوڕییە بەدرێژایی سەدەکان، سیخوڕە هەرە دیاروخاینەکان، لەگەڵ پێشکەوتن و گۆڕانی هۆکانی موخابەرات لە وشـکانی و دەریـاو ئاسـماندا، لەکـاتی شـەڕو ئاشـتیدا. بەکـورتی بەسـەرکردنەوەیەکی هێمنـانەیە لەجیهـانی وروژێـنەری سەرسـوڕهێنەر جیهانی سیخوڕو سیخوڕایەتی.

◆ ◆ **دانەر**

## ◆ ◆ سیخورە دێرینەکان ◆ ◆

مرۆڤ هەر بە زگماکی و لە سەرەتای بوونەوە کاری سیخوڕی ئەنجام داوە، بۆ دەست نیشانکردنی جێگای ڕاوی زۆری بەکارهێناوە، بۆ زانینی جێگای میوەو ئاوو جێگاو ڕێگای بێ وەی، کە لە توڕەیی سروشت و جانەوەران و مرۆ دەیپارێزێ ...

بەپێی داب و نەریتی کۆمەڵگاکان سیخوڕی لەکۆمەڵگایەکەوە بۆیەکی کە وە دەگۆڕێ، بۆنمونە لەلای یابانیەکان مۆرکێکی چەسپاوە،[*] بەوڕادەیە هاوسێ سیخوری لەسەر هاوسێکەی خۆی دەکات بێ ئەوەی بەشەرم و شکۆی بزانێ. سیخوڕیکردن بەشێکە لە ژیانی ئاسییان لە دەرەوەو ناوەوەی وڵاتەکەیان. گەلی یابان لەو بڕوایەدایە کارکردن لەبواری موخابەرات خزمەتێکی پیرۆزە، کەچی زۆربەی گەلانی جیهان لەم پیشەیە بێزارەو دەیبیزێنێ، کە لە دەوڵەتە نوێکاندا ناتوانرێ دەسبەرداری ئەم کارە بن، تەنها ئەوە بەس نیە کە دەوڵەت لەو پەڕی ئامادە باشیدایە بۆجەنگ لەکاتی ئاشتیدا ، بەڵکو دەبێ زانیاری خێراو تەواوی دەستکەوێت تا خۆی بپارێزێ، وئامانجەکانی لەنێوان دەوڵەتەکاندا بەدی بهێنێت، دەزگای موخابەرات بووەتە دەستەبەری بنەڕەتی سەربەخۆیی نیشتیمانی، نەبوونی دەزگایەکی موخابەراتی بەهێز دەبێتە مایەی شکست پێهێنانی هێزی سەربازی. هەروەها دزەکردنی سیخوڕەکان بۆ ناو ڕیزەکانی دوژمن شکاندنی ئاسان دەکات. هەر بۆ ئەم مەبەستە بوو ((تحتمسی سێهەم)) لەسەردەمی فیرعەونەکاندا یەکەم دەزگای موخابەراتی ڕێکوپێکی دامەزراند.

---

[*] Anaromy of spying _ roland seth.

## ♦ ♦ هەواڵگیری فیرعەونەکان ♦ ♦

سوپای ((تحتمسی سێیەم)) درێژەی بەئابلۆقەدانی شاری ((یافا)) داو خۆی بەدەستەوە نەدا، بێسودە هەوڵی کردنەوەی کەلەبەرێکی لەپەرژینەکان دا، کەوتە سەر ئەو بیرۆکەی تیپێك لەسەربازەکانی بنێرێتە ناو شارە ئابلۆقەدراوەکەوە، تاکو ئاژاوە بنێتەوە توشی پەشۆکان بن، ئەوجا ئەوەندەی بۆیان دەلوێ دەرگاکان بکەنەوە بەلاّم چۆن بچنە ژورەوە؟

گەیشتە سەر بیرێکی سەیروسەمەرە، بۆیە یەکێ لەئەفسەرەکانی کەناوی ((توت)) بوو، ڕونکردنەوەی، ٢٠٠ سەربازی لەنێو گونیەی ئارد ناو بەپاپۆرێك سەربازەکان و فەرماندەکەی بەرەو بەندەری ((یافا)) بەرێخست، کەسوپای میسر ئابلۆقەی دابوو، لەوێ توانیان. بچنە ناوشارەکەو، لەو کاتەو دەستکرا بەرێکخستنی بەڕێوەبردنی هەواڵگری ((مخابەرات)) لەمیسرو جیهان...

مێژوونوسان باس لەوەدەکەن کەوا تۆماری میسرییە دێرینەکان ئاماژە بۆ کاری زۆرگەورە دەکات لەبواری هەواڵگریدا، بەلاّم لەهەندێ سەردەمدا توشی لاوازی بووە، هەروەکو ئەوەی لەسەردەمی ((منفتاح))دا ڕویداوە، ئەگینا جوەکان نەیاندەتوانی بەبێ ئاگای ((فیرعەون))* لەمیسر دەرچن. دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێ، کەوا ((تحتمسی سێیەم)) شانازی بەوەنە دەکرد کە پێشەنگی سیخوڕییە، هەمیشە هەستی بەلاوازی دەکرد لەسیخوڕی کردن و کوڵگرتن، لە دوژمنان وای دادەنا جۆرە خۆئامادەکردنێکە لەتاریکی و یا پێکاندنە لەپشتەوە. هەرچەند دژی دوژمنان بوو بۆیە بەخەتی هیروغلەفی ئاشکراو ڕون لەسەر دیواری

---

* الجسوسية بين الوقاية والعلاج

پەرستگاکان هەموو ئەوکارانەی کردبوونی تۆمارکردووە، دامەزراندنی شارەکان و عەمباری دەغل و دان و ئەوشارانەی پێی هەڵساوە.. بەڵام دامەزراندنی هەواڵگری فرمانی دا بەخەتێکی لاوەکی بنوسرێت، لەژێر ناوی ((زانیاری نهێنی)) شاردییەوە.

زیاتر شانازی بەوە دەکرد مێژوو بەدەستکەوتەکانی دیکەی ناوی بهێنێ وەکو: ئاوەدانکردنەوە، دەسکەوتە جەنگی و ئیدارییەکانی و ئەوکارانەی بۆ ئاسودەیی و خۆش گوزەرانی میلەتەکەی ئەنجامی دابوو، بێ ئەوەی ئاماژە بۆ سەرکەوتنەکانی بکات لەبواری سیخوڕییەوە، بەتایبەت دانانی بناغەی سیخوڕی.

## ◆ ◆ هەواڵگیری یەهودیەکان ◆ ◆

لە دەوروبەری ساڵی((١٤٨٠ پ ن)) پەیامبەر موسا_ درودی خوای لێ بێ_دوانزە ئیسرائیلی بۆخاکی کەنعان بۆسیخوڕی هەنارد*، فەرمانی پێدان بەرەو باشور بڕۆن و ڕوو لە چیاکان بکەن وە بەوردی چاودێری ئەو ناوانە بکەن، دوای ٤٠ ڕۆژ، پیاوەکانی موساگەڕانەوە، بەرهەمی هەمەجۆری ولاتیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابووەوە، وتیان: پیاوانی ئەوێ هەموویان کەڵەگەت و بەهێزن، ولاتێکە بەشیرنەمەنی و هنگوین دەوڵەمەندە، میوەی جۆراو جۆریان، هێنابوو، بەپەیامبەر موسایان دا.

کاتێ ((یوشع کوڕی نون)) فەرماندەیی بەنی ئیسرائیلی کردو بەرێگای ئوردندا چونە خاکی ((کەنعان))، سوودی لەئەزمونی لەگەڵ موسادا بینی _ درو‌ودی خوای لێ بێ_ دووکەسی هەناردە ((ئەریحا)) بۆسیخوڕی، تاکو هێزو توانای پیاوەکانی ئەوێ و زانیاری دەربارەی قەلاکانیەوە بزانن تابتوانن داگیری بکەن، ئەودوو سیخوڕە پەنایان بردە بەر ئافرەتێک

---

* قصة موسى في العهد القديم.

بەناوی ((رحاب))، بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان و دەرچونیان لەشار بێ ئەوەی پیاوانی شا پێی بزانن، ئەمە یەکەم بەژداریکردنی ئافرەتە لەمێژوودا لەکاری سیخوڕدا. ئەمەش ڕێکەوت نیە کەسیخوڕی وەك رحاب و ماتەهاری، حیکمەت فەهمیێ کۆبکاتەوە.

## ◆ ◆ سن تزو ◆ ◆

((سن تزو)) بەپێشڕەوی سیخوڕی چینی دەژمێردرێت، ئەمە ئەوە ناگەینێ کەوا چین لەپێش سالی((٥١٠ پ ز)) سیخوڕی نەزانیوە، تەمەنی سیخوڕیەتی لەچیندا نزیکەی ٢٥٠٠ ساڵە، بەلام دەستپێشخەری بۆ((سن تزو)) دەگەڕێتەوە، کەیەکەم تۆڕی هەواڵگری تەواوکاری لە چین پێکهێنا. کتێبێکی بەناوی ((بنەماکانی شەڕ)) داناوە، کە بە کۆنترین کتێب دەژمێردرێ لەبارەی هونەری شەڕەوە بەگشتی، کە تا ئەمڕۆ لە ئەکادیمییە سەربازیەکاندا خوێنەری هەیە، ماوتسی تونگ لە ڕێپێوانە دوورودرێژەکەیدا کەلکی لێ بینیوە، یابانیەکانیش پێش هێرش بردنەسەر ((بیرل هاربور)) پیادەیان کردووە. ئەم کتێبە، کتێبێکی هەمەلایەنی بەسودە، بەڕادەیەك سەرکردایەتی هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانی، دوای ئاسانکردنەوەی لە ((سیلان)) لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانیدا بەسەر ئەفسەرەکاندا دابەشکردوە تاسودی لێ ببینن.

کتێبەکە هەواڵێکی چاکە بۆ ڕوونکردنەوەی گرنگێتی، سیخوڕەکان، بەسەر پێنج بەشدا دابەشی کردوون:

- _ سیخوڕەکانی ناوخۆ: ئەو هاولاتیانەن لە هامتەقای زانیاری پارەوەردەگرن.
- _ سیخوڕی ناوخۆ: خائنێکە لە ریزی دوژمندایە.
- _ سیخوڕە هەڵگەڕاوەکان: گریگرتەیەکە، ڕازی کراوە بگۆردرێ
- _ سیخوڕی لەناوچوو: گریگرتەیە زانیاری هەڵدەگەیێنێ، ئەگەری

کوشتن و لەناوبردنی دەکرێ.

- _ سیخوڕی بەردەوام: ڕاهێنراوە، لەوکارەی پێی ڕاسپێردراوە جێگای متمانەیە.

((سن تزو)) لەیەکێك لەو ویلایەتانە لەدایك بووە کەدەکەوێتە ئەو شوێنەی رووباری ((زەرد)) تێکەڵاوی دەریادەبێت. زۆربەی ژیانی لەخزمەتی ((هو_لو)) شای ویلایەتی ((وو)) هاوسنوری بەسەربردووە، ((سن تزو)) فەرماندەیی سوپای ((هو_لو))ی دەکردو شاری ((ینگ))ی داگیرکرد، کەپایتەختی ویلایەتی((تشو))وە بەسوپاکەیەوە ڕووی لەباکوور کرد، سوپای هەردوو ناوچەی ((تشی))و ((تشین))ی ڕاونـاو شکاند. ((سن تزو)) لەو بڕوایە دابووە، هەڵگیرساندنی شەڕ بەڕێگایەکی ئابوریو بەرگری کردن لەولآت، پێویستی بەوەدەکات سیستەمێکی سیخوڕی بەردەوام بەکاربهێنێ. تاچاودێری جموجوڵی دوژمنان و هاوسێکان وەکویەك بکات، ئەو دابەشکردنەشی زۆربە لاوە گرنگ بووەو کاری سیخوریش بەکارێکی شەریف زانیوە، تێبینی ئەوەشی کردووە، کە بەردەوام ئەو کرێگرتانە لەسەرکردە سیاسیەکانیان و فەرماندە سەربازییەکان نزیك بکرێنەوە. ((سن تزو)) لە کتێبەکەیدا ئەوەی ڕاسپاردووە کەدەبێ کرێگرتە هەڵگەڕاوەکان بەباشی لەگەڵیاندا هەڵس و کەوت بکرێ، خانوی باشیان پێ بدرێ، جارجارەش پارەی چاکیان لە باخەڵ بنرێ، چونکی دەبێتە هۆی پابەند بوونیان، هەوڵی ئەوەش بدرێ بکەونە بن کلێشەیان تاکو هاوڕێکانیان، بەرپرسەکانی پێشوویان ڕابکێشن ، بەتایبەتی ئەوانەی بەپارە و بەرتیل نەرم دەبن.

## ♦ ♦ ئەسکەندەری گەورە کۆد دادەهێنێ ♦ ♦

ئەسکەندەری مەقدۆنی، گەنجێکی بیستساڵی چۆن بۆی کراو توانی ، لەولآتە بچووکەکەی خۆیەوە ((مەکدۆنیا)) لەباکوری یۆنان، بکەوێتەڕێ و

بە ماوەی دەساڵ ئیمبراتۆرییەتێك دامەزرێنیْ، کە بەئاسیای بچوکدا تێپەڕی‌و لەشامەوە بۆمیسرو دواجا بۆ ولاّتی نێوان هەردوو رووبارەکەو ، ولاّتی فارس تا هند بڕوات ؟ مێژوو نووسان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن ئەسکەندەر تەنها بەزێری خۆی‌و ئازایەتی‌و سەربازو چەکەوە سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی بەدەست نەهێناوە، بەڵکو _سەرەرای هەموو ئەمانە_ یەکیْ لەفەرماندە هەرەگەورەکان بووە کەدەرکی بەسوودو قازانجی سیخوڕی کردووە وەکو چەکێکی شەڕ، ئامرازێکیش بووە بۆ پاراستنی بەرەی ناوخۆو بەرەنگاری کردنی سیخوڕی دژ. ئەسکەندەر ولاّتێکی داگیر نەدەکرد تا زانیارییەکی زۆری لەبارەیەوە کۆنەکردایەوە، ئەویش لەرێگای تیپی سەراسۆکردن ((استطلاع))و کاروانی بازرگانانەوە، لەسەر رۆشنایی ئەو زانیارییانە بەشارەزاییەوە پیلانەکانی دەکێشا، ئەوجا سەرکەوتنی خێراو یەکجارەکی بەکەمترین زیان وەدەست دەهێنا، خۆی سەرپەرشتی پرۆسەی هەواڵگیری دەکرد، گرنگی پێدانی ئەم لایەنەی گەیشتە ئەوەی، رێگایەکی دۆزییەوەو داهێنا بۆ ئاڵ‌و گۆڕکردنی نامە نهێنیەکان، ئەویش بەنووسینی نامەکە بەسیستەمێکی دیاریکراو لەسەر کاغەزی ((بەردی یاخود پێست)) بەگوێرەی کۆدێکی تایبەت‌و ئەو نامەیەی بەبۆرییەکی دارینەوە دەپێچا...

لەبواری بەرەنگاری‌و بەگژاچوونی سیخوڕێتی، ئەوا ئەسکەندەر یەکەم کەسە، سیستەمی ((سانسۆری پۆستەی)) بەکارهێنا، ئەم بیرۆکەیەی لەکاتێکدا بەمێشکدا هات ئابلۆقەی شارێکی فارسی دابوو لە ساڵی ((٣٣٤ پ ز)) دا، لەوە ترسا نامەی سەربازەکانی کە بۆ کەس‌و کاریان دەنــاردن، دەستی دوژمن بکەوتایەن، زیانی بەسوپای مەقەدونی دەگەیاند، بۆیە فەرمانی دا، سەربازەکان نامە بۆ کەس‌و کاریان

نەنووسن، بەلاّم بۆی دەرکەوت سەربازەکان ناڕازین، ئەسکەندەر کەوتە گومانەوە لەم ناڕازی بوونەیان، ویستی بزانیّ، ئایا پیلانیّك لەئارادایە، ئەو فەرماندەی پیّشووی هەلّگرتو داوای کرد هەموو نامەکان ببینیّ، ئیتر کۆدەکرانەوە، دەکەوتنە ژیّر چاودیّرییەکی توند ئینجا ڕیّگای دەدرا بۆ مەقدۆنیا بنیّردریّت...

ئەمە یەکەم سیستەمی سانسۆر بوو لەسەر پۆست لەجیهاندا، کە دلّنیابوو، هیچ پیلانیّك لەئارادا نیە لەنیّوان سەربازەکانیداو دلّنیابوو نامەکان هیچ نهیّنیەك و زانیارییەکی لەبارەی هەلّویّستی سوپاو پلانەکانیەوە تیّدا نییە، دەستی لە سانسۆرەکەش هەلّگرت چونکی ئەمەشیان بوو بووە مایەی گازاندەی سەربازەکانی.

## ❖ ❖ هانیبالی قرتاجی ❖ ❖

هانیبال سەرکردەیەکی لیّهاتوبوو، مەراقی ئەوەبوو دوژمنانی غەفلّەت گیربکاو ترس لەناو ڕیزەکانیاندا بلاّوبکاتەوە، لەشەڕەکانیدا پشتی بەسیخوڕیەتی دەبەست، لەڕیّگای ((جەبەل تاریق))ەوە لەشکریّکی بۆ ئیسپانیا ئەنجامداو سالّی ((٢٢٠ پ ز)) بەسەر ئیسپانیادا سەرکەوتن، بەرەو باکوور ڕۆیشت، گەیشتنە باشووری فەرەنسا، بەچیای ئەلب دا لەباکورەوە بەرەو باشوور ڕۆیشت، سەرەڕای سەرما، کەبووە هۆی لەناوچونی ژمارەیەکی زۆر سەربازو فیلەکان کەلە شەڕەکانیدا بەکاری دەهیّنان، بەرەو ڕاستاییەکانی ئیتالیا دابەزی، هەموو ئەو سوپا ڕومانیانەی تەفرو توونا کرد کە بەرەو ڕووی دەبوونەوە. ژمارەی قوربانیانی ئەو شەڕە لەدوژمن بە هەشتا هەزار سەرباز پیادەو سوارە مەزندە دەکریّ..

لەکاتی داگیرکردنی دورگەی ((سقلیە)) لەلایەن ((هانیبال))ەوە نەتوانرا یەکیّ لەشارەکان دەستی بەسەرا بگیریّ، سەرەڕای ئابلّۆقە دانیّکی دریّژ.

ویستی نهێنیی هێزی ئەو شارەو هۆی خۆراگرتنی بزانێ، یەکێ لەپیاوانی خۆی نارده ناو شارەکە، وای نیشاندا کە سەربازێکی کریگرتەیەو ئامادەیی خۆی بە فەرمانڕەوایی سقلیە نیشاندا، ئیتر بە ئارەزووی خۆی بە شارەکەدا دەگەڕا، جێگای سەختەکانی دیاری دەکرد، چۆن بەرەنگاری دەکەن، بەردەوامیش ئەم زانیارییانەی بەهانیبال دەگەیاند، لەڕێگای دوکەڵی ئەو ئاگرەی بۆ چێشت لێنان دەکردەوە، بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ و گومانی لێ بکات..

کەبەرەو ڕوما کەوتە ڕێ، ڕێگای سەرکەوتنی بۆ سوپاکەی، بەسوپایەکی سیخوڕان ئامادە دەکرد، لەدۆڵی ڕوباری ((ئەلبو))و دەشتاییەکانی خوارووی چیای ئەلب، زانیاریان کۆدەکردەوە، سەبارەت بەهێزەکانی دوژمن و ورەی خەڵکەکەو سوپاکەو خاکەکەی بەپیتە یان نەء، جۆرەکانی بەرهەمی کشتوکاڵی، لەبەر ڕۆشنایی ئەم زانیاریانە پیلانی شەڕەکانی دادەنا.

## ◆ ◆ بەزێنەری فیلەکان ◆ ◆

### سیبیو ئەفریکانوس

((سیبیو))بەوە ناوبانگی دەرکرد،ئەو تاکە فەرماندەرەیە کە بەسەر((هانیبال))دا سەرکەوت لە جێگاو شوێنی خۆیدا، بۆیە نازناوی ((ئەفریکانوس))یان پێ بەخشی،

لەم سەرکەوتنەدا قەرزاری سیخوڕەکانێتی، کێشەی ئەو لە ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپای ((هانیبال)) ئەو فیلانە بوون کە چوون چەکێکی داماڵێنەر بەکاریان دەهێنا،

بۆ ئەوەی ((سیبیو)) بەسەر کێشەی فیلەکاندا سەرکەوێت، سیخوڕەکانی بۆ سەربازگەکانی هینبال هەنارد. لەگەڵ ئەوانەی فیلەکانیان بەخێودەکرد تێکەڵ بوون، لەڕێگای ئەوانەوە، زانیان خاڵی

لاوازی فیل لەوەدایە بێزاری بکەی، بێزار بوونیشیان لەوەوە دێ گوێیان لە دەنگە دەنگ و هەرای گەورە بێت. کەهەردوو سوپاکە ڕوو بە ڕووی یەك بوونەوە، سوپاکەی ((سیبیو)) بەلێدانی تەپڵ دەنگە دەنگ و ژاوەژاویان بەرپاکرد، ترس و شڵەژان کەوتە فیلە کانەوە، سەربازەکانی هانیبال دەسەڵاتیان بەسەر فیلەکاندا نەما، بەمجۆرە ((سیبیو ساڵی ٢٠٣ پ ز)) سەرکەوتنی وەدەست هێنا. لە لەشکرکیشیی دژ بە ((سایفاکی))ی شای ((نومیدیا))کە هاو پەیمانی هانیبال بوو، ((لالیوسی))ی برای وەك نوێنەرێك بۆ وتوویژ نارد تا ئاگربەست بکەن، بەڵام مەبەستی سەرەکی ئاگربەست نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوە بوو تواناکانی دوژمن بزانێ، لەگەڵ براکەیدا، چەند ئەفسەرێکی بە جل و بەرگی کۆیلەوە ڕەوانەکرد تا((سایفاکی)) گومان نەکات، بەڵام هونەرو فێڵی بەکار هێنا بۆ دوور خستنەوەی ((لالیوس))و هاوڕێکانی لە جێگای سەختە سەربازییەکان ((لالیوس)) بە پیاوانی خۆی ڕاسپێردبوو، نەقیزەی ئەسپەکان، گوایە مێش و مەگەز پێوەی داون، کەئەسپ حیلانی و ترسا، هاوڕێکانی لالیوس دوای ئەسپ کەوتن، بەشێوەیەك هەموو سەربازگەکەی بینی، خاڵە بە هێزو لاوازەکانیان دەستنیشان کرد، وت و وێژی ئاگر بەست سەری نەگرت، ((سیبیو)) هێرشی کردە سەر شارەکەو ئاگری لە قەڵاو شوێنە سەختەکان هەڵاسیاند و((سایفاکی))ی ناچارکرد سوڵح بکەن

## ♦ ♦ یەهوزای ئەسخەریوتی ♦ ♦

عیسا_دروودی لێ بێ_ لەگەڵ حەوارییەکاندا خۆیان لەناو بۆستانێکدا شاردەوە ویستیان ئەو شەوەی تیا بەسەر بەرن. لەپڕ ترپەی پێ و دەنگی چەك بێ دەنگیەکەی شڵەقاند، کۆمەڵی کەس دەرکەوتن شمشێرەکانیان بەدەستەوە بوو، لەدووری چەند هەنگاوێکەوە وەستان، ((یەهوزای

ئەسخەریوتی)) لە مەسیح هاتە پێشەوە، لە باوەشی کرد، ماچێکی ڕیاکارانەی ژەهراوی کرد، کەئەوە ئاماژەیەك بوو لە نێوان یەهوزاو سەربازەکاندا، تا کەسی مەسیحیان پی نیشان بداو بناسێنێ، یەهوزا دەبێ بۆ درندەترین تاوانی لەمێژوودا ئەنجام دا؟ حەزرەتی عیسا دروودی لێ بێ، هەموو توانای خۆی بۆ چاکە تەرخان کردو هەوڵی دا یەهودییەکان بخاتە سەر ڕێگای دروستو فەرمانەکانی موسا بەجێ بهێنن کە لایاندابوو، هەوڵی ئەوەی ئەوەی لەگەڵ دەدان هەموو گرنگی پێدان بۆ کۆکردنەوەی سامان نەبێ، لەهەمان کاتدا هەژارو دەست کورتەکانیان هان دەدا ئەوەشی هەیانە پێشکەشی سنوقی هەیکەلی بکەن، تاهەموو ئەو زێڕو سامانە لەخەزنەکانی خۆیانیان دانێن، لەناو یەهودییەکاندا تاخمێك بڕوایان بە ڕۆژی لێپرسینەوە نەبووە، پاداشتو سزایان بەدرۆ دادەنان، کۆمەڵو تاخمێکی دیکەشیان خەریکی بەزمو ڕەزمی خۆیان بوون. عیسا ڕێگا نەما لەبەری نەگرێ بۆ هێنانیان بۆ سەر ڕێگای ڕاستی، تا لەو هەڵەو سەرلێ شێواندنەیان ڕزگار بکات، کەهەنەی یەهودییەکان، بەمەترسی ئاشکرابوونی نهێنییەکانیان کرد، شێت گیربوون، هانی ڕۆمەکانیان دەدا، پیاوانی سیاسەتیان تێدەگەیاند کە ئەمانە تێکدەرنو مایەی ئاژاوەو فیتنەنانەوەنو بەربەرەکانی دەسەڵاتداران دەکەن، کەهەنەکانو پیاوانی دەسەلات دژی حەزرەتی عیسابوون بەیەك، لەلای دەسەڵاتداری ڕومانی ((بلاتس نبتی)) تومەتی جادوگەرییان بۆ هەڵبەست، ((کیافارس))ی گەورە کاهینی یەهودییەکان توانی قەناعەت بە دەسەڵاتدار بکات کەوا بڵاوبوونەوەی داوای حەزرەتی عیسا دەبێتە مایەی لەناوچوونی دەسەڵاتەکەیو تێکدانی، بەکافر ناویان برد، هەموویان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن لەناوی بەرن، کەوتنە چاودێری کردن، بۆ کوێ دەڕۆیشتن بەدوایەوە بوون بە نیازی

لەناوبردن و کوشتنی، بەڵێنی پارەو پاداشتیان دا بەوەی شوێن و ڕێی ئاشکرا دەکات، دەیانویست بەبێ دەنگی و نهێنی بیکوژن و کەس پێی نەزانێ. نەکو کوشتنەکەی ببێتە مایەی نارەزایی و هەڵگیرسانی شۆڕش، ئەوەی جێی موخابنە ((یەهوزای ئەسخەریوتی)) بەدەنگیانەوە هات، کەیەکێك بوو لە دوانزە هاوڕێکەی... شوێنەکەی پێ وتن و سەربازەکان دەستگیریان کرد، بەڵام یەزدان لە شەڕی ئەوانە ڕزگاری کرد، پەروەردگار لەبەر چاو ونی کرد، چاویان بەیەکێ کەوت کە زۆر لە حەزرەتی عیسا دەچوو. بەشێوەیەکی دڕندانە ئەو پیاوەیان دەستگیرکرد، ئەویش لە ترسان زمانی بەستراو نەیتوانی هیچ بڵێ، لەخاجیاندا لەسەر چیای زەیتون. لە خاجیاندا ئەو پیاوەش یەهوزا بوو، ئەو سیخوڕە خائینە بوو، چی وایکرد یەهوزا ئەو تاوانە مێژوویە بکات؟ هەندێ کەس لەو بڕوایەدان، لەبەر ئەوەی سیخوڕی کرد بۆ پارە کە سی پارچە زیو بوو، هەندێ کەسیش بەویستی خودای دەزانن کە یەهوزا ببێتە پەندێك و خەڵکی پێ وشیار بێتەوە

## ◆ ◆ هەواڵگیری لە سەرەتای ئیسلامدا ◆ ◆

لەو کاتەوە پێغەمبەر محەمەد (د.خ) لەمەکەوە بۆ مەدینە کۆچی کرد، لەگەڵ ئەبوبەکری سدیقدا موسلمانان زیاتر پێویستیان بە هەواڵگیری هەبوو. دوای کۆچی پێغەمبەر چەند کارێك ئەنجامدرا:

- دەنگ وباسی ڕۆژانی یەکەمی کۆچکردنەکە: لەڕێگایاندا بەرەو مەدینە، لەئەشکەوتی ((حەرائ)) سێ ڕۆژ مانەوە، عبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر دەنگوباس و هەواڵی موسڵمانان و کافرەکانی لە مە ککە پێ دەگەیاند.
- دەستەی ((عەبدوللاّی کوڕی جحش)) لەساڵی دووەمی کۆچیدا، پێغەمبەر((د.خ)) عبدولاّی کوڕی جەحشی ڕاسپارد کە چاودێری

جولاّنـەوەکانی قوڕەیـشیەکان بکـاتو ئاگـای لـە دەنگوباسـیان هـەبێت، وادەگێڕێتەوە. کەوا پێغەمبەر((د.خ)) نوسـراوێکی بـە ((کوڕی جەحش)) داوەو داوای لێ کـردووە تـا دوو ڕۆژ ڕێکـردن ئـەوجا بیکاتـەوەو ئـەوەی تێیدایە پەیڕەوی بکات.

کە نوسراوەکە لەکاتی خۆی دەکاتەوە ئەمەی تیادا نوسـرابوو: ((ئەگـەر تەماشـای ئـەم نوسـراوەت کـرد، بـڕۆ تـا دەگەیتـە دارخورمایـەك لـەنێوان مەککــەو تــایف، لەوێــدا قوڕەیــشیەکان دەبینــی، دەنــگو باســیان بهێنــەرەوە)) عبــدللاّی کــوڕی جــەیش، نــاوەڕۆکی نوســراوەکەی بـەهاوڕێکانی دەگەیـەنێ، بـەرەو جێگـای مەبەسـت کەوتنـەڕێ بـۆ کـاری سەراسۆکردنی هێـزی کافرەکـان، توشـی سـێ کـەس هـاتن کە خۆیـان لـە کـاروانی قوڕەیـشیەکان دواخـستبوو بـە مەبەسـتی دەسـکەوتنی زانیـاری لــەبارەی هێزەکــانی موســڵمانەکانەوە، ((عەبــدڵلاّی کــوڕی جــەیش))و پیاوەکــانی لەگــەڵ ئــەو ســێ کەســە بەشــەڕهاتن، یــەکێکیان لێ کــوژرا، دوانەکەی کەیان بردنە لای پێغەمبەر _ د.خ _ بۆ لێپرسینەوە.

## ♦ ♦ چاوەکانی عەلی کوڕی ئەبی سوفیان ♦ ♦

: لەشەڕی بەدری گەورەدا، پێغەمبەر _ د.خ _ لەمەدینە دەرچوو، لەگەڵ هاوڕێکانیـدا کەوتنـەڕێ تالـە ((سـەفرا)) نزیـك بوونـەوە. یـەکێکی هـەنارد تادەنگوباسـی ((ئـەبی سـوفیانی کـوڕی حـەرب))ی بـۆ بهێنـێ، چاوەکان ئاگاداری کردەوە کەوا قـوڕەیش چـوونە بـۆ لای ئـەبی سـوفیان بـۆ ئـەوەی نەهێڵن حوشترەکانیو بازرگانیەکەی بکەوێتە دەستی موسڵمانەکانەوە، جارێکی کە لەغەزای بەدر دا پێغەمبەر _ د.خ _ دوو کەسی لەموجاهدین نـارد تـا زانیـاری سـەبارەت بـەهێزی کـافران کۆبکەنـەوە، یـەکێکیان، دوولاوی قوڕەیـشیان بینـی ئاویـان لـەبیری بـەدر دەردەهێنـا، هێنانیـانی بۆلای پێغەمبەر _ د.خ _ پرسیاری ژمارەی ئەم حوشترانەی لێ کردن کە

بۆ سوپاکەی سەردەبڕن، وەڵامیان دایەوە وتیان: هەندێ ڕۆژ دە حوشترو هەندێ ڕۆژ نۆ حوشتر سەر دەبڕن، بەوە پێغەمبەر _ د.خ _ ژمارەی شەڕکەرانی کافرانی زانی، کە لەنێوان ((٩٠٠ _ ١٠٠٠)) شەڕکەرن، چونکێ نەریتی عەرەب وابوو، بۆهەر ١٠٠ کەسێ حوشترێکیان سەردەبڕی.

## ◆ ◆ عەلی کوڕی ئەبی تالیب ◆ ◆

پرۆسەی شوێن گومکێ، کە عەلی کوڕی ئەبی تالیب ئەنجامی دا، یەکەم پرۆسەی موخابەراتی نەبووو دوا کردەوەش نەبوو، پێغەمبەر _ د.خ _ دوای شەڕی ئوحد فەرمانی پێدا، شوێن کافرەکان بکەوێو بەدوایانەوە بێ تا لە مەبەستیان تێدەگات. تەماشای کرد، نزیك ئەسپەکان نەکەوتن و سواری حوشتربوون. بۆی دەرکەوت بۆ مەککە دەگەڕێنەوە، دوای ئەوەی تەرمی موسلمانەکانیان شێواند، ئافرەتەکانیان لووتی تەرمەکانیان هەڵدەتلیشاندو گوێیان دەبڕی‌و ملوانکەیان لێ دروست دەکرد. ((هند کچی عەتەبە)) سکی حەمزەی مامی پێغەمبەریان دڕی، پێغەمبەر فەرمانی دا، لاشەکەی حەمزە داپۆشن، ئەمجا نوێژی مردوانی لەسەر مامی و ٧٢ کوژراوەکە بەست و فەرمووی بیاننێژن..

## ◆ ◆ فێڵکردنی نەعیم کوڕی مەسعود ◆ ◆

پێغەمبەر _ د.خ _ ئاگادار بووەوە کەوا قورەیشیەکان خەریکی خۆ تەیارکردن لەگەڵ ((بەنی غەتفان)) دا، هەوڵی ئەوەش دەدن، هۆزی ((بنی قريظة))و ((بنی أشجع)) بەلای خۆیاند ڕاکێشن و لەو پەیمانەی کە لەگەڵ پێغەمبەردا بەستوبویان پەشیمانیان بکەنەوە، بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان لە شاری ((مەدینە)). پێغەمبەر فەرمانی دا سەنگەر لەدەوری ((يثرب)) هەڵکەنن، کە ئەمە یەکەم جارە کاری وابکرێ، ئەمەش بەلای کافرەکانەوە جێگای سەرسوڕمان بووو لە هێرشکردنە سەر

مەدینـە دوای خـستن، هـەروا بوونـە نێـچیرێکی ئاسـان تـیر هاوێـژەرانی موسلمانان، بەو جۆرە موسلمانان، سەرکەوتن، بەتایبـەتی قورەیـشیەکان هیوایـان ئـەوەبوو ((غطفـان))و ((بنـی أشـجع)) بێنـە تـای ئـەوان، بـەلاّم وا دەرنەچوو، ئەویش بەهۆی ((نعیم بن مسعود))ەوە، بزانین چی کرد؟

((نعیم بن مسعود)) لـە پیـاو مـاقولاّنی ((بـني غطفـان))ە، بە نهێنـی ببووە ئیسلامو هۆزەکـەی پیـاون نەدەزانی، چووە لای پێغەمبـەر _ د.خ _ پێـی ڕاگەیاند، کەوا قورەیشیەکانو ((بنـی غطفان)) ئەو دوو هۆزی هـان دەدەن ((بنـی قریظة))و ((بنـی أشـجع))، _ تالە پەیمانی خۆیـان پاشـکەز ببنـەوەو خیانـەت لـە موسـلمانەکان بکـەن. ((نعـیم)) گـوتی مـن لـەژێر فەرمانـدەی ئێوەدام، پێغەمبەر داوای لێکرد هـەوڵی تێکدانی ئـەو پیلانـە بدات بەهـەر چۆنێك بێت.

((نعـیم)) چـووە لای ((بـني قریظـة)) هـیچ چـەکێکی پـیّ نـەبوو، لەچـەکی فێڵو تەڵەکەبازی نەبیّ، وایکرد ناکۆکی بخاتـە نێـوان قـوڕەیش‌و غطفـان، دوو دڵی‌و گومـانی لەدڵیاندا چاند، وشیـاری پـیّ دان، کـەبارو دۆخ گۆڕا پــشتیان لیّ دەکــەن وازیــان لیّ دێــنن، دوای ئــەوەی هاوپــەیمانی موسـلمانەکانیش لەدەسـت دەدەن، بۆ ڕاسـتی نیازیـان ئامۆژگـاری کـردن کـەوا داوای بارمتـە لـە قـورەیش‌و غطفـان بکـەن، کـەپیاوانی ئەشـرافیان وەکو بارمتە دانێن، بۆ ئەوەی ڕاستگۆیی خۆیان بسەلمێنن..

((نعــیم)) دوای ڕازی کردنیــان بــەجێی هێــشتن، ئینجــا چــووە لای قوڕەیشیەکان‌و غطفان، پێـی ڕاگەیانـدن کـەوا بنـی قریظـە نیازیـان خراپـە بەرامبـەریان‌و ئـەو هاوپەیمانیـە ناکـەن کـە ئێـوە داواتـان لیّ کـردون، حەزبـەوە دەکـەن لەگـەڵ موسـلمانەکاندا بمێننـەوە، نوێنـەریان بـۆلای پێغەمبـەر نـاردووە، پـەیمانیان تـازە کردۆتـەوە، نیازیـشیان وایـە ئـەو بارمتانـە لەئەشـرافی قـورەیش‌و غطفـان بەدەسـتی موسـلمانەکانەوەیان

بدەن تاسەریان ببرن.. قورەیشیەکان و هۆزی غطفان ((عکرمە بن أبی جهم)) لەگەڵ چەند کەسێکدا بۆلای ((بنی قریظة)) نارد، داوای لێکردن خۆیان بۆشەڕ ئامادە بکەن، داواکەیان دایە دواوە بەبیانووی ئەوە کە ڕۆژانی شەمە شەڕ ناکەن، مەرجی ئەوەشیان دانا کە چەند پیاوێکی ماقوڵ بە بارمتە دابنێن، کەلای ((بنی قریظة)) بمێننەوە، نەکو پەشیمان ببنەوە لەپەیمان کاتی کار دەگاتە تەنگانە. قورەیشیەکان و غطفان بەم مەرجە ڕازی نەبوون، هەموو لایەکیشیان بڕوای بە قسەکانی((نعیم بن مسعود)) هێنا کەڕاستی کردووە، ناکۆکی کەوتە نێوانیان، دواجا مەسەلەی سەنگە ر _ خندت _ کە جێگای سەرسوڕمانیان بوو، موسلمانەکان سەرکەوتنیان وەدەست هێنا. دەگێڕنەوە پێغەمبەر _ د.خ _ لەفتوحاتەکانیدا، پشتی بەکاروانی مەککە دەبەست، کەلایەنگرانی لەمەککە زانیاریان پێ دەدان، بەلاَم کافرەکان کەسیان دەست نەدەکەوت لەمەدینە لەبارەی ((ئەنصار))و موسلمانەکانەوە زانیارییان پێ بدات. پێغەمەر _ د.خ _ موسلمانانی تەمێ دەکرد کە نهێنیەکان نەدرکێنن، چونکی دەبێتە هۆی سەرکەوتنیان بێ خوێن ڕشتن و کوشتار، هەروەکو ئەوەی لەپێش گرتنی مەککەدا، پێغەمبەر _ د.خ _ فەرمانی دا ((موسلمانان نهێنیەکانیان بپارێزن، ئەوەی لەدڵیاندا شاردراوەتەوە ئاگاداری بن، ڕەنگە بێ خۆ ئامادەکردن قورەیش زەبریان پێ دەبەن بەبێ فێڵ و زەحمەتیەوە دەچنە ناو مەککەوە، ئیتر خوێن لەوێدا نارژێ، وکەس ناکوژرێ، و شەڕ بەرپا نابێ، دوژمنایەتیش ڕق وکینەی دادەمرکێنەوە))*

---

* ص٢٣٧- قصص القمان - محمد احمد جادالمولى.

### ◆ ◆ ڕاپۆرتی بشیرالخزاعی ◆ ◆

نمونەیەکی ڕاپۆرتی پیاوانی هەواڵگیری سوپای پێغەمبەر _ د.خ _ وتەیەکی ((بشرالخزاعی))یە بۆ پێغەمبەری خودا _ د.خ _ : ((چوومە ناو قوڕەیشیەکانەوە بۆ وەدەست هێنانی نهێنیەکانیان و تاوەکو دەنگ و باسیان بزانم ، لەوێدا زانیم بەهاتنی تۆ دەزانن، وتەکانیشت پێیان گەیشتووە، نازانم ئەو هەواڵە بەلایانەوە چۆن دەبێ، و چۆن هەواڵی ئەو خەونەیان زانیوە.. یاپەیام بەری خودا، دەرچون و پێستی پلنگیان لەبەرکردووە، پەیمانیان داوە نەهێڵن بچنە ناو مەککەوە. ئەم کارەیان بە ((خالدی کوری وەلید)) سپاردووە، ئەو سوارەی مەیدانیانە، وادەرچووە بۆ پێشوازیت بە سواری ئەسپەکەوە، ڕەنگە ئێستا لە ((کراع الغمیم)) بوو بێ .)) .

### ◆ ◆ سیخوری سەدەکانی ناوەراست ◆ ◆

لەسەدەکانی ناوەڕاستدا سوپاکان ژمارەیان کەم بوو، چەکەکانیان سەرەتایی بوو، ئەوەی بیویستایە سەرکەوتن مسۆگەر بکات، دەبوایە چەکی سێهەمی بخاتە کار.. چەکی موخابەراتی، تاوەکو ماوەی شەڕەکە کورت بکاتەوە، زیانەکان کەم بکاتەوە، و پلانەکانی سەرکەوێ و لای دوژمن چاوەروان نەکراو بێ هەم بۆ ئەوەی تەنگەتاوی بکات و ڕێگای بەهانا هاتن و ئازوقەو چەکی لێ ببڕێ، نەهێڵی بەئارەزوی خۆی بجوولێ و ناچاری خۆ بەدەستەوەدانی بکات، ئەمەش تارادەیەکی زۆر دەکەوێتە سەر ئەوەی تاچەند زانیاری بارودۆخی دوژمنی دەست کەوتووەو لەلایە، لەلایەنی ژمارە، چی یان هەیە، پلانیان کات، ورەی سەربازەکان، لایەنی لاوازی و لایەنی هێزی سوپاکە، وە وەکو مەرجێکی سەرەکی سەرکەوتن دەبێ دوای پشت بەخودا بەستن، ئامادە باشیەکی تەواو لەسوپای شەڕکەردا هەبێ، ئەگینا بەنرخترین زانیاری بێ کەلکەو دادی نابێ، بۆ

ئەمەش گەلێ نمونە لەبەر دەستدان .

## ◆ ◆ شکست هێنانی شا هارولد ◆ ◆

ئینگلتەرا لەپێش شا هارولد لەسەدەی یازدەهەم، دەسەڵاتدارێکی دیکەی بەخۆوە نەبینی بوو وەکو ئەو گرنگی بە موخابەرات بدات. هەموو زانیارییەکی لەبارەی پلانی ((ولیم القاتح)) لەبەر دەست دابوو لە هێرشەکەیدا بۆ ئینگلتەرا: کاتی هێرش کردنەکە، شوێنی دابەزینی سوپاکەی، ژمارەی ئەو سەربازانەی ((ولیم)) کۆی کردبوونەوە، چۆنیەتی بەرێوەبردنی شەڕەکە، لەگەڵ ئەمەشدا ((هارولد)) شکستی هێنا، نەك لەبەر ئەوەی زانیاری لەو بارەیەوە نەبوو، هەڵەی موخابەراتەکەشی نەبوو، بەڵکو سەربازەکانی لەشەرکردن بێزاربوون، نەخۆشیان تێدا بلاّ بووەوە، دوای ئەوەی بەپێ ماوەیەکی دوورودرێژ ڕێیان کردبوو .

## ◆ ◆ لە ئاسا بەدەرەکانی نینچا ◆ ◆

بێجگە لەشا هارولد، لەناو دەسەلاتدارانی ئەوروپادا کەسی کە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا گرنگی بە موخابەرات نەدەدا. بە پێچەوانەی دەسەڵاتدارانی ڕۆژهەڵات، ڕەنگە ئامۆژگارییەکانی ((سن تزو _ صن تزو)) ی چینی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای چیندا بلاّوبووبێتەوە و یابانیەکان و مەغۆلەکانش زانیاریان لێی پەیداکدبوو.

لە یابان، هونەری ((نینچا)) دەرکەوت، کەناوێکە لەوشەیەکی یابانیەوە وەرگێراوە بەمانای ((نەبینراو)) یا هونەری ((شاردنەوە)) کەیابانیەکان لەسەدەی دوانزەهەمدا لەلایەن تاخمێك گەنجی ((ساموڕایی)) یەوە دەکرا، دەڵێن خۆیان واڕاهێنابوو دەیانتوانی بەسەر ئاودا ڕێ بکەن، لەکاتی خۆدەرنەخستن و شاردنەوەدا زانیاری وەدەست بێنن و خۆیان لەبەر چاوان ون بکەن _ هەرچەندە ئەمە هەندێ زیادە ڕۆیی تێدایە . بەلاّم بەسەختی ڕاهێنانیان دەکرد، هەر لە منداڵیەوە خۆیان بۆئەم کارانە

ئامادە دەکرد. وەك بەسەر پەتدا ڕێکردن، خۆهەڵواسین بە چڵی دارەوە بۆ ماوەیەکی زۆر، مەلەکردن لەژێرئاودا بۆماوەیەکی دوور، بوونە مامۆستای خۆشاردنەوە، خەڵەتاندن و سەرانسۆیی ((استطلاع)) لێرە ئەو ناوەیان بەسەردا سەپێنرا: ((نینچا)) بەم توانایەنەوە لەو کارانەی دەیانکرد سەرکەوتنیان وەدەست دەهێنا، چ وەك سیخوڕێك یاخود وەکو سەربازێکی جەنگاوەر. ئەمە پایەیەکی بەرزودیاریان پێ درا لە کۆمەڵگای یابانیدا .

## ◆ ◆ جەنگیز خان ◆ ◆

وا دەردەکەوێت مەغۆلەکان لەسەردەمی جەنگیزخاندا، سیخوڕییان بەوپەڕی ماناوە بەکار بردووە، ((ئیمپراتۆری جەنگاوەری ئازا)) _ بەزمانی خۆیان ناوەکەی ئەوە دەگەیێنێ _ نەیدەتوانی دەسەڵاتی لە مەنگۆلیاوە تادەروازەکانی وڵاتانی عەرەب بسەپێنێ بەبێ پلانێکی تۆکمەوە پتەو، .. پلانی پتەوو تۆکمەش پێویستی بەزانیاری ورد دەبێت، کە سیخوڕە لێهاتوەکان کۆیان دەکردەوە، لە نەتەوە جیاجیاکان، بازرگانە گەڕۆکەکانی ڕادەسپارد کەبەو وڵاتەدا بلاوەی لێ بکەن کەنیازی داگیرکردنی هەبوو، زانیاریەکانیان تۆماردەکرد، ئەوەیان بەچاودەبینی و دەژنەوت، دەیان نوسییەوەو دەیاننارد، هەندێ جار جەنگیزخان شارەزاترین فەرماندەی خۆی بۆ کارێکی سیخوڕی زەحمەت دەنارد، لەوانە: فەرماندەیەك ناوی ((سبتنای)) بوو، یەکێکی دی بەناوی ((نوین)) بوو.

## ◆ ◆ سبتنای تەتەر هەڵدەخالاتێنێ ◆ ◆

سپتنای لەو فەرماندە سەربازییە دیارەکانی سوپای ((جەنگیزخان)) بوو، کە کەوتە سەر کەڵکەڵەی شەڕی تەتار، وای پیشاندا کە لەگەڵ ((سبتنای)) دا تێکیداوە، داوای لێ کرد بڕواتە لای فەرماندەی تەتارو

وای نیشان بدات کەلە جەنگیزخان جیابۆتەوەو ناکۆکن، دەیەوێ بێتە پالْ تەتەر، بۆ ئەوەی بڕوای پێ بکەن هەندێ زانیاری ناڕاستی پێ وتن، گوایە سوپای مەغۆل دوورن ، لەژێر شەوە بەنهێنی زانیاری بۆ جەنگیزخان دەنارد، لەپڕ تەتەر ئەوەندەیان زانی مەغۆل هاتونەتە سەریان، بۆیان دەرکەوت ((سبتای)) سیخوڕ بووە و فێڵی لێ کردوون بەلاّم دوای چی …

### ♦ ♦ نوین لە چین ♦ ♦

جەنگیزخان، ((نویون))ی بە هێزێکی سوارەوە بۆ یارمەتی ئیمپڕاتۆری چین نارد، تا ئەو یاخی بوونە کپ بکەنەوە کە دەسەلاّتداری هەرێمی باشوور سەرکردایەتی دەکرد. جەنگیزخان، زۆر ڕقی لەئیمپڕاتۆری چین بوو، ((نویون))ی ڕاسپارد زانیاری پێویست کۆبکاتەوە تا هێرش بەرێتە سەر چین، ((نویون)) ڕاسپاردەکەی بەجێ هێنا، جەنگیزخانیش سوودی لەو زانیاریانە وەرگرت لە دانانی پلانی شەڕەکەدا.

### ♦ ♦ دامەزراندنی موخابەراتی دیبلوماسی ♦ ♦

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەورووپا زۆرشتی لەبارەی گەلانی ڕۆژهەلاّتەوە نەدەزانی، شتێکی ئەو تۆیان لەبارەی مەغۆل و تەتار کە بەرەو ناوەڕاستی ئاسیا کشابوون نەدەزانی، هەروەها سەبارەت بە ئیمبراتۆرییەتی بیزەنتی و سولافە ڕۆژهەلاّتییەکانیش زانیارییان کەم بوو … دەربارەی موسلمانانی ڕۆژهەلاّت زانیارییەکانیان ڕوکەشی بوون . بۆیە دەسەلاّتدارەکانیان کەوتنە هەڵەی سیاسییەوەو بەرەو ڕووی مەترسی گەورە بوونەوە، لەئەنجامی هەڵسەنگاندنی هەڵە ناڕاستی بڕیارەکان کە لەسەر بێ بنەمایی و نەبوونی زانیاری ورد بنیات دەنران، ئەنجامەکەشی ئەو زیانە زۆرەیان بوو لێیان کەوت لەکاتی شەڕی سەلیبیدا، چونکی موسلمانانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستیاندا بەهەند

وەرنەگرت و لەهەڕەشەی تورکیش باش نەگەیشتن. لەگەل تێپەربوونی ڕووداوەکاندا، گرنگی زیاتر بە زانیارییەکان درا، چەند هەولێك لەم بارەیەوە درا، بەوە کۆتایی هات موخابەراتی دیبلوماسی دامەزرێنرا، بەم شێوەی خوارەوە:.

- ئیمبراتۆر فردریکی دووەم ((١٢١٢ _ ١٢٥٠)) هەولیدا پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ دەسەلاتدارانی موسلماناندا دامەزرێنێ .
- لویسی نوهەمی فرەنسی ((١٢٢٦_١٢٧٠ ز)) نێراوی بۆ ولاتی مەغۆل نارد، زۆر سودی نەبوو، بەلام بازرگانە ئیتالیەکان زانیارییەکی زۆریان دەست کەوت. کەزۆر کەم دەسەلاتدارانی ئەوجای ئەوروپا ئەمەیان دەکرد.
- لەسەدەی پانزەهەمدا، بواری بازرگانی لەنێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا فراوان بووەوە، شارەکانی ئیتالیا لەدەرەوەی ولات بالێۆزخانەی هەمیشەییان دامەزراند. بالیۆزخانەی بوندوقیە ناوبانگی دەرکرد لەچالاکی وەدەستهێنانی زانیاری گرنگ و ورد.
- لەسەدەی شانزەهەمدا، ئەوە سەلمێنرا کە دیبلۆماسی پەیوەندی بەکاری سیخورییەوە هەیە، زۆربەی دەولەتەکانی ئەوروپا بالێۆزخانەی خۆی لەدەرەوە دامەزراند، کەبالێۆزەکان زانیاریان بۆ ولاتەکەی خۆیان دەناردەوە. کۆمەلگا بە چاوی سیخوڕ دەیانڕوانیە بالێۆزەکان، تائێستاش حکومەتەکان بەوریاییەوە هەلس و کەوت لەگەڵ بالیۆزەکاندا دەکەن، بەتایبەتی ئەو بالێۆزخانانە کە دەسەلاتدارانی ئەوروپا لەوکاتەدا دایان مەزراند، بنەمای تۆرێکی ڕێکخراوی سیخوری بوو
- لەسەردەمی شاژن ئەلیزابیت یەکەم شای بەریتانیا، لورد ((بورجلی)) پۆستی وەزیری دەرەوەی پێدرا، ڕایان سپارد دوای پلانی کاسولیك لەبەریتانیا بکەوێ، دەستی کرد بە پێکهێنانی یەکەم تۆوی

موخابەراتی ئینگلیزی، کاروباری ئەو دەزگایەش درایە دەستی ((فرانسیس ویلسنگهام)) کە باسی یەکەم دەزگای موخابەراتی دەکرێ لەمێژوی ئینگلتەرادا ناوی ئەو دەبرێت، ئەوکاتە بە دەزگای خزمەتی نهێنی ناسرابوو.

## ◆ ◆ فرانسیس ویلسنگهام ◆ ◆

ویلسنگهام پرۆتستانتێکی توندڕەو بوو، لە گەنجێتیدا یاسای خوێند، لە ترسی شاژنی کاسۆلیك ((ماری تیوردور)) بۆ ئەوروپا هەڵات، ئەو شاژنە ساڵی ١٥٥٣ز هاتە سەر تەختو دەستی بە ئازاردانی پرۆتستانتەکان کرد، دوای پێنج ساڵ کە ((ئەلیزابیت)) بووە جێنشینی، هەستی بە ئارامی کردو گەڕایەوە ئینگلتەرا.

لەدەرەوە شارەزاییەکی پەیداکردو فێری بوو، سەرنجی ((لورد بورگلی)) وەزیری دەرەوەی ئەوسای ڕاکێشا، چاودێری کاری سیخوڕی ئەوروپای پێ سپارد، توانی تۆڕێکی سیخوڕێتی تایبەت لەناو دەربای شای فەرەنسادا دامەزرێنێ، گەلێ ڕاپۆرتی گرنگی دەسکەوت دەربارەی ئەو پیلانانەی کە شای فەرەنسا لەگەڵ جزویت دا خەریکی چنینی بوون، لە دژی شاژن.

لە ساڵی ١٥٦٩ز، ((ویلسنگهام)) بۆ ئینگلتەرا بانگ کرایەوە، بە سەرۆکی دەزگای خزمەتی نهێنی دامەزرێنرا، دواجا دوای ساڵێك بۆ فەرەنسایان ناردەوەو پلەی بالیۆزی ئینگلیزیان پێ دا، سەرەڕای سەرۆکایەتی هەموو کرێگرتەو سیخوڕەکان لە فەرەنسادا، کە ((بورجلی)) کرایە وەزیری خزانە لە ساڵی ١٥٧٣ز، جارێکی کە ((ویلسنگهام)) هێنرایەوە بۆ ئینگلتەراو کرا بە وەزیری دەرەوە، لەگەڵ سەرپەرشتی کردنو بەڕێوەبردنی تۆڕی موخابەرات لەناوەوەو دەرەوەی بەریتانیا.

ویلسنگهام، ئەوەی لە توانایدا بوو کردی، بەڵام شاژن ((ئیلیزا بیتی

یەکەم)) زۆر ڕەزیل بوو، بۆ ئەوەی ئەنجامی باشی دەست کەوێت، لە گیرفانی خۆی خەرجی کارەکانی دەدا، تا بەهەژاری و کۆمەڵێ قەرزەوە کۆچی کرد.

ویلسنگهام، ئەو نێردراوانەی بۆ دەرەوە دەنێردران، دەیخستنە ناو بازنەی گومانەوە، تا دڵسۆزی خۆیانیان دەسەلماند. کاتێ ((سیر ئەدوارد ستافورد)) ساڵی ١٥٨٣ز کریە باڵیۆزی ئینگلتەرا لە پاریس، ویلسنگهام کەوتبووە بەر گوێی کە لە ئیسپانیەکان بەرامبەر سیخوڕێ کردن بۆ ئیسپانیا پارەی وەرگرتووە، دەیزانی کێشەیەکی وا لە ئارادایە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەو بارەوە نەبوو، یەکێ لەباوەر پێکراوەکانی بەناوی ((زۆجرز)) ڕاسپارد، چاودێری ((ستافۆرد)) بکات.

ڕاپۆرتەکەی روجرز ئەوەی دەسەلماند، کەوا ستافۆرد پێوەوی گلاوە، بەڵام هێشتا ئازاد بوو، چونکی ویلسنگهام وای دەبینی، باوەڕپێکردنی زیاتری ئیسپانیەکا بە ستافۆرد، دەبێتە مایەی ئەوەی، هەرچی بڵێ بڕوا بکەن، لەو ڕێگایەوە دەتوانرێ زانیاری ناڕاست بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئیسپانیەکان ، پێیان بدرێت، بێ ئەوەی ستافۆرد هەست بەم یارییە بکات، بەدادگا نەدراو هیچ تۆمەتێکیشیان ڕووبەڕوو نەکرد.

لە ساڵی ١٥٨٦زدا، ((ماری تیودر)) شاژنی ئەسکتلەندا لە ئینگلتەرا بەندکرابوو، شا ئەلیزابیتی یەکەم، وای دانابوو مەترسی هەیە بۆ تەخت و تاجی ئینگلتەرا، ((ماری)) پەیوەندی هەبوو کە پیلانگێڕە کاسۆلیکیەکانەوە لە ڕێگای نامەی کۆد دراوەوە دەخرایە ناو بەرمیلی ئازوقەو دەگەیشتە دەستی شاژنی بەندکراو. شاژنیش، بەهەمان شێوە، لەناو بەرمیلە بەتاڵەکاندا نامەی دەنارد، ئەم فێڵە، لەلایەن کەسێکەوە بەناوی ((گیلبرت گیفۆرد))ەوە ڕێکخرابوو، ((ماری)) ئاگای لەوە نەبوو کەوا گیفۆرد بۆ ((ویلسنگهام))ی سەرۆکی دەزگای خزمەتی نهێنی

ئینگلیز کار دەکات، کە هەموو نامەکانی ((ماری)) بۆ ماوەی سێ مانگ پێ دەگەیشت، خۆی بە وشیارییەوە لێ بێ دەنگ کرد، چاوەڕێی بەڵگەیەکە ڕاستەقینەی لە ماری دەکرد، ئەویش لە یۆلیۆی ساڵی ١٥٨٩ز بەرپابوو، هاوڕێ پیلانگێڕەکان لە نامەیەکدا ئاگاداریان کردەوە کەوا پلانێك ئامادەیە بۆ شۆڕشی کاسۆلیكو شەش کەس تەرخانو ئامادەن بۆ کوشتنی ((ئەلیزابیت))و خستنەسەرتەختی ماری، تا ببێتە شاژنی تەختی بەریتانیا،

ویلسنگهام، ویستی ناوی ئەو شەش کەسە بزانێ، لە جیاتی تۆمەتبارکردنی شاژنی بەندکراو، داوای لە شارەزای کۆدکرد تاکو پەرەگرافێك بخاتە سەر وەڵامدانەوەکەی شاژن ماری، کە دەڵێ: ((زۆرم پێ خۆش دەبێ ناوی ئەو گەنجانە بزانم کە کارەکە جێ بەجێ دەکەن، لەوانەیە، منیش ڕای خۆم لەو بارەیەوە دەرخەمو سوودێکی هەبێ)).

بەڵام ((ویلسنگهام)) پێویستی بە ناوەکان نەبوو، زۆری نەبرد پیلانگێڕەکان ترس دایانی گرتو خۆیان بەدەستەوە دا، ((ماری)) یش حوکمی هەڵواسینی بۆ دەرچوو...

سەرەڕای ئەو بودجەکەمەی کە شاژن ((ئەلیزابیت)) بۆ دەزگای موخابەراتی دانابوو، ویلسنگهام سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە بەکارهێنانی سیخوڕەکان لە دەرەوەو ناوەوەی وڵات. زۆر پێویست بوو تۆڕی موخابەرات لە ئیسپانیا فراوانتر بکات، دوای ئەوەی پیاودکانی لە ئەورووپا ئاگاداریان کردەوە، کەوا شای ئیسپانیا، ((فیلیپ دووەم)) بڕیاری داوە بەشەڕ بەریتانیا بگرێ، دوای ئەوەی لەوە هێوابڕ بوو بە ئاشتی بیگرێ، کە شاژن ئەلیزابیتی یەکەم ڕازی نەبوو شووی پێ بکات....

ئەم دەنگو باسە بە ڕاپۆرتی ورد سەلمێنرا کەوا پلان دانراوە بۆ هێرش

کردن، ئەو راپۆرتانە ((سیر ئەدوارد ستافۆرد)) بالّیۆزی ئینگلیز لە فرەنسا دەینارد، سیخوڕێکی چالاکی ویلسنگهام لە ((فلۆرانسا)) بوو، ناوی ((ئەنتۆنی ستاندن)) ناوی خۆی گۆڕیبوو بە ((بۆمبیو بلیجرینی)) توانی نوسخەیەکی ئەو راپۆرتەی کە مارکیز ((سانتا کروزا)) فەرماندەی ئەستولی ((ئەرمادا)) دابوویە شا فیلیپ، کە ئەم زانیارییانەی تیادا بوو: ژمارەی کەشتیەکان و چەکەکانیان، سەربازەکان و چەك دارەکان، دەریاوانەکان، عەمباری چەك و تەقەمەنی و ئازوقە، شوێن و جێگای یەکەی ئەستولەکە، کاتی کەوتنەڕێ، ئەو شوێنانەی هێرشی بۆ دەکەن.... ((ستاندن)) لە راپۆرتێکی دیکەدا، دەلّێ: شا فیلیپ چەند نوێنەرێکی بۆ ((جەنەوا)) ناردووە، داوای قەرزی کردووە بۆ خەرجی ئەم لەشکرکێشیە، شاژنی بەریتانیا دەستپێشخەری کردو دەسەلاّتدارانی جەنەوای لەوە وشیار کردۆتەوە کە قەرز دان بە شای ئسپانیا، کارێکی دۆستانە نییەوئەگەر بیدەن دژی ئێمەیە ....

((ویلسنگهام))تۆڕی موخابەراتی دەرەوەی لە سالّی ١٥٨٧ز فراوان کردەوە، کرێگرتەو پیاوانی لە : نانسی، وروین، لاهاڤر، دییب، هەبوون، لە ((کراکاو)) موخابەراتی بەهێزتر کرد، بۆ چاودێری کردنی فاتیکان بەرامبەر ئیسپانیا، هەندێ لە پیاوانی راسپارد لە بەندەرو کەنارەکانی فرەنسا و ئیسپانیا بگەڕێن، راوچییەکان و ئەوانەی کەشتی دروست دەکەن بەکرێی گرتن، تا چاودێری جم و جوّلّی ئەستولی ئیسپانیا بکەن.

ویلسنگهام هەندێ قوتابی و نووسەری هێنایە نێو دەزگای موخابەراتەوە، دوای ئەوە خستینیە ژێر هەندێ تاقیکردنەوەی دیاریکراوەوە، ئەمانەی بۆ سیخوڕی رەوانەی ولاّتە ئەوروپیەکان کرد، تا بەسەر پلانگێرە کاسۆلیکیەکانەوە سیخوڕی بکەن، لەوانە: رۆماننووسی ئینگلیزی ((کریستۆفر مارلو)) کە لە بارودۆخێکی ئالّۆزو نادیاردا لە

شەڕێکدا لە یەکێ لە چێشتخانەکان کوژراو بکوژەکەشیان ((فریزەر)) لەبەر هۆیەکی نادیار ئازاد کرد. لەو سیخوڕانە یەکێکی بەناوی ((رۆبرت پولی)) لە نزیکی کەنارەکانی بەریتانیا، بەهەمان ژمارەو کەرستەو کەشتیەوە کە راپۆرتەکانی ((ستاندن)) ئاماژەی بۆ کردبوو.

ویلسنگهام. سەرکەوتنی ولأتەکەی بەسەر هێزی دەریایی فیلیپ دا بینی و دوای دوو ساڵ لە ساڵی ١٥٩٠ز کۆچی دوایی کردو شاژن ئیلیزابیت ٣٤٦ جونەیهو دوو شلنو شەشە بنس قەرزاری بوو.

سیخوڕێکی ئیسپانی لە ئینگلتەراوەبۆ شا فیلیپی دووەمی نووسی دەڵێ: ویلسنگهام مرد، لێرە خەمێکی زۆری بۆ دەخۆن))، شا لە پەراوێزی نامەکەدا نووسیبووی: بەڵێ، لەوێ خەمو لێرەش دەنگوباسی خۆش..........)).

### ◆ ◆ کریستۆفەر مارلو: ◆ ◆

کریستۆفەر، شاعیرۆ نووسەرێکی شانۆی بەناوبانگ بوو، سیخوڕێکی لێهاتووش بوو، لەکاتی خوێندنی لە زانکۆی کامبرج بەهرەکانی سەرنجی ((جون دی)) ڕاکێشا، کە فالگری شاژن ((ئەلیزابیتی یەکەم)) بوو، داوای لە ((سیر فرانسیس ویلسنگهام)) کرد بیهێنێتە ناو دەزگای خزمەتی نهێنیەوە، لە ساڵی ١٥٧٨زدا، سەرۆکی کەنیسی کاسۆلیکی ((دوق دی جوین)) دەستی بە هەوڵدانی ڕزگارکردنی برازاکەی ((ماری)) شای ئەسکۆتلەندە کرد لە تۆڕی شاژن ئەلیزابیت دەری بهێنێ و ڕزگاری بکات، دەستی بە میوانداری قوتابخانە کاسۆلیکە ئینگلیزەکان کرد لە قەلأی ((جزویت)) لە ((ریمز)). بەو نیازەی بە پیلانێکەوە بیانگلێنی و دژی تەختی ((تیودور)). کە ویلسنگهام زانی. کاهین ((رۆبرت بارسونز)) توانیویەتی کۆمەڵێ کریگرتە لە کامبریج پەیدا بکات، بڕیاری دا، بۆ دزەکردنو چوونە ناو موخابەراتی ((جزویت)) یەکێ بەکاربێنێ دوو

لایەن بێ، بچێتە پەیمانگای جزویت تاکو سەروبەری ئەو پیلانە بزانێ کە کە لەوێدا خەریکی ئەنجامدانین، بە ئومێدی ڕزگارکردنی ژیانی ((ماری)) لە هەڵواسین کە ئەوەندەی نەمابوو جێ بەجێ بکرێ......

((کریستۆفەر مارلو))کرێگرتەیەکی بۆ ئەم کارە هەڵبژارد، ساڵی ١٥٧٨ز ((کامبریج)) بەجێ هێلا، کە لە مانگی تەموز گەڕایەوە، بەڕێوەبەرایەتی زانکۆ بانگی کردو پرسیاری دەوام نەکردنی بێ مۆڵەتی لێ پرسیو بۆ چی چووەتە پەیمانگای ((جزویت)) لە ((ریمز)). بە ئاشکرا ناحەزی خۆی دەربڕی بەرامبەر سیستەمی پرۆتستانتی لە ئینگلتەرا، ئەوەشی ئاشکراکرد کە نیازی ڕێکخستنی بزوتنەوەیەکی بەرنگاربوونەوەی کاسۆلیکی هەیە لەوێدا، ((کریستۆفەر)) توانی ناوی پیلانگێڕە سەرەکیەکان بزانێ، گەڕایەوە ئینگلتەراو ئەو زانیاریانەی بە ویلسنگهام دا، وەرزیری دەرەوەو سەرۆکی دەزگای خزمەتی نهێنی فەرمانی دا، هەموو تاوانەکان کە دراونەتە پال کریستوفەر لابدرێنو ڕێگای پێ بدرێ لە زانکۆی کامبریج دەست بە خوێندن بکاتەوە.

بەرەبەرە کریستۆفەر، لەبەر چەند هۆیەك کە تا ئێستا نەزانراوە چی بوون، ڕێزو پایەو پلەی دۆڕاند، لە مایسی ساڵی ١٥٩٣ز، لە ماڵی ((تۆماس ویلسنگهام))ی ئامۆزای وەزیری دەرەوە، گرتیان، دواجا بە کەفالەت بەربوو، دوای ئەوەی بەهۆی هەندێ تۆمەتەوە کە ئەگەری زیندانی کردنی هەبوو خستبوویانە ژێر لێپرسینەوە.

دوای تێپەڕبوونی دە ڕۆژ لە مەیخانەیەکدا لە ((دیتفۆرد)) لە شەڕێکدا کوژرا..... دەنگۆی ئەوەش هەیە نەمردووە، مەسەلەی کوشتنەکەش شانۆگەرییەك بووە تا بتوانێ بە ناسنامەی نوێوە بۆ ئەوروپا هەڵبێ.....

مەزندەی ئەوە دەکرێ، ((مارلو)) قوربانیەك بووبێ لەناویان بردبێو لە لایەن ((فریزەر))ەوەش ئەنجام دراوە، کە بەفیتی دەزگای نهێنی، کە بێ

لێکدانەوەیەکی ڕێ تێچوو بەڕەللا کرا، هەروەها کەس هۆی بوونی ((روبرت پولی)) لەوێدا نەزانی _ کە سیخوڕێکی ویلسنگهام بوو _ کە لە کاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا لەوێ ئامادەبووە......

## ◆ ◆ ئوبریتشنینا یەکەم موخابەراتی ڕوسی ◆ ◆

دەزگای ((ئوبریتشنینا)) یەکەم دەزگای موخابەراتی سیاسی ڕوسی بوو، ((ئیڤان)) ساڵی ١٥٦٥ز دایمەزرانووە، لەوکاتەی کە دوقی مۆسکۆ بووەو بەر لەوەی ببێت بە قەیسەر، ئەو دەزگایە ٦٠٠٠ کەس بوون، هەموویان جلی ڕەشیان دەپۆشی و سواری ئەسپی ڕەش دەبوون، زینی ئەسپەکانیان وێنەی سەگێك و کسکێکی لەسەر نەخش دەکرا کە ڕەمزی بێزاندنی خائینەو هەوڵدانی لەناوبردنیانە.

ئەوانەی لەم دەزگایە کاریان دەکرد، دەسەڵاتێکی ڕەهایان هەبوو، لەگەڵ ((حەصانە)) یەکی بێ سنوور، ئەمە وای کردبوو، وەکو دڕندەیەك هەڵس و کەوت بکەن، نیچیرەکانیان نوبەلاو خاوەنی زەوی‌وزارەکان‌و چینی ئورستکراتی بوون، کە ((ئیڤان)) لە لیستی خائینانندا تۆماری کردبوون، گەلێکیانی لە سێدارەدا، زۆریشی بۆ ((کازان)) دوورخستەوە؟، کە دوا تەمەنیان دەبووایە لەوێ بوایەن، تا موڵك‌و سامانیانی دەست بەسەرا گرت.

پیاوانی ((ئوبریتشنینا)) ترس‌و دڵەراوکێیان لە شارەکاندا بڵاودەکردەوە، زۆربەی دانیشتوانی ((نوفجورود))یان سەربڕی لەماوەی پێنج هەفتەدا، دڕندانەترین توندەتیژیان دەربارەی ئەو شارە ساڵی ١٥٧٠ز ئەنجامدا. حەوت ساڵ ئەو بارودۆخە بەردەوامی هەبوو، بەسەردەمی ترس ناوبرا.....

دواجا هەر خۆی ترسی ئەوەی لەبەر کەوت، دەزگاکە بەهێز ببێ، بۆیە هەڵیوەشاندەوەو ئەوانەی لەوێ بوون داغانیان کرد. بەم کارە هاوڵاتی

ڕوسی ئاهێکی بەبەراهات.

## ◆ ❖ دادگای پشکنین و سیخوڕی کۆمەڵایەتی ◆ ◆

کە لە نێوان مەزهەبەی پرۆتستانتی و کاسۆلیکی ناکۆکی لە ئەورووپا پەرەی سەند لە سەدەکانی پانزەو شانزەهەم، سیخوڕی دادگای پشکنین لە دەوڵەتە کاسۆلیکیەکاندا پەرەی سەند، لە سەروی هەموویانەوە ئیسپانیا..... ئەم دادگایە، بە پێی ڕێنماییەکانی راهیب ((سان دومینیك)) بەڕێوە دەچوو، ئەوانە بە هەزاران کەسیان لە دەرەوەی کەنیسە وەکو سیخوڕو ڕابەر هەڵدەسوڕاند، یەکێ لە ئامۆژگارییەکانی دادگای پشکنین کە لە بڵاوکراوە سەرەکییەکەیدا هاتووە بەمجۆرەیە:

((با سیخوڕکە لای ئاشکرا بێ، مافی ئەوەی هەیە خۆی وا نیشان بدات کە دۆستێکە تا بتوانێ تاوانبارەکە دان بە تاوانەکەیدا بنێ..... ئەمە وای دەوێ وای دەرخات سەر بەهەمان تایفەیە، ئەمەش ڕەوایە، بەمەرجێ بە ئاشکرا ئەمە نەدرکێنێ، چونکی ئەمە تاوان کردنە، با تاوانێکی لاوەکیش بێ، کە دەبێ لە هیچ بارودۆخێکدا لەمە نزیك نەبێتەوە.....)).

دادگای پشکنین بە زێرزەمینە تاکە کەسەکانیەوە ناوبانگی دەرکردبوو، بە ژووری ئازاردانیەوە ناسرابوو، بەڵام ئەوە نەچەسپا کە یەکەمین ڕێکخستنە ((سیخوڕی کۆمەڵایەتی)) ئەو کارەیە کە سیخوڕی بەسەر هاوڵاتی ئاسایی و سادەوە دەکات، جا هەرچییەك بوون، بە شێوازێکی پۆلیسی گشتی هەر لە وێنەی سیستەمی دکتاتۆرییە فاشیەکان، ئەمە ڕێبازێکە جەخت لەسەر ئەوە دەکات، کە هەموو کەسێك دەبێ مل کەچی دەسەڵاتی فەرمانڕەوای وڵاتەکەی بێ، جا هەر کەسێك ڕایەکی جیاوازی هەبوو، دەبێ خەبەری لێ بدرێت تا سزا بدرێت، یان لە کۆمەڵ دوور بخرێتەوە تا ئەو کاتەی هۆشی بەبەردادێ و ڕێگەی ڕاست دەگرێ. یاخود دەکوژرێ تا ڕای گشتی بیروبۆچونەکانی کە دژ بە دیەسەڵات

وەرنەگرێ.

ئـەم شـێوە بەڕێوەبردنـە لـەم سـەردەمە ئێـستاشدا بـەکار بـراوە تـا دەسەلاتیان لەدەست دەرنەچێت، لەوانە: هیتلەر، موسولینی، ستالین، و گەلێکی کە.

سیخوڕێ کۆمەلایەتی، بەشێکە لە دادگای پشکنین جیانابێتەوە، دادگای پـشکنین بـۆ یەکـەمین جـار لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا دەرکـەوت، سـالی ١٤٧٨ز لە ئیسپانیا بۆ لەناوبردنی ((هرطقة )) کەوتە جمو جۆلێ . زۆری نەخایەند هەموو گەلی ئیسپانیا کەوتە میکرۆسکۆبی دادگای پشکنین....

کـە لـە کۆمـەلی بـچووك بـچووکی فەرمانبـەرانی کەنیـسە پێکهـاتبوو، ژمارەیـەکی زۆری سـیخوڕو ڕابـەریان بـەکار دەهێنـا، لـە کارەکانیانـدا یارمـەتیان دەدان، لەبەرامبـەر ئـەو کارەیانـدا لـە بـاج دان دەبەخـشێنران و نەدەچـوونە پێـشی دادگـای ئاسـایی، ئەمـە وایکـرد ژمارەیـان زۆربـێ و بـەدوای بـچوکترین هەلـەی دانیـشتوان دەگـەڕان. سـەرەڕای سـوپایەك لـە سیخوڕی فـەرمی، دادگـای پـشکنین، هـەموو هاولاتیـەکی بـە سـیخوڕی نـا فەرمی دادەنا، سزای توندی ئەو کەسانەیان دەدا کە خەبەری نەدەدا.

ئیتر هاوسێ ببوە سیخوڕ بەسـەر هاوسێکەی خۆیـەوە بـچوکترین هەلـەی بکردایە دەسەلاتی ئاگادار دەکردەوە.

تاوانەکان تـا دەهـات بەهۆی سیخوڕکردنی خەلکەوە دڕندەتر دەبوون _ بۆ نموونـە _ پیاوێکی بە تەمـەنی هەشـتا سالی. هاوڕێیـەکی کۆنی بـەوە تۆمــەتباری کردبــوو، گوایــە ڕۆژی جــەژن، پیــازو گۆشــتی بــەرازی خواردووە..... ئافرەتێك هاوسێیەکی تۆمەتی ئەوەی دابوویە پالێ، گوایە یەکێك باسی حەزرەتی مەسیحی کردووە ئەو پێکەنیوە........

هەنـدێ کەسیش، نـاکۆکی کـۆن لـە نێوانیانـدا هـەبووە، بـۆ تۆلەکردنـەوە تۆمـەتیان داوەتـە پـالێ، تـرس وای لێ دەکـردن لـە کـاتی لێ پرسـینەوەدا

ئەوەشـــی نـــەکردبێ دانـــی بـــە تـــاوانێکی دەســـت هەڵبەســـتدا دەنا......ئازاردانیشی تا دەهات توندر دەبوو، ئەگەر حوکم دەدران بە ئاهەنگ گێڕان دەیانکوشتن و دوای کوشتنەکەشی دەسوتێنران، ئەگەر لەدوا کاتەکانـدا دانـی بـە جورمەکەیدا بنابایـە، هەڵدەواسـرا پـێش سوتاندنی.

له ئیسپانیای کاسۆلیك، پرۆتستانیەکان ڕووبەڕووی سەخترین ئازاردان دەبوونـەوە. بـە پێـچەوانەی کاسـۆلیکەکان لـە وڵاتـە پرۆتـستنتیەکاندا بەهـەمان دڕنـدەی هـەڵس و کـەوتیان لەگەڵـدا دەکـران، هەنـدێ خێزانـی کاسـۆلیك ناچـار بـوون ژووری نهێنـی لـە ماڵەکەیانـدا بسازێنن بـۆ خۆشاردنەوە.

## ♦ ♦ کاردینال ریتشیلیوو ئەنجومەنی ڕەش ♦ ♦

(( ریتـشیلیو)) سـەر بـە خێزانێکـی دەوڵەمەنـدی فرەنـسی بـوو، نـاوی ڕاستەقینەی ((ئەرماند دمی بلیسیس))ە، یەکەمین دەزگای سیخوڕی لـە فرەنسا دامەزراند، ساڵی ١٦٠٥ بە ئەسقوفی گشتی لـە ژێـر چاودێری شـاژنی دایـك ((مـاری دی میدسـبی)) دامـەزرێنرا، دوای حـەوت سـاڵ وەزارەتـی دەرەوەی پـێ سـپێردرا، بـەڵام دوای کوشـتنی ((کونـسینی)) بەماوەیەکی کەم لابرا، لە ساڵی ١٦٢٢ز بەکاردینال دامـەزرا، دواجا شا لویسی سیانزەهەم جارێکی کە کردی بە وەزیری دەرەوەو ساڵی ١٦٣٤ز بووە سەرەك وەزیران.......

شـای فرەنـسا، نازنـاوی ((دوق ریتـشیلیو))ی پـێ بەخـشی. لەسـاڵی ١٦٣١زدا، تـا ساڵی مردنـی ١٦٤٢ هـەر لەسـەر کارەکـەی خـۆی مایـەوە. بەدرێـژایی ئـەو ماوەیـە، خـۆی دادوەری ڕاسـتەقینەی فرەنـسا بـوو، کـە دەسـتی بەتـەواوی بەسـەر دەزگـای موخابەراتـدا گرتبـوو. هـەر ئـەم بـوو ((ئەنجوومەنی ڕەش))ی دامەزراند، بۆ دیاریکردنی ڕێسای مامەلەکردن و

گونجاندنی نێوان دەربارەی فرەنسی و چینی نوبەلا دایمەزراندبوو...
سیاسەتی ریتشیلیو، وەکو پیاوی دەوڵەت و پیاوی ئاین و سەرەك وەزیران ڕەفتاری دەکرد، لە بەرزڕاگرتنی پایەی فرەنسادا، لەڕێگای چەسپاندی دەسەلاٌی ڕەهای سیستەمی شاهانەدا، سیاسەتێکی سیۆلۆجی ناوخۆیی پەیڕەو دەکردو دەسەلاتی ((ئال هابسبۆرگ)) لە سیاسەتی دەرەوە نەهێڵێ، هەوڵ و تەماحی ئەوانەی چاویان بڕیبووە تەختی فرەنسا پووچەڵ کردەوە لەوانە ((جاستون ئوف ئورلینز)) و ((دومی دی سنگ مارس))
((ریتشیلیو)) دەزگایەکی موخابەراتی فراوانی لە هەموو فرەنسادا بلاٌوکردەوە، تا بەردەوام لە بیرکردنەوەو کردارو هەڵس وکەوتی نوبەلاکان و پیاوانی کەنیسە ئاگادار بێت، یارمەتیدەری دەستە ڕاستی لەم کارەیدا، گەورە ڕاوێژکاری ڕاهیب ((جوزیف دی تریمبلی)) بوو، کە بەڕێوەبەری دەزگای خزمەتی نهێنی بوو، کە بە پیاوێکی مەکربازو فێڵ بازو ناسرابوو، لەبەر ئەوە نازناوی ((کاردینالی بۆر))یان پێ بەخشی.....
لە پۆپەو ئەوپەڕی هێزو توانایدا، ریتیشیلیو گرێبەستی پەیمانێکی لەگەڵ سەرکردەی سویدی برۆتستان مەزهەب ((جوستاف ئەدولف)) مۆرکرد، ئەمە هەڵوێستی میرەکانی ئەڵمانی لاواز کرد، فرەنساش توانی چارەنووسی ((ئەلزاس)) بخاتە ژێر دەسەلاٌی خۆیەوە. هەروەها دەسەلاٌی ئیسپانیەکانیشی لاواز کرد بەهاندانی شوڕش بەپاکردن لە پۆرتوگال و کەتالۆنیادا، پلانی ڕوخاندنی ولسنستاین دانا.
تۆڕەی سیخوڕێتی ((ریتشیلیو)) زۆر دەگمەن بوو، کە تواناو شەرعیەتی لە خۆی وەردەگرت، ئینتیمای زیتر بۆ خۆی بوو لەوەی زیاتر بۆ عەرشی فرەنسا بێ، کرێی کرێگرتەکانی لە گیرفانی خۆی دەیدانێ، دواجا لە پارەی دەوڵەت لەوەی خەرجی کردبوو زیاتری دەگێڕایەوە، بە

پێچەوانەوی ئەوەی ڕویدەدا لە نێوان فرەنسیس ویلسنگهامو شاژنی بەریتانیادا.

ئەو ئەنجومەنە ڕەشە کە ((ریتشیلیو)) دامەزرێنەری بوو، ئامانجەکەی خۆی بەدی هێنا، بەوەی جۆرە ڕێککەوتنو تەباییەکی دۆزییەوە لە نێوان شاو نوبەلاکاندا. ریتشیلیو ئەم دەزگا پۆلیسییە نهێنیەی بۆ پاراستنی عەرشی شا لویسی سیانزەهەم بەکار هێنا، لەو دەمانەی لاواز دەبوو، هەروەها بۆ تێکدانی هێزی نوبەلاکانیش بەکاری دەبرد، هەروەها توانی هەوڵە سەرەتاییەکانی ((جاستون ئۆف ئورلینز))و ((دوق دی سنگ مارس ئاشکرا بکات، کە نیازی هێرش بردنە سەر عەرشیان هەبوو...

چالاکی ئەم دەزگایە هەموو لایەکی فرەنسای گرتەوە، بەناوەوەی فرەنسا نەوەستا، لە هەر دەوڵەتێك بەرژەوەندی فرەنسای تیادا هەبوو، دەزگاکە چالاکی خۆی لە وێدا ئەنجام دەدا. کاردینال سالی ١٦٤٢ز کۆچی کرد، بەلام دەسەلاتی ((ئەنجومەنی ڕەش)) ١٥٠ ساڵ بەردەوامی هەبوو، تا شۆڕشی فرەنسا بەرپابوو ئەوجا هەڵوەشێندرایەوە.

## ♦ ♦ سیخوری لە سەردەمی ڕاپەڕیندا ♦ ♦

سەدەی ڕاپەڕین بەوە ناسراوە کۆمەڵگای ڤیودالی ئەورووپی تێدا سواو لەکارکەوتو بازرگانی نێودەوڵەتی تیادا گەشایەوەو هێڵەکانی هاتو چۆو درێژبوونەوەو هەوڵ دەدرا بازاڕە جیهانیە دوورەکان پاوان بکرێن، پێشبڕکێیان دەکرد بۆ گواستنەوەی شارستانی عەرەبی بە بیرو زانیارییەکانیەوە بۆ ئەورووپا و زیندوکردنەوەی کەلەپووری ئیغریقی. ئەمە شۆڕشێکی هزریو جولانەوەیەکی گواستنەوەی ڕۆشنبیری لە دۆڵی دەریایی سپی ناوەڕاستەوە دەستی پێکرد، لەوێشەوە فراوانتر بووەوە تا هەموو لایەکی گرتەوە.

بەربەرەش ململانێ گەرم دەبووبۆ پاوانکردنی بازاڕەکان، ئەوەش گۆڕانی

بەسەردا هات گەیشتە داگیرکردنی ولاّتان، لەمیانەی هەموو ئەمانەوە سیخوڕی ڕۆڵێکی چالاکانەی بینی......

## ♦ ♦ ئولیفەر کرومویل ♦ ♦

بۆ یەکەمجار ((ئۆلیڤەر)) کرومویل)) لە ئینگلتەرا سوپایەکی کۆکردەوە، جاران سوپا بۆ شەڕ کۆدەکرایەوە کە شەڕ کۆتایی دەهات سوپاکەش بلاّوەی لێ دەکرد.

ئۆلیڤەر، دەیزانی شەر لەنێو ئەو و ئەوانەی سەر بە شا بوون درێژە دەکێشێ، بۆیە سوپایەکیشی لە سیخوڕان کۆکردەوە، ((جۆن تورلیو))ی ڕاسپارد کە سەرپەرشتیان بکات، بە دوورگەکەدا بلاّو بوونەوە، ڕۆڵێکی گرنگیان لەسەرکەوتنیدا بەسەر ((شارل یەکەم)) دا هەبوو، لە شەڕی ساڵی ١٦٤٤ز لە یورکشایەرو شەڕی ((نیزبای)) هۆی سەرکەوتنەکەش بۆ موخابەرات دەگەڕێتەوە، ئەویش بە ئاشکراکردنی تەقەللاکانی شاو پەنابردنی بۆ هێزی بیانی، کە بە خیانەتێکی گەورە دانرا، لەسەر ئەو تاوانەش دادگایی کراو بڕیاری هەلّواسینی درا.

بەر لە هێرش بردنە سەر ((ئیرلەندا)) بۆ لەناوبردنی بەرەنگاریکردنی تاخمی شاو بەر لەوەی بەفەرماندەیی سوپایەك بۆ ئەسکۆتلکەندە بڕوات، موخابەراتەکەی کۆمەڵێ زانیاری وردیان پیشکەش کرد، لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیاریانە مەلەکیەکان لە ((ئەدنبرە)) شکان.

دوای ساڵێك ئەمیر شارلزی دووەم، لە ((وورسیستر)) شکستی هێنا، کە ئەوە دوا شەڕ بوو ((ئۆلیڤەر)) بەشداری تێدا کردو گەورەترین شەریش بوو، چونکی بە زیانێکی کەم ئەنجامی باشی بەدەست هێنا.....

ڕێك و پێکی موخابەرات ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەسەرکەوتنی ((کرومویل)) دا.

## ♦ ♦ دانیال دیڤو ♦ ♦

((دانیال دیڤو)) یەکێکە لە ڕۆماننووس گەورەکانی کۆتایی سەدەی حەڤدەمو سەرەتای سەدەی هەژدەم، لێهاتووترین سیخوڕی شاهانە بوو، هەرچەندە ناوبانگی بە نووسینی ((ڕۆبنسون کروز))ەوە دەرکرد، بەڵام کاری نهێنی بۆ شاژن ((ئان)) دەکرد. وا دەبینرا کە یەکێکە لە شۆرشگێڕانو دابەشکەرانی بەیاننامەی نهێنیو ئاژاوەخەرەوە، کە بە تۆمەتی ئەوانەوە دووجار زیندانی کراوە. ئەوەی ((دانیال دیڤۆ))ی جیادەکردەوە، بیرتیژیو هێزی چاوی لە تۆمارکردنی وردەکارییەکاندا بوو، هەروا توانایەکی لەبن نەهاتووی بەردەوامی سەرنجدانی وردی بێ ماندوون هەبوو، ئەم خەسڵەتانەی سەرنجی ((ڕۆبرت هالی)) ڕاکێشاو وایکرد لە زیندان ئازادی بکات، لە بەرامبەر بەڵێنی وەفاو لایەنگری ((هارلی)) بدا، بەڵێنەکەی بەجێ هێنا بۆ ((هارلی))و ((گولدسمیث)) بە ڕادەیەك ئەمەی دوایی، ڕایسپار ببێتە جێنشینی، کاتێ کە لە سەرۆرکی موخابەرات ساڵی ۱۷۱۰ز لایاندا....

((دیڤو)) وای نیشان دەدا کە بێزارە لە سیاسەتو بەربەر بڕوای پێ نەدەما، کە مەترسی ( ئال ستیوارت ) پەرەی سەند، شا ((جۆرجی یەکەم)) ناردی گەشتێك بە وڵاتدا بکات، لەم گەشتەیدا ناوی خۆی گۆڕی بە ((ئەلکساندەر گۆڵد سمیث))، هەندێ جاریش بەناوی ((کلود جیلوت))ەوە، دەگەڕا. لەو گەشتەیدا توانی ئەوانەی لایەنگری ((ئال ستیوارت)) دەکەنو مەزنەی ئەوەیان لێ دەکرێ دەست بە بەرنگارکاری کردن بکەن ئاشکرا کرد.... لەهەمان کاتدا توانی تۆڕێکی سیخوڕی دامەزرێنێو سەر بەخۆ بن.

لەگەڵ ئەم سەرکەوتنەیاندا وەکو سیخوڕێك، بەڵام وەکو ڕۆماننوسێکی فرە بەرهەمیش مایەوە. زۆر دڵسۆزی شا جۆرج بوو، بەڵام ئەمە ڕێگای

ئەوەی لێ نەگرت کتێبێك بنووسێ بەناوی ((گەشتێك بە ئینگلتەراو ویلزدا)).
پەرۆشی ئەدەب و نووسین بوو، سەرەڕای ئەوەش لە نووسین پارەیەکی باشی دەست دەکەوت.

## ♦ ♦ بنیامین فرانکلین ♦ ♦

( بنیامین فرانکلین ) پیاوێکی هێمن و گران و لەسەرخۆ بوو لە بیرو هەڵس و کەوتیدا، دیبلۆماتێکی زیرەك و لێهاتووبوو، سیخوڕێکی دوو لایەنەش بوو، لە میانی ئەندامێتی لە یانەی ( هیلفایر )ی بەناوبانگ، لەگەڵ چەندین پیاوی گەورەو ناسراو، ناسیاوی پەیداکرد، لەوانە (لوت بوت))ی سەرەك وەزیران و ((سیرفرانسیس داشوور)) ڕاوێژکاری خەزێنە، کە دوای بە نهێنی نامەی بۆ نارد....
ئەو کاتەی ((بنیامیت)) باڵیۆزی ئەمریکا بوو لە پاریس، ڕێگای بە هاوڕێ و یارمەتیدەری یەکەمی ((شیدوارد بانکرفت))دا ، یەکەیەکی خزمەتی نهێنی بەریتانی لە باڵیزخانەکەدا ڕێکبخات بەمجۆرە ئەو زانیارییانەی لە ((واشنتۆن))ەوە دەهات، دەگەیشتە ((لەندەن)) سەرەڕای ئەو زانیاریانەی کرێگرتە فرەنسیەکان کۆیان دەکردەوە، ((فرانکلین)) ئەو زانیاریانەی ڕێگا دەدا بە لەندەن بگات کە پەیوەندی بە کاتی کەوتنەڕێی کەشتیەکانەوە و ئەو بارانەی بۆ سوپای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەهات هەبوو.
مەبەستی ((فرانکلین)) لەم ئاسانکارییە بۆ ئەوە بوو جێ پێی خۆی لە هەردوو لا بکاتەوە. دەیزانی ((شاجۆرج)) پارەیەك و دەسکەوتێکی زۆر بەو کەسانە دەدات بتوانێ موستەعمەرەکان بۆ سایەی بەریتانیا بگەڕێنێتەوە، ڕووداوەکانیش سەلماندیان کەلەسەر هەق بوو، ((جۆن کویسی ئادەمز)) سەرۆکی دووەمی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا

لەکاتی وتووێژی ئاشتیدا گومانی خۆی لە دڵسۆزی ((فرانکلین)) دەربڕی. بەڵام بەڵگەی بەدەستەوە نەبوو، بۆ تاوانبارکردنی، ئەوەی جێگای گوتنە ((بنیامیت)) کە ساڵی ١٩٧٠ز کۆچی کرد، سەرەڕای دیبلۆماتکارو سیخوڕ، زاناو داهێنەرێکی ناسراو لوو........

## ♦ ♦ لە سێدارەدانی جۆن ئەندریە ♦ ♦

((جۆن ئەندریە)) تەنها سیخوڕ بوو بەریتانیا بە نیشانەیەکی یادەوەری لە دێر ((ویستمنستر)) ڕێزی لێگرت و پاداشتی پێدا..... کوڕەی بازرگانێکی سویسری بوو لە لەندەن. لەسەربازیدا گەیشتە پایەی ((ڕائید)) و بووە یارمەتیدەری فەرماندەی هێزەکانی بەریتانیا لە نیویورك. کاتێ جەنەڕاڵی ئەمریکی ((بینیدیکت ئارنولد) خۆی دا بەدەستی هێزەکانی بەریتانیاوە لە ساڵی ١٧٨٧ز، ((ئەندریە)) یان نارد بۆ وتو وێژکردن لە گەڵیا.

پاساپۆرتێکیان بەناوی ((جۆن ئەندرسۆن))ەوە بە ئندریە دا، بەڵام بەداخەوە شوێن گومکێکەی سەرنەکەوت، هێزێکی ئەمریکی لێی کەوتە گومانەوەو دەستگیریان کرد، ئەندریە هەڵەیەکی کوشندەی کرد، دانی پێدانا کە ئەفسەرێکی بەریتانییەو بۆ خۆ قورتارکردن هەوڵی دا بە هێزە ئەمریکییەکان بدات. دادگایەکی سەربازی دادگایی کردو تاوانی سیخوڕی دایە پاڵ، بڕیاری هەڵواسینی بۆ دەرچوو، ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتی ئەمریکا هەوڵی کەمکردنەوەی حوکمەکەیان دا، بەڵام سوودی نەبوو، لە ((تابان)) لە بەرەبەیانی دووی تشرینی ساڵی ١٧٨٠ز لە سێدارەدرا، جۆن ئەندریە نموونەیەکی سیخوڕییە کە خۆی هاوێشتە ناو شەڕێکەوە خۆی بۆ ئامادەنەکردبوو.

## ♦ ♦ جیمس روبرتسون ♦ ♦

سەربازێکی تەقلیدی نەبوو، دوو ناوی هەبوو، ((ئارسەر ویلزلی)) و ((دوق ویلینگتون)). سوودێکی زۆری وەکو کرێگرتەیەك هەبوو، کەچی زۆر لە فەرماندەکانی کە وەکو ئەم سوودیان لەو زانیاریانە وەرنەدەگرت کە دەستیان دەکەوت.. ((جیمس)) سەر بەکەنیسەی ((بندیکت)) بوو، لە ((ریجینزبیرگ)) لەوێ بە ((جیمس برا)) ناونرا، زمانی ئەڵمانی بەباشی دەزانی.

یەکەم کاری جیمس، چاککردنی چارەنووسی ١٥٠٠ سەربازی ئیسپانی بوو، کە لە دانیمارك لەبارێکی دژواردا دەژیان.

ناپلیون هاوپەیمانەکانی ڕازی کرد– بەر لە هێرشە کوتوپڕەکەی بۆ سەر ئیسپانیا– کەوا دانیمارك مەترسی هێرشی بەریتانیای لەسەرە، داوای لە ئیسپانیا کرد ١٥٠٠ لە چاکترین سەربازەکانی لەڕووی مەشق و چەکەوە بۆ پاراستنی دانیمارك بنێرێ....

جیمس، چووە بنکەی خزمەتی نهێنی بەریتانی لە ((هیلیگولاند)) ، لەوێوە بە بەلەمی بچووك گەیاندیانە ((ویزر)) لە ئەڵمانیا. بەناوی ((ئادەم وەروور))ەوە، ئەوەی زانیبوو کەوا هێزەکانی ئیسپانیا بەسەر چەند دوورگەیەکی بچووکدا دابەشکراون و لە بارودۆخێکی زۆر خراپدان، بەڕادەیەك توانای شەڕکردنیان کەم بووبووەوە. لە دەریادا پەڕییەوە، چووە دوورگەی ((خوینن)) لەوێ چاوی کەوت بە ((مارکیز دی رومانا))ی فەرماندەی ئیسپانی، لەگەڵیا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، بەدەریادا هێزەکانی بگەیەنێتە خاکی وەتەن. ئەویش بە یارمەتی هێزی دەریایی شاهانەی بەریتانی. ((روبتسون)) دوای گەشتێکی پڕ مەترسی گەڕایەوە بۆ ((هیلیگولاند)) ، لەوێوە، پەیوەندی بە فەرماندەی دەریایی بەریتانیاوە کرد، ئەدمیرال ((گبتس))، توانی ٩٠٠ سەربازی ئیسپانی

لەدورگـەکانی کـەناری دانیمـارك بگوێزێتــەوە بـۆ ئیـسپانیا، کـەدواجار ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە شەڕی ((ویلینگتون))دا.

## ♦ ♦ سوارە د- یوەن پیاو بوو یا ژن؟ ♦ ♦

لـە ٢١ مابـسی ١٨١٠ز، ئافرەتێکی فەرەنـسی کۆچـی دوای کـرد بـەناوی ((خـاتوو د. یـون)) . دکتوورەکـان کە لاشـەکەیان پشکنی، کۆتاییـان بـەو گومانـە هێنـا کـە لـە بارەی ژیانیـەوە لـە ئارادابوو.... دوای تێپـەڕبوونی چـــوار ڕۆژ بەســـەر مردنیـــدا، ڕۆژنامـــەی ((تـــایمز)) هـــەواڵێکی سەیروسومەرەی بلاوکـردەوە، لـە ژێـر ناونیـشانی (( خـاتوو د. یـون پیـاو بوو)) چیرۆکی ((د. یـون)) لـە چیرۆکە سەرسوڕهێنەکانی سیـخوڕییە لـە مێـژوودا. ژیـانی سـیخوڕیٚ لەخزمــەتی ((لویـسی پانزەهــەم)) شـای فەرەنسا ساڵی ١٧٥٦ز دەستی پێکرد. ((لـویس)) بۆ روسیای نـارد، بـۆ ئامادەکردنی پەیمانێکی نهێنی لەگەڵ ژنە ئیمپراتۆرەی رووسیادا. لەبەر ئـەوەی وەزیرەکـانی بـەگومان بـوون لـە فرەنـسیەکان، ((د. یـون)) خـۆی گۆڕی وەکو کارەکتـەری ژنـە فرەنسیەك ڕۆیـشت، ((لیـادیٚ بومونـت)) لـە دەریـای روسـیدا بـاش پێـشوازی لێکـراو رێزیـان لێنـا. دەڵـێ، زۆرێـك لـە شێوەکارانی ئەویٚ هـەوڵیٚ وێنەکێشانیان کـرد، لەهـەمان کاتیـشدا ((ئـەم نازدارە لیا)) توانی لەگەڵ ژنـە ئمیپراتـۆردا پەیمانەکە ببەستیٚ و لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە فرەنسا.لەساڵی ١٧٦٢ز ، شا لویس کـارێکی دیکـەی بـۆ سـیخوڕە لێهاتووەکـەی دۆزییـەوە، بـۆ یارمەتیـدانی بـاڵێزی فرەنـسی بـۆ ئینگلتــەرەی نـارد. ئـەمجارەیا ((د. یـون)) وەکـو پیاوێـك ڕۆیـشت وەك کەسـایەتی پیـاوێکی ڕاسـتەقینە، وەکـو سـیخوڕێکی کـە کـاری سـەرەکی ئـەوبوو، لـەوە بکۆڵێــەوە کـە تـا چ ڕادەیـەك بـەریتانیا ئامـادەی شـەڕە، چونکی شا لویس خەریکی دانانی پلانێك بوو بۆ داگیرکردنی بەریتانیا، ((د. یون)) بەوپەڕی لێهاتوویيەوە کارەکـانی بـەجیٚ هێنـا، کـە توانـی هـەر

زوو نیشانەی ((سوارە)) وەدەست بهێنێ، ئەمەش وای کرد چاوی ببڕێتە کاری باڵێزی. کەسایەتیەکی خۆشەویست بوو لە کۆمەڵگای بەرزی بەریتانیدا، سەخی و میوان پەروەر بوو، ئاهەنگی زۆر دەگێڕاو پارەیەکی زۆری خەرج دەکرد، کە تووشی قەرزاری بوون بوو.

بەڵام شالویس، بەرەبەرە لێی دەترسا. ئاگای لە بەڵگەو دیکومێنتێکی زۆر هەبوو، لەوە دەترسا لە دژی شا بەکاریان بهێنێ... ((د. یون ((باڵێزی پێ نەدرا لە جیاتی ئەوە، داوای گەڕانەوەی بۆ فرەنسا لێکرا، پێی ناخۆش بوو، ناکۆکی کەوتە نێوان ئەوو ((جویرتشی)) باڵێۆزی نوێوە، کەچەند جارێ هەوڵی دابوو بۆ کوشتنی ((د. یون)) بەڵام سەرنەکەوتن. ( د . یون)) ماڵەکەی خۆی کە لە گەڕەکی ((سوهر)) بوو قایم کردوو پاسەوانی چەکداری بۆ پاراستنی خۆی و ماڵەکەی دامەزراند، بەڵگەنامەی نهێنیەکانی لە ژووری نووستنەکەیدا شاردەوەو مین ڕێژی کرد.

دەنگۆ باسی ناکۆکی نێوان ((د. یون))و باڵێۆزی فرەنسی هەموو کەسێك پێی زانی و بڵاوبوونەوە، دانیشتوانی لەندەن، لایەنگیری ((د. یون)) یان کرد، گاڵتەیان بە ((جویرتشی)) دەکرد لە ڕێگەو بانەکاندا، پەنجەرەی ماڵەکەیان بە بەرد شکاند، دواجار بۆ فرەنسایان گەڕاندەوە.

((د. یون)) هەر لە ئینگلتەرا مایەوە، هەمدیس لە شوێنە گشتیەکاندا جل وبەرگی ژنانەی لەبەر دەکرد، قسەوقسەلۆك دەستی پێکرد لەبارەی ڕاستی زێیەوە کە ئایا پیاوەی یا ژنە؟

لە ساڵی ١٧٧٤ز، شالویس مرد، حکومەت دەزگای خزمەتی نهێنی هەڵوەشاندەوە، بەڵام ((د، یون)) ڕازی نەبوو بەڵگە نهێنییەکان تەسلیم بکات، گەر پارەیەکی باشی نەدەنێ.... بەمجۆرە سیخوڕەکە خاوەی لە شای فرەنسا وەرگرت. لەساڵی ١٧٧٧ز، حکومەتی فرەنسا ویستی

کۆتایی بە کیشەی بەڵگەنامە نهێنییەکان بهێنێ، بۆ ئەمە، نووسەری سەرکێشی شانۆ ((کارون بومارشیە)) نووسەری شانۆنانەی ((سەرتاشی ئشبیلیە))و ((زواج فیجارو)) کە ئەمیش سیخوڕێکی فرەنسی بوو، بۆ لای ((د. یون)) بنێرن.

((بومارشیە)) بۆ ئینگلتەرا چوو، دوای وتوویژێکی سەختو دوورودرێژ، ((د. یون)) ڕازی بوو، بەڵگەنامەکان بداتەوە، بەمەرجێ حکومەت قەرزارییەکانی بداتەوەو ڕێگای بدا بۆ فرەنسا بگەڕێتەوە..... بەڵام دەبێ ((د. یون ))یش هیچ ڕیسواییەك نەورووژێنێو تامردنیش جلی ژنانە لەبەر بکات........

## ◆ ◆ یەکەم موخابەراتی ئەمریکی کۆمەڵەی کولبەر ◆ ◆

لەساڵی ١٧٧٥ز، لەنێوان بەریتانیا و داگیرکراوی ئەمریکادا شەڕ هەڵگیرسا، بەریتانیا دەستپێشخەری کرد، نیویورك و دورگەی ((لونگ تایلاند))ی داگیر کرد. دواتر سیخوڕێکی ئەمریکییان بە ناوی ((ناسان هیل)) بەدیل گرت. ئەو وشانەی لەکاتی هەڵواسینیدا لەدەم دەرچوو بەنەمری هێشتییەوەو کردی بە ناوبانگترین سیخوڕی ئەمریکی، کاتێ وتی: ((بەداخەوە، هیچی دیکەم نیە لە تاقە ژیانێ ئەویش پێشکەشی نیشتیمانەکەمی دەکەم.)) مردنی ((هیل)) هۆکارێکی بەهێز بوو وایکرد ((جورج واشنتون)) سووربێ لەسەر پێکەوەنانی دەزگایەکی موخابەرایەتی بە توانا. پێکهێنانو بەڕێوەبردنی ئەو دەزگایەی بە دوو هاوڕێی ((هێ)) سپارد: میجور ((بنیامین تولمادج))و ((روبرت تاونسیند))و ناوی ((کۆمەڵەی کولبەر))ی بەکار دەهێنا.

((جورج واشنتون)) ساڵی ١٧٧٨ز نامەیەکی بە کۆد نوسی، بیرۆکەی ئەوەی تێدابوو، کە چ جۆرە زانیاریەك لەلای گرنگە کۆبکرێنەوە، لە نامەکەدا هاتووە.... ((تا دەتوانی تێکەڵی ئەفسەرانو پەناهەندەکان ببە،

بچۆرە قاوەخانەو مەیخانەو شوێنە گشتییەکان، دیققەت بدە بزانە ((هورنز هوك)) سەختو قایم کراوە یان نە ء . ئەگەر وایە ، لەهەر شوێنێکدا چەند کەس دانراوە، ژمارەی تۆپەکان لەو جێگایانەدا چەندن؟ .((.

چالاکی ((کۆمەڵەی کولبەر)) هەر کاریان ناردنی زانیاری بوو، بەرێکەوت ساڵی ١٧٨٠ز سیخوڕێکی بەریتانییان بە ناوی ((جون ئەندری)) دۆزییەوە. هێزەکانی بەریتانیا کەنداوی ((ئەویستەر)) کە دەکەوێتە ((لونگ ئایلاند)) داگیرکرد. ژمارەیەك لە ئەفسەرانی بەریتانی لە ماڵەکەی ((تانسیند)) دەژیان. خوشکەکەی ((تاونسیند)) کەناوی ((سارە)) بوو، هەستی کرد، یەکیٚ لە ئەفسەرەکان، بەناوێکی ترەوە نامەی پیٚ دەگات ئەیش ((جۆن ئەندرسۆن))ە. کەچی ناوی ڕاستەقینەی ((میجور جۆن ئەندریە))یە، ((سارە)) گومانی لیٚ پەیدکرد، گومانەکەی زیاتر بوو، کە بیستی میجور ئەندریە زۆر پرسیاری قایمکارییەکانی هێزەکانی ئەمریکی دەکات لە ((ویست بوینت)). سارە ((تالماج))و ئاگادار کردەوە، کەوا ((ئەندریە))، ڕەنگە سیخوڕ بێت.

((تالمادج)) لە نامەیەکی لە جەنەڕاڵی ئەمریکی ((بینیدیکت ئارنۆڵد)) بە دەست گەیشت لە ((ویست بوینت)). داوای پەیداکردنی پاسەوانی لێدەکات بۆ ((ویست بوینت)) تا یاوەری یەکی لە هاوڕێکانی بکەن، کە ناوی ((جۆن ئەندرسون))، !! ئایا ئاڕنۆلد دەیویست پەیوەندی بە سیخوڕێکی بەریتانییەوە بکات؟.

((تالماج)) بە پاوەکانی ڕاسپارد چاودێری ((ئەندریە)) بکەن. بەڵام کات درەنگ بوو. چونکە ((ئەندریە)) گەیشتبووە ((ویست بوینت)). پەیوەندی بە جەنەڕاڵ ((ئارنۆڵد))ەوە کرد، لە گەڕانەوەیدا نامەیەکی ((ئاڕنۆڵد))ی پیٚ بوو بەدەست خەتی خۆی بۆ بەریتانیەکانی نووسیبوو،

لە لایەن سێ سەربازەوە گەمان کەوتە سەر ((ئەندریە))، هەر ئەوان گرتیان و دادگایی کراو وەکو سیخوڕێك هەڵواسرا....

کە ((میجور ئەندریە))یان گرت و پشکنیان، پاسەپۆرتێکی تێپەڕبوونی پێ بوو کە ((بینیدیکت ئارنۆلد)) پێی دابوو. بە ناوی خوازراوەوە ((جۆن ئەدرسۆن)) . لەناو پێڵاوەکەشیدا نامەیەکی ((بینیدیکت ئارنۆلد)) یان دۆزییەوە بۆ بەریتانییەکانی نووسیبوو، کە لە بڕی ئەو زانیارییانەی دەربارەی ((ویست بوینت)) داوای ٢٠٠٠٠ جونەیهی ئەستەرلینی دەکات.

ئارنۆلد لە نامەکەیدا دەنووسێ: ((ئەگەر پلانی هاوکاریکردنم دیاری کرد بۆ دەست بەسراگرتنی ویست بوینت ، سەربازگاکە، عەمبارەکان، ئەوا من وادەزانم ٢٠٠٠٠جونەی، پارەیەکی کەمە بەرامبەر کارێکی وا گرنگ. لەهەمان کاتدا داوا دەکەم هەزار جونەیە بدەن بە کرێگرتەکەم. چاوەڕێی وەڵامدانەوەیەکی ڕوون و تەواو دەکەم. دەڕۆم بۆ ((ویست بوینت)) لە بیستی ئەم مانگەدا لەوێ دەبم، وای بە باش دەزانم لەگەڵ ئەفسەرێکی باوەڕپێکراوی خۆتاندا یەکتر ببینین زۆر پێویستە بۆ پلان دانان........))

## ◆ ◆ سیخوڕەکانی سەدەی نوێ ◆ ◆

### نابلیون بونابۆرت و ئیمپراتۆری سیخوڕەکان

لەبەر گرنگی دانی زۆری ناپلیون پۆناپۆرت بە سیخوڕیتی و دانپیدانانی بەوەی لە شەڕەکاندا سەرکەوتوو بووە وتوویەتی: تاقە سیخوڕێك هەمتەقای ٢٠٠٠٠ جەنگاوەرە لە مەیدانی شەڕدا. ئەوەبوو تواناو بەهرەکانی ((کارل شولمیستر))ی دۆزییەوە کە کاری قاچاغچێتی دەکرد. بۆیە بە قومیسێری گشتی سوپاکانی ئیمپراتۆرییەتی فرەنسای لە مەیدانی شەڕدا ، دامەزراند. لەبەر لێهاتووی لەکاری موخابەراتیدا و بەشداریکردنی گەورەی لەسەرکەوتنی کارە سەربازییەکانیدا نازناوی

((ئیمپراتۆری سیخوڕەکان))ی پێ بەخشی.

شەڕ لە نێوان نەمسا و فرەنسادا بەرپابوو، هێزەکانی ئیمپراتۆری فرەنسی (نابلیون)) لەسەر ڕووباری ((راین)) دامەزرابوون، ئامادەی هێرشکردن بوون، لە نەمسا هێزێکی سەرباز قەلای ((ئالم))یان دەپاراست، کە ڕێگای ((ڤییەننا))ی پایتەختی چاودێری دەکرد.

لەکۆتای ساڵی ١٨٠٤ز دا، یەکێ لە نوبەلاکانی مەجەر بۆ ((ڤییەننا)) هات. گەنجێکی ڕێکی زیرەك و قسەزان بوو، هەر زوو جێگای خۆی لە دڵی خەڵکی ((ڤییەننا))دا کردەوە، بەهۆی بەسەرهاتە پڕ ئازارەکەی، دانیشتوان لایەنگریان دەکرد، چونکی نابلیون لە فرەنسا دەریکردبوو و هەموو شتێکی لەدەست چووبوو.

بۆیە زۆر کەس هەستیان کرد کە ڕەنگە ئەم گەنجە مەجەرییە سوود بە کێشەی نەمسا بگەیێنێ، بە تایبەت زانیارییەکی زۆری لە لا بوو دەربارەی دەوڵەتی فرەنسا و هێزە چەکدارەکانی. وایان کرد چاوی بە ((مارشال ماك)) بکەوێ، کە فەرماندەی سوپای نەمسا بوو. ((ماك)) زیرەکی ئەم گەنجەو هەڵوێستی سەربازی بەدڵەو چوو پەسەندی کرد، کردیە یەکێ لە دەستەی ئەرکانی شەڕەکەی و سەرۆکی موخابەرات. ئەو پایەو پلەیە کە هەرگیز ئەو گەنجە چاوەڕێی نەدەکرد دەستی بکەوێ. چونکی ((کارل شولمیستر)) تەنها یەکێ بوو لە گەورە سیخوڕەکانی نابلیون و هیچی کەو بە فێڵ بۆ نەمسا نێردرابوو.

دەسبەجێ ((شولمیستر)) کەوتە کارکردن، زانیاری هەڵەو ناڕاستی بە فەرماندەی سوپا دەدا، لەوانە گوایە لە سەرچاوەی باوەڕپێکراوەوە زانیویەتی کەوا سوپای فرەنسی لە داتەپین دایە، بۆ ئەمەش، بەڵگەی پێشاندا وتاری دەست هەڵبەستی پێشاندا گوایە ئەفسەرێکی فەرەنسی لە یەکێ لە سەربازگا یاخیبووەکانەوە دەری بڕیوە، هەروەها پارەیەکی

زۆریشی دابووە دوو ئەفسەری ئەرکانی سوپا ((ویندیت))و ((رولسکی)) ، وتەو چیرۆکی لەم بابەتە بۆ ((مارشال ماك)) بگێڕنەوە تا بڕوای پێ بکات، لە لایەکی کەوە ناپلیون لە هەمان کاتدا لە ڕۆژنامەیەکی تایبەت بە فرەنسا ئەو جۆرە هەواڵانەی تیا بلاوکردەوە وەك ئەوە نیشاندا کە زانیارییەکانی ((شولمیستر))و دوو هاوڕێکەی ڕاستن...

((ماك)) بڕوای هێنا کەوا هێزە یاخی بووەکانی فرەنسا، دەکشێنەوە لەسەر ڕووباری ((راین)). هێزێکی ئامادەکرد بە فەرماندەیی خۆی نزیکەی ٣٠٠٠٠ کەس دەبوو، لە قەلای ((ئولم))ی ستراتیجییەوە کەوتە ڕێ، بەو نیازەی لە غەفلەتا بەسەر سوپاکەی ناپلیۆندا بدات. ئەمە، هەلێك بوو مارشال ((نای))ی فرەنسی چاوەڕێی دەکرد. لێیان هاتنە دەستو سوپای نەمسایان ئابلۆقەدا: هێزەکانی جەنەراڵ ((سولت)) و جەنەرال ((دوبونت)) لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە هێزەکانی ((مارمۆنت))و جەنەرال((لانس)). ناچار ((ماك)) ویستی بکشێتەوە، بەلام هێزەکانی جەنەرال ((مورات)) ڕێگە گەڕانەوەی لێ گرتبوون، ناچار خۆیان بەدەستەوە داو شەڕەکە بە سەرکەوتنی فرەنساو بەبێ خوێن ڕشتن کۆتایی هات، دوای ماوەیەکی کەم، فرەنسییەکان چوونە ناو شاری ((ڤییەننا))وە.

بۆیەکەم جار لە مێژوودا داگیریان کرد. ((مارشال ماك))یش بە خائین لە قەلەم دراو زیندانیان کرد، تا هەلواسینی ((شولمیستر)) ئاشکرا کرا.....

ئەوە گەورەترین کاری ئیمقراتۆری سیخوڕەکان ((شولمیستر)) بوو. بەلام تەنها هەر ئەو کارەی ئەنجام نەداوە، لە فڕاندنو کوشتنی گەنجێکی خانەوادەی شای پێشوو بەشدار بووە، دواتر وەکو سیخوڕێك کاری بۆ ناپلیون کردووە، لە ئینگلتەراو فرەنسا. ناپلیۆنیش زۆر دەست بلاو بوو لە ئاستیدا، بووە خاوەن دوو مەزرای گەورە کە شانازی پێوەیان دەکرد، هەمیشە بە هیوای ئەوەشەوە بوو، کەوا ناپلیۆن ڕێزی لێبگریو نیشانەی

بداتێ، بەدەست هێنانی ((وسام))ی تیپی شەڕەفی فرەنسی گەورەترین ئاواتی ئەو بوو، بەلاّم ناپلیۆن لەمەدا توند بوو، لەم بارەیەوە وتوویەتی:((سیخوڕەکان تەنها ڕێزلێنانی گونجاو وشایانی ئەوان بێ زێڕە.....)).

کە ناپلیۆن لە شەڕی ((واترلو))دا شکستی هێنا ساڵی ١٨١٥ز، ((شولمیستر)) نیوەی سامانەکەی لەدەست دا، نیوەکەی دیکەشی لە بازرگانیو سەنەدی دراو زیانی لێ کردو لەدەستی چوو.

ساڵی ١٨٥٣ز بەهەژارێو نەداری کۆچی دوای کرد......

## ♦ ♦ موخابەراتی ئال روتشیلد ♦ ♦

ماڵەکەی ((روتشیلد))ی جوو لە لەندەن بەیەکەم دەزگای موخابەراتی ئابووری دادەنرێت، بۆ قازانجی خاوەن سەرمایەدارەکان کاری دەکرد، ((روتشیلد)) سوودێکی زۆری بینی بۆ پێکەوەنانی سەرمایەی بانقەکەیان لەکۆکۆدنەوەی زانیارییەکان لە ساڵی ١٨١٥زدا. هەروەها ئەوانەی کاریان لەگەڵ دەکرد سوودمەند بوونو قازانجی وەبەرهێنانی گەورەیان هێنایە دی. زانیاری گرینگیان کە پەیوەندی بە بازاڕی دراوەوە هەبوو وەدەست دەهێنا. بۆ نموونە، ئەوروپا هەمووی چاوەڕێی ئەنجامی شەڕەکەی ((واترلو))یان دەکرد. ((روتشیلد)) لە لەندەن ئاگادار بووەوە کەوا ئینگلیز شەڕی دژی ناپلیون بردۆتەوە. دەست بەجێ بازاڕی پڕکرد لە ((سەنەدات))و بۆ فرۆشتن خستیە بەرچاو. زۆر کەسی تر، لەوانەی چاویان لە جولانەوەکەی بڕیبوو شوێن پێی ئەویان هەڵگرت. بازاڕ دابەزی، لەکاتی گونجاودا ((روتشیلد)) هەرچی ((سەنەدات)) بوولە بازاڕدا بە نرخێکی هەرزانی کڕی. کە هەواڵی سەرکەوتنی بەریتانیا بلاّوبووەوە، بازار نرخی زیادی کردو سەنەدەکانیش نرخیان بەرزبووەوە لەمەدا ((روتشیلد)) بە میلیۆن قازانجی هەبوو.

دوای شکست هێنانی ناپلیۆن، بۆماوەی نیو سەدە، ئەوروپا هیچ دەزاگەیەکی موخابەراتی ڕێکوپێکی نەبوو، لە ((روتشیلد)) بەولاوە. کە پێش حکومەت زانیارییەکان لای ئەو بوون........

## ♦ ♦ ویلیهیلم ستیبر و سەگی ڕاوی بسمارك ♦ ♦

لە ساڵی ١٨٤٨ز، شای برووسیا ((فریدریك ویلیهیلم)) لە بەرلین، کۆمەڵە خەڵکێکی تووڕە گاڵتەیان پێ کرد. کۆمەڵە خەڵکەکە بە شێوەیەکی مەترسیدار هەڵچووبوون و تووڕە ببوون. لە پڕێکدا، پیاوێك لەناو ئاپۆڕەکەوە دەرچوو بەرەو شار ڕۆیشت و هاواری کرد: ((مردن بۆ دکتاتۆر)) کە گەیشتنە لای شا، بە دەنگێکی نزم پێی گوت: ((خاوەن شکۆ مەترسە، من پۆلیسم، پیاوەکانم چوونەتە ناو ئاپۆڕەکەوە، بە هیچ شێوەیەك ناهێڵن زیانت لێ بکەوێت)) ئینجا بە دەنگێکی بەرز دەستی بە هەڕەشە کرد، شای بە پاڵدان بەرەو دەروازەیەك برد کە بە شەقامەکەی دەگەیاند. تا دەگاکەی کلۆم دا هەر پاڵی بە شاوە دەنا. کە دووری خستەوە ئینجا خۆیی پێ ناساند ((ویلیهلم ستیبر)) بوو

((ستیبر)) پارێزەر بوو، لەهەمان کاتدا هەواڵگرێکی نهێنی پۆلیس بوو. شا، سوپاسی ئەو کارەی کرد کە لە خەڵکە تووڕە و هەڵچووەکە پاراستی، دوایی دوو ساڵ کردیە ئەفسەرێکی پۆلیس، لێرە گەشتی درێژی ((ستیبر)) وەکو سەرۆکی موخابەرات دەست پێدەکات. کارە گەورەکانی ئەم بووارەی لە شەشتەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەنجامدا. لەو ماوەیە- یارمەتی ((بسمارك))ی سەرۆك وەزیرانی بروسیا داو لە دوو شەڕی گرنگدا سەرکەوت. یەکەمیان دژی نەمسا، دووەمیان دژی فەرەنسا. ئەرکی ((ستیبر))ئەوەبوو، هێزی دوژمن چەندەو تا چەند ئامادەن بۆ شەڕ، لە شوێنی خۆی دانەدەنیشت و کارە سیخوڕییەکانی بە کەسانی کە بسپێری. حەزی دەکر ئەم ((سەگی راوە)) خۆی بەژداری کارە

**سیخوڕییەکان بکاتز**

بەر لە شەڕی نەمسا _ وەك نموونەیەك_ خۆی بەو شوێنانەدا گەڕا کە ئەگەر شەڕ هەڵگیرسانەکەی تێدا دەکرا. وەکو فرۆشیارێك خۆی گۆڕی و هەموو ئەو جێگایانەی بینی، لەگەڵ خۆیدا بۆ چاوبەستکردنی خەڵکی پەیکەری هەزاران بای ئایینی دەفرۆشت، بەدزیشەوە بە سەربازە نەمساویەکان و جوتیاران و گەنجە لەڕێ لادەرەکان شتی ناوێڵ و نەگونجاوی پێ دەفرۆشتن تا دۆستایەتیان لەگەڵ پەیدا بکات،

پێش شەڕی فرەنسا، ((ستیبر)) بەناوچەکانی دوژمندا گەشتێکی کرد، بەلاّم ئەمجارەیان، هەزاران سیخوڕی بلاّوە پێ کرد. بەدوای شوێنی عەمباری چەکدا دەگەڕان، ڕاپۆرتی وردیشیان لەبارەی بارودۆخی ڕێگاکانی فرەنساوە دەنارد، لیست و خەریتەی جێگای مەزاری بەخێوکردنی ئاژەلیان تۆمارکرد، تا بزانن هێزەکان لە کوێوە ئازوقەیان بۆ دێ. ئەم جۆرە دزە کردنە لە دنیای سیخوڕیدا نوێ بوو..

دوای سەرکەوتنی ((برووسیا))، ((ستیبر)) کارەکانی لەسەر تاپای ئەورووپادا ئەنجام دەدا. لە کارە سیخوڕییەکەیدا کەڵکی لە کرێکارانی بیانی هێڵی ئاسینن وەردەگرت، لە کرێکاری چێشتخانەکان و قاوەخانەو مەیخانەکان، لە ئوتێلەکان، لە کارگەکان، بەجۆرێ موخابەراتی ئەڵمانی بووە جێگای مەترسی ئەورووپا. ((ستیبر)) سیاسەتی ((درۆودەست هەڵبەستی)) بەکار دەهێنا.... سوور بوو لەسەر ئەوەی، بەوردی و دورودرێژی ژیانی کەسایەتیە بەناوبانگ و دەوڵەمەندەکانی لە فایلی تایبەتدا تۆمار دەکرد کە هەموو زانیاریەکی لەبارەیانەوە تێدابوو، بۆ ئەوەی بەو زانیاریانە هەڕەشەیان لێ بکات و بیان تارسێنێ و بەوەش زانیاریان لێ وەردەگرێ. ساڵی ۱۸۹۲ز ((ستیبر)) مرد.

گەلێ لە سەرکردەوە نوبەلاکان کەوتنە دوای تەرمەکەی، گوایە دەڵێن ئەم

هەموو خەڵکە دوای تەرمەکەی کەوتن لەبەر ڕێزلێگرتنی نەبوو، بەڵکۆ تا دڵنیابن کەوا ((سەگی ڕاو))ی پیر بەڕاستی مردووە.

ئەوەی شایانی باسە، ستیبر زۆر سوودی لەوە وەردەگرت کە دەبووە پارێزەری تاوانباران. لە بەرلین ((ماڵی سەون))ی دامەزراند، کە لەوێدا وێنەی قوربانیەکانی لە هەڵواسینی گومان لێکراودا دەگرت، تا کار لە پایەو جێگایان بکات.

## ♦ ♦ ئالان بینکیروت و موخابەراتی ئەهلی ♦ ♦

((ئالان بینکیرتو)) ساڵی ١٨١٩ز لە گلاسکۆ لە دایك بووە، هەر بە گەنجێتی گرنگییەکی دیاری بە چاکسازی سیاسی و باشکردنی بارودۆخی چینی کرێکار دەدا، بەر لەوەی ساڵی ١٨٤٢ز بۆ ئەمریکا بڕوات چالاکییەکانی دەستی پێ کرد، لەساڵی ١٨٥٠ز، وەکالەتی بینکرتۆنی ئەهلی بۆ موخابەراتی نهێنی دامەزراند، لە چەند ساڵانێکی کەمدا ناوبانگی دەرکرد.

لە کۆتایی پەنجاکاندا، بەئاشکرا دیاربوو، ناکۆکی نێوان باکورو باشوور خوێن ڕشتنێکی زۆری لێ دەکەوێتەوە. هەڵبژاردنی ((ئەبراهام لینکۆلن)) ئەگەری شەڕەکەی زیاتر کرد. باشوور دەستی کردە ناردنی سیخوڕەکانی بۆ باکور، تا پڕوپاگاندا دژی فیدراڵی بکەن، چەند شوێنێکی مەبەستیش دیاری بکەن کە لە پاشەڕۆژدا بتوانۆ تێکی بدەن و وێرانی بکەن.

پیاوە ناسراوەکانی باکور هەستیان بە مەترسی چالاکیەکانی باشوور کرد. کەوتە هەوڵی پاراستنی بەرهەمەکانیان، لەوانە: ((سمویل فسلتون)) لە فیلادلفیا، و هێڵی ئاسنی ((ویلمنگتون)) و ((بالیتمور)). ئەم کۆمپانیایەی دەایی ((بینکیرتۆن))ی بەکرێ گرت. لەگەڵ چەند کەسێکی سەر بە ئەو، بۆ پاراستنی هێڵی ئاسنین لە پیلانگێڕەکان لە ((ماریلاند)).

((بینکیرتـۆن)) بـۆ بـالیتمور چـوو، وتوبویـان کـەوا پیلانگێڕەکـان بنکـەی سەرکردایەتیان لەوێیە.
لەگـەڵ خۆیـدا ((تیمـوس ویـستر))ی بـرد، لەگـەڵ ((هنـری دینیـن))دا، یەکەمیان شارەزایەو دووەمیان دانیشتووی ((نیوئورلیانز)) بوو توانی چـەند کەسـێکیان لـەوێ بدۆزێـەوەو دەستنیـشانیان بکـات. هـەرزوو ((دیفیـن)) بـۆی دەرکـەوت کـەوا مارشـال ((مـین)) سـەرۆکی پۆلیـسی بالیتمور، لە هەوادارانی باشووره.
بەئاشـکرا ڕایگەیانـد هـیچ هـەوڵێك ناکـات لـە دژی ئـەو هەوڵانـەی بـۆ کوشتنی ((ئـەبراهام)) دەکرێت. ((دیفیـن)) پیلانگێڕان بڕوایان پێنـەکرد. بە جۆرێ ڕێگەیان دا لە کۆبوونەوەی کۆتاییدا ئامادەبێت، کە لە وێدا لە پلانی کوشتنی ((لینگوتون)) دەدوان. بەڵام ئەو کەسەی بۆ دەستنیشان نـەکرا کە دانرابوو تاوانەکە ئەنجام بدات، نە چۆنیەتی کوشتنەکەشی زانی.... بەڵام ئەو زانیاریانە بوونە هۆی سەرنەکەوتنی پیلانەکە.
بینکیرتون زۆر ژیرانە هەڵسووکەوتی لەگەڵ پیلاگێرەکانـدا دەکـرد. کـە شەڕ بەرپابوو، لینکولن دامەزراندنی دەزگایەکی موخابەراتی بە پێویست زانی. سەرۆك، داوای لە ((بینکیرتون)) کرد، ئەو دەگایە ڕێکبخات.
هەرچـەندە لـە هەواڵگریـدا زۆر بـاش بـوو، بـەڵام شـتێکی کـەمی دەزانـی لـەبارەی بـەڕێوەبردنی موخابـەراتی سـەربازی لـە دوای دامەزرانـدنی دەزگـای خزمـەتی نهێنـی، دەزگاکە تووشـی کارەسـاتی یـەك لـەدوای یـەك بوو، تا گەیشتە ئەوەی ((ویبستر)) زینـدانی بکـرێ‌و دواجاریش هـەڵیان واسـی....
((بینکرتـون)) دانـی بەسـەرنەکەوتنی وەکـو بەڕێوەبـەرێکی موخابـەرات هێنـا، بەڵام باکور کەسێکی شیاوی وای نەدۆزییـەوە جێگـەی بگـرێ، تـا ((لافابیـت بیکـر)) پەیـدا بـوو، کـە دواجـا سـەلماندی دیـارترین

سـیخوڕەکانی جیهانـەو لێهـاتووترین بەڕێوەبـەری موخابەراتیـشە. ((بیینکرتون)) دوای شەڕەکە گەڕایەوە سەر موخابەراتی ئەهلی تایبەت، توانای خۆی بۆ قەلاچۆلکردنی ڕێگران و چەتەکانی _ کولوس_ کلان.

## ♦ ♦ گرینفل دورج ♦ ♦

بەبەڕێوەبەرایـەتی جەنـەرال ((ئەلیـسیس گرانـت)) هێزێکـی موخابـەراتی گـەورەی خـستە کـار، لەشـەڕی نـاوخۆی ئەمریکیـدا لـە سـاڵی ١٨٦٢-١٨٦٥ز، کارەکانی بە باشـی جـێ بـەجێ کـرد، بوونـە نموونـەیەکی باشـی بەکارهێنانی سیخوڕی لە شەڕی نوێدا.

((گرانت)) لە ئەیلوولی ساڵی ١٨٦١ز سوودی سیخوڕی زانی، کاتێ یەکێ لـە کرێگرتـەکان ئاگـاداری کـردەوە کـەوا هێزەکـانی کونفـدراڵی خـۆی بـۆ هێرش بردنەسـەر شـاری ((بادوکا)) ئامادە دەکات، کە شارێکە جێگـەی سـتراتیجی هەیـە و دەکەوێـە ئـەو شـوێنەی ڕووبـاری ((ئۆهـایو)) لەگـەڵ ڕووبـاری ((تینیـسی)) یـەك دەگـرن. ((گرانتـی)) خێـرا کەوتـە خـۆ تـا پارێزگاری لە شارەکەدا بکات و بێ شەڕکردن داگیری کرد.

دوای حەوت مانگ، ((گرانت)) وانەیەکی دیکەی بەسوود فێربوو، کـاتێ سـیخوڕەکان نـەیانتوانی ئاگـاداری بکەنـەوە کـەوا ٤٠٠٠٠ کونفـدراڵی کۆبوونەتـەوە تـا هێرشـێکی کـت و پـڕ بکەنـە سـەر هێڵـەکانی لـە ((شیلۆتـشیرش)) لـە ویلایـەتی ((تینیـسی)). بڕیـاری دا ئـیتر لەمـەودوا غافڵ گیرانـە نـەکرێ، بڕیاریـدا دەزگایـەکی موخابـەرات سـەر بـەخوودی خۆی دابمەزرێنێ.

بریجـادیر جەنـەراڵ ((گرینفـل دودج)) و ڕاسـپارد ئـەو دەزگایـە بەرێوەبەرێ......

((دودج)) لە ((ماساشۆستی)) لە دایك بووە، لە زانیارییە سەربازییەکان و ئەندازیاری مەدەنی لە ((فیرمونت)) بڕوانامەی وەرگرتووە، لە هێڵی ئاسن

((مسیسیبی و میزوری)) کاری کردووه. کە شەڕ هەڵگیرسا، چووه ڕیزی سوپاوه وەکو کۆلۆنێل لە تیپی پیادەی چوارەم لە ((لودا))، لەهەمان کاتدا سەرپەرشتی سەربازی ((رولا))ی دەکرد لە ویلایەتی ((میسوری))، یەکەم سوارەی چەکداری لە ((تینیسی)) دامەزراند، هێزێکی ڕێکخراوی دامەزراند بۆ سیخوڕی، تا کارەکانی لە ڕۆژئاوایی ((مسیسیبی)) ئەنجام بدات، زۆری نەبرد گۆڕاو بووه تۆڕێکی موخابەراتی مەدەنی. ئافرەتیان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری بەکارهێنا زانیارییەکان بە هێزەکانی ((دودج)) ددەدان، کاتێ لە ((بە ریدج)) بوو، سێ ئەسپ گوللەیان بەردەکەوێ، لەو ڕووداوەدا ((دودج)) بە سەختی زامدار دەبێ و لە جێدا دەکەوێت. پلەی بۆ ((بریجادیر)) بەرزکرایەوه، دواجا فەرمان دەرچوو گوازرایەوه بۆ ڕۆژئاوای ((لینیسی))، جارێکی کە تاقیکردنەوەکانی دەستی پێ کردەوە لەگەڵ سیخوڕەکاندا لە ساڵی ١٨٦٢ز، بانگهێشت کرا تا لەسەرکردایەتی ((جاکسون)) کار بکات و فەرماندەی تیپیان پێ سپاردو داوای لێ کرا تۆڕێکی سیخوڕی دابمەزرێنێ.........

((دودج)) هێزێکی پێکەوەنا ،لە ١١٧ سیخوڕ پێکهاتبوو، کاریان لە نێوان ((میفیس))و ((موبیل))و ((ئەتلانتا))و ((ریتشموند)) ئەنجام دەدا، هەر سیخوڕێك کارەکەی و مەترسی کارەکەی کرێی پێ دەدرا، بێجگە لە خەرجی گیرفانی کە لە نێوان ٥٠٠٠ دولارو ١٠٠٠٠ دولار بوو بەر لە هەموو ئەنجامدانی کارێك بە سیخوڕەکە دەدرا.

((دودج)) خۆشی لە سەرکەوتنەکانی خۆی دەدیبەتایبەتی لە پشتگیرکردنی ((گرانت)) بەسەر ((فیکسبیرگ))دا لە ساڵی ١٨٦٣ز دا.

((دودج)) بە شاردنەوەی ناوی سیخوڕەکانی پارێزگاری لە ژیانیانی دەکردو هەریەکەو لە جیاتی ناویان ژمارەیەکیان پێ دەدرا.

### ♦ ♦ سێ ژنی سیخوڕ لەشەڕی ناوخۆی ئەمریکادا ♦ ♦

واباوە ئافرەت لە چیرۆکی سیخوڕیدا ڕۆڵی هەڵخەڵەتاندن و لە خشتەبردن دەبینێ، بەئاسانی دەتوانێ قسە لە پیاوە نهێنی پارێزەکان دەربهێنێ و پیاوان ناچار دەکەن نهێنی مەتسیدارو زانیارییەکان بدرکێنن. بەلام هەموو ڕێسایەك هاوێرەی هەیە، وە بەسەر هەموو ئافرەتێکدا ناچەسپێ کە کاری سیخوڕی دەکات، هەندێکیان بە فێڵبازی و هێزی بڕوای خۆیان پشتیان دەبەست، نەك بە وروژاندنی ئارەزووی پیاو....... لەوانە سێ ئافرەتی سیخوڕ کە لە شەڕی ناوخۆی ئەمریکادا کە لە نێوان ویلایەتەکانی باکورو باشووردا ڕوویدا چالاکی خۆیان نواند... ئەو سێ ژنە ئەمانە بوون: بیل وید، فان لیو، ڕەوز گرینهاو.........

### ♦ ♦ بیل وید سیخوڕ بە ڕێکەوت.. ♦ ♦

((بیل وید)) لە شاری ((مارتنزبیرگ)) لە دۆڵی ((شیناندوە)) سەر بە ویلایەتی ((ڤیرجینیا)) لە دایك بووە. کچی جووتیارێك بوو، باوکی بە کشتوکاڵ و بازرگانیەوە ژیانی بەسەردەبر. لە تەمەنی حەڤدە ساڵی دابوو شەڕی ناوخۆی ئەمریکا دەستی پێکرد. قەدەر بەڕێکەوت هێنایە ناو جیهانی سیخوڕییەوە. سەربازەکانی باکور شارەکەیان داگیرکرد، یەکێ بە پێلەقە دەرگاکەیان دەشکێنی و کۆمەڵێ کەس دێنە ماڵەکەیانەوە، ماڵەکەیان داگیر دەکەن، سوکایەتی بە دایکی دەکەن، ((بوید)) بە دەمانچەکەی باوکی یەکێکیان دەکوژێت، لەبەر منداڵێتی و گەنجێی سزای نادەن و لێی ناپرسنەوە، لەوکاتەوە بووە بە سیخوڕی کۆنفیدراڵی.....لە ساڵی ١٨٦١ز دا، کاری پەرستیاری دەکرد، لەم کاتەدا نامەی یەکگرتووەکانی دەگوێزایەوە، لەگەڵ پەرەسەندنی شەڕەکە، کاری سیخوڕێتی زیادی کرد لەناو ڕیزەکانی باکورییەکاندا، کە

دەگرەایەوە زانیاری سەربازی گرنگی لەگەڵ خۆیدا دەهێنایەوە. لەو زانیاریانە بۆی ئاشکرا بوو کەوا هێزەکانی باکور خۆیان ئامادەکردووە بۆ ڕووخاندنی پردێك. کە بە ڕووخاندنی ئەو پردە ڕێگای یارمەتیدانی باشوور دەبڕدرا. کە لەوکاتەدا یارمەتی بە ڕێگاوە بوو بۆ یارمەتی دانی جەنەراڵی باشوور ((ستونۆل جاکسون)). دەبووایە ((بیل)) بەناو مەزراکانداو خۆی تووشی مەترسی بکات تا نامەکە بگەیەنێ و پردەکە ڕزگار بکات.

لەکارێکی دیکەی سیخوڕی ((بیل))دا زانیاری گرنگی گەیاندە جەنەرال ((جاکسون)) و توانی هێرشێکی کتوپڕ بکاتە سەر ((قەڵای ڕۆیاڵ)) و داگیری بکات. جەنەڕاڵ، نامەیەکی بۆ نووسی، لەدووای گرتنی قەڵاکە بە ناوی خۆم و سوپاکەوە سوپاست دەکەم بۆ ئەو خزمەتە گەورەیەت کە ئەمڕۆ پێشکەشی وڵاتەکەت کرد: ((بیل بوید)) بەوە دەناسرا حەزی لە ناوبانگ بووو هەمیشە کارە قارەمانەکانی خۆی باس دەکردو چ ئەوەی ڕاستەقینە بوو یا خەیاڵی تێکەڵ دەکرد. بەتایبەتی بۆ پەیامنێری ڕۆژنامەکان، شەش جار دەسگیر کراوە. دووجار لە باکور زیندانی کرا، دووجاریش لە پەتی سێدارە قورتاری بووە، ئەویش بەکاریگەری خودی ((ئەبراهام لنکۆلن))، لە کۆتیایدا دەسەلأتداران لێی وەڕس بوون لە دوای شەڕەکە بۆ کەنەدا دوورخرایەوە. ((بیل بوید)) دوای تەواو بوونی شەڕ گەشتێکی جیهانی کرد، لەگەڵێ شوێن لەبارەی سیخوڕی و ئەزموونی خۆی وتووە، لەگەڵێ شوینەوە بانگێشت دەکراو بۆ هەرکوێیێك بڕوایە بەگەرمی پێشوازی لێدەکرا. لەبارەی ژیانی خۆیی و سەرکێشیەکانیەوە کتێبی نووسیووە، کتێبەکەی لە ئەورووپاو ئەمریکا ڕەواجێکی زۆری هەبوو، دواجا شووی بە ئەفسەرێکی دەریایی فیدڕاڵی کرد ناوی ((سام وایلد هادنگ))بوو. دەستی لەکار کێشایەوەو ژیانی دەریایی بەلاوەنا تا

لەگەڵ ئەو ژنەی کە خۆشی دەویست بەئارامی ژیان بەسەر بەرێت.

جۆزیـف هیرگـشیمر)) لـەبارەی ژیانیـەوەکتێبێکی نووسـیووە. تیایـدا وتوویەتی: ((ویل بوید بەناوبانگترین ئافرەتە، کەوتە چالاکی لەبوواری خزمـەتی نهێنییـەوە لەشـەڕی نـاوخۆیی ئـەمریکا)). ڕۆژنامـەکانیش ئاماژەیـان پێـداوە: ((بەجادووگـەر ناویـان بـردووە)) کتیببـەی خۆشـی بەناوی ((بیل وید لەسەربازگەو زیندانەکاندا))، تییایدا دەڵێ ((بەهۆی بارودۆخەوە ناوبانگم دەرکرد، نەك لەسەر خۆاستی خۆم.......))

## ♦ ♦ ئیلیزا بێت فان لیو: ♦ ♦

بە بەنرخترین سیخوڕی باکور دادەنرا. لە ((ڕیتشموند)) لە ویلایـەتی ڤیرجینیا دەژیا، بەوەناسراوبوو لایەنگری باکوری دەکرد لە ئازادکردنی کۆیلەکاندا، خۆشی کۆیلەی هەبوو ئازادی کردووە، بە ئاشکرا لایـەنگری باکوری دەکرد! هاوڕێکانی وایان دادەنا کەوا ڕەگێکی شێتی تێدایە، بۆیە بە ((ماڵە شێتەکە)) ناویان دەبرد. ئەفسەرانی باشوور لەجارێ زیاتر ماڵەکەیان پشکنی، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی خیانەتیان لێ بەدی نەکرد، نە ژووری نهێنیـان لـە ماڵەکـەی دا دۆزییـەوە. کـە لـە لاپـاڵی دامێنێکـدا دروسـتی کردبـوو، ئـا لـەوێوە کـارە سـیخوڕیەکانی ئـەنجام دەدا، هـەر لەوێـشدا کرێگرتـە باکورییـەکان و دیلـە هـەڵاتووەکانی دەشـاردەوە، تـا هـەڵێکیان دەشـت دەکـەوتوو دەڕۆیـشتن. لـە ڕێگایـەکی ئەمنییـەوە زانیاریـەکانی کـۆدەکردەوە، بە کـۆدێ دەینووسـی خـۆی دایهێنـابوو، بە پێـنج وێـستگەدا تێپـەڕی دەکـرد تـا دەگەیـشتە دەسـتی سـەرکردەکانی بـاکور، ئـەو شـوێنە نهێنیـەی سـەربازە هـەڵاتووەکانی بـاکوری تێـدا دەشـاردەوە، ژوورێکـی تەسـك بوو لـە نێـوان دیوەکـانی نـاوەوەو دەرەوە دروستی کردبوو، کە کەوتبووە پشتەوەی دۆڵابێکی کۆنی ڕەفدار، کـەس لەبارەی ئەو شوێنەوە نەیدەزانی کچی خوشـکەکەی نـەبێ. کە ڕۆژێکیـان

لە پڕێکدا بینی پووری لەبەردەم کونێکی تاریک کە لە دیوارێکەوە کرابووەوە وەستاوەو خواردنی بە دەستەوەیە، لە تاریکیەکەشدا پیاوێکی ریشداری جل و بەرگ شینی چڵکن وەستاوە. کچەکە بە ئاسپایی دوور کەتەوە بێ ئەوەی پووری هەستی پێ بکات هیچیشی لای پووری نەدرکاند کەوا بەو کارەی زانیوە، بەڵام دواجار چووەو لەگەڵ سەربازەکەدا دواوە، سەربازەکە پێی وتووە وریابە با پوورت نەزانێ و لای کەسی نەدرکێنیێ و باسی نەکات. ئەو ژوورە هەروا بە نهێنی مایەوە، تاکرێکارەکان لەکاتی ڕووخانی ئەو شوێنەدا دوای کۆتایی شەڕەکە دۆزیانەوە. دوای شەڕەکە جەنەڕاڵ ((یولیسیسی گرانت)) وتی: ((گرنگترین زانیاریم لە ریتشموند وەردەگرت لەکاتی شەڕدا، ئەوەی سەیرە، بە پارەی خۆی سیخوڕی دەکردو حکومەتیش قەرەبووی نەدەکردەوە، کە مرد دانیشتووی: ((ڤێرجینیا)) لۆمەیان دەکردکە خیانەتی لە کێشەی باشوور کردووە.

## ♦ ♦ ڕەوز گرین هاو ♦ ♦

((ڕەوز گرینهاو)) یەکێکە لە ژنە سیخوڕەکانی شەڕی ناوەخۆی ئەمریکا کە زۆرترین زانیاری پێشکەش کردووە. ئافرەتێکە خەڵکی باشوورەو لەناو واشنتۆن بە یارمەتی دوو کرێگرتە کارەکانی ئەنجام داوە: ((بیتی دوڤال))و ((لیلی ماکۆل)) لە حوزەیرانی ١٨٦١زدا، بۆی دەرکەوت و ئاشکرای کرد، کە هێزەکانی باکور خەریکی پلاندانان بۆ هێرش کردنەسەر ((ڤێرجینیا)).

ئەو ڕێگایەی پێ زانی کە لەشکرەکە پێدا دەڕوات زوو ئەو زانیاریەی گەیاند، لەبەر ڕاستی و وردی زانیاریەکە، باشوور سەرکەوت لە شەڕی ((پوول ڕاین)). لەساڵی ١٨٦٤زدا، ((ڕەوز گرین هاو)) لەدوای بەجێهێنانی ئەرکێکی لە ئینگلتەرا گەڕایەوە، هەستی کرد کەشتییەکی

سه‌ربازی دووی ئه‌وكه‌شتیه كه‌وتووه كه ئه‌وی تێدایه، كه‌شتیه‌كه‌یان هه‌وڵی هه‌ڵاتنی دابوو، له‌وكاته‌دا ژێر ئاو كه‌وتبوو، ((ره‌وز))یش له‌ناویدا خنكا.

## ◆ ◆ لۆرد بادن بویل ی سیخوڕی كه‌شافه ◆ ◆

هه‌رچه‌ند ناوبانگی له‌وه‌وه هاتبوو كه دامه‌زرێنه‌ری بزووتنه‌وه‌ی كه‌شافه‌بوو، به‌ڵام سیخوڕێكی به‌تواناو چالاكیش بوو، خووی سه‌یرو سه‌مه‌ره‌ی هه‌بوو، حه‌زی له ڕێك‌و پێكی جل‌و به‌رگه‌كه‌ی ده‌برد، مه‌رقی هه‌ڵهێنانی مه‌ته‌ڵ‌و لوغز بوو، ساڵی ١٨٧٦ز، خوێندنی به‌جێ هێلا، چووه ناو تیپی سواره‌ی ((هوسار))ی سێنزه‌هه‌م، دوای حه‌وت ساڵ مانه‌وه له هیند، تیپه‌كه‌ی ((فاتال)) گوێزرایه‌وه، كه له باشووری ئه‌فریقادایه، یه‌كه‌م كاری فه‌رمی سیخوڕی به‌جێهێنا، ئه‌و هه‌واڵگریه نهێنیه‌بوو له سیخوڕییه‌كی دوورو درێژ ئه‌نجامیدا،كه درێژیه‌كه‌ی ٦٠٠ میل بوو، دوای ئه‌وه‌ی دوو ساڵ له ئینگلترا مایه‌وه، ((بادن)) گه‌ڕایه‌وه باشووری ئه‌فریقا له ساڵی ١٨٨٧زدا، دوای ئه‌وه به ساڵێ بووه ئه‌فسه‌ری موخابه‌راتی تیپی فرین له له‌شكركێشیه‌كه‌ی ((زولولاند)) دژی ((رینیزولو)). له‌ساڵی ١٨٩٠زدا بووه سكرتێری سه‌ربازی مامی كه حاكمی ((مالتا)) بوو له‌ساڵی ١٨٩١زدا، بووه ئه‌فسه‌ریی موخابه‌راتی بریتانیا بۆ دۆڵی ده‌ریای ناوه‌ڕاست. ((بادن)) له‌و كاره‌یدا بووارێكی ئازادی گه‌وره‌ی كاری هه‌بوو، بادن، توانای كاری شانۆیی هه‌بوو، ئه‌وه‌ی بۆ كاری سیخوڕی به‌كارهێنا.

ڕۆژێكیان فه‌رمانێكی پێگه‌یشت تا له ڕاستی هه‌واڵێك بكۆڵێته‌وه گوایه حه‌وزێكی وشك بۆ دروستكردنی پاپۆڕ له هامبۆرگ وا خه‌ریكن كاری تیا ده‌كه‌ن. خۆی كرده شێت، جله‌كانی ته‌ڕكرد هه‌رزوو پۆلیس ده‌سگیری كرد، به‌ڵام پۆلیسی ئه‌ڵمان وایان زانی شێته‌و بردیان كرد

بۆیە بەڕەلایان کرد.....

لەسەرەتای شەڕی ((بۆیەری دووەم)) ڕاسپێندرا سەراسۆسەی ((استطلاع)) چیای ((دریکتربیرگ)) بکات، توانی لەگەڵ چەند جووتیارێکی ((بویر)) ببێتە هاوڕێ، لەکاتی بەرگری لە ((میفکیبخ)) ژمارەیەك کەشافەی هێنایە لای خۆیی و مەشقی پێ کردن، ئەو تاخمە توانیان زانیاری گرنگ کۆبکەنەوە، ((بادن بویل)) قەناعەتی هێنا لە جەنگاوەرانی بویر دەجولێنی و لە پشتیانەوەیە، بەلام نەیتوانی دەسەڵاتداران لە لەندەن وا لێ بکات بڕوای پێ بکەن.

هەرچەندە ((بادن)) بەوە ناسرابوو کە کابراییەکی نائاساییەو لادەرە، بەلام پارێزگاری نهێنییەکانی دەکرد. لە مەیدانی سیخوڕیدا لەهەموو ئەورووپاو ئەفریقاو ترکیاو جەزائیرو تونس‌و بیابانی گەورە خزمەتی ولاتەکەی کردووە، بۆیە بەریتانیا ڕێزی لێگرت‌و نازناوی ((لۆرد))ی پێ بەخشی. بادن ساڵی ١٩٤١ز کۆچی دوایی کرد.

### ♦ ♦ ئۆتشرانا تێهەڵچوونەوەیەکی نەزۆکی ئوبریتشیننای ڕووسی ♦ ♦

((ئۆتشرانا)) زیندووکردنەوەی ((ئوبریتشیننا)) بوو، کە یەکەم دەزگای پۆلیسی سیاسی ڕووسی بوو و ((ئیڤانی مەترسیدار)) ساڵی ١٠٦٥ز دایمەزراندو ساڵی ١٥٧٢ز لێی ڕزگاربوون، دوای ئەوەی بووە جێگای مەترسی ((ئیڤان)) خۆی.....

((ئۆتشرانا)) لەسەدەی ئیمپراتۆر ((ئەلکساندەری دووەم)) قەیسەری ڕووسیا، لەدایك بووە.

بەلام دەزگاکە توانای تەواوی تا چارەگی دوای سەدەی نۆزدەهەم بەهێز نەبوو، لەساڵی ١٩٠٠ز، ژمارەی ئەوانەی لەوێدا کاریان دەکرد گەیشتە ١٠٠ ٠٠٠ کرێگرتە، خەرجی هەموویان لەسەر بودجەی شارە سەرەکیەکانی ڕووسیا بوو. کارەکانیان لەسەرتاپای ڕووسیاو زۆر

پایتەختی ولاّتان ئەنجام دەدا، هەرچەندە ((ئوتشرانا)) ئەنجامی باشی وەدەست هێنا. بەلاّم گەڵێ لە شۆڕشگێڕان توانیان دزەبکەنە نێوانیانەوە، بەلشەفیەکانیش، دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٧ز توانیان بە ئاسانی لەناویان بەرن..... هەرچەندە دەزگای ((ئۆتشرانا)) راستەوخۆ لە کوشتارگەکان بەرپرس نەبوو، بەلاّم دژی سامییەکان بوو، ئەوان وایان کرد زۆربەی جووەکان بچنە باوەش مارکسیەکانەوە، لەساڵی ١٨٩١ز، ئەفسەرێك لە ئوتشرانیەکان پاداشتێکی ١٠٠٠٠ ڕۆبلی پێ درا، بەهۆی سەرکەوتنی لە هاندەرانی خەڵکی دژی جووەکان و بلاّوکردنەوەی بەیاننامە لە دژیان..لەسەردەمی ئیمپراتۆر ((نیکۆلاسی دووەم)) ژمارەی شۆڕشگێرە پەنابەرەکان، ئەوانەی خۆیان بۆ ڕووخاندنی قەیسەر ئامادەکردبوو، گەیشتە ٥٠٠٠ کەس، وەکالەتی دەرەوەی ئوتشرانا بارەگای خۆی بردە باڵیۆزخانەی ڕوسی لە پاریس، ئەوکات پاریس ساڵی ١٨٨٢ز جێگای پەنابەرە سیاسیەکانی روسیا بوو.

سەرۆکایەتی درایە دەستی ((بایوتر راتشکۆفسکی)) کە دەبووایە یان دوور بخرایەتەوە بۆ سیبیریا، یاخود ڕازی بێ لە ((ئوتشرانا))دا کاربکات، ئەمەی دوای هەڵبژارد، هەر زوو کارەکانی دەرکەوتن، کەلکی لە چاودێران و خزمەتکاران و فرۆشیارە دەسگێرەکان وەردەگرت، هەروەها سوودی لە کارمەندانی ئوتێل و ڕێستورانەکان دەدی و کاری بە کرێگرتە ناوخۆییەکان دەسپارد، سیخوڕە دوو لایەنەکان زانیاری لێ وەردەگرتن، بەم جۆرە زانیارییەکی زۆری کۆکردەوە. کە تا ئێستا ئەو زانیاریانە هەندێکیان هەڵنەسەنگێنراون....

وەکالەتی بیانی بچووکتر لە لەندەن و بەرلین و ڕۆما پێکهێنران، دوای ئەوەی کۆمەڵێ ئاژاوەی نایەوە لایەنگیری کران، داوای مردنی ((کارنۆت))یان دەکرد، کە سەرۆکی فەرەنسا بوو لە ساڵی ١٨٩٤زدا،

هەروەها سەرۆك وەزیرانی ئیسپانیا سالّی ١٨٩٧ز ((ئەنتۆنیۆ كانۆفاس))و ژنە ئیمپراتۆر ((ئیلیزابیت)) شاژنی نەمساو مەجەر لە سالّی ١٩٨٩ز، و شا ((ئەمبیرتۆ)) لە ئیتالّیا لە سالّی ١٩٠٠ز. هەروەها تەنها بە كۆكردنەوەی زانیاری نەدەوەستا، كۆمەلّێ چالاكی تریشی ئەنجام دەدا كە كاریگەری هەبوو لەسەر حكوومەتە بیانییەكانو ڕای گشتی.

((ئۆتشرانا)) بەشدارییەكی گەوری كرد لە سیاسەتی دەرەوەی قەیسەری لەمیانەی ((ئاماژە موخابەرایتەكاندا)).

دادگای پشكنین بارەگاكانیان لە دایەرەی پۆستە دانا لە ((ستراسبۆرگ))و مۆسكۆو وارشۆو ئۆدیساو كییفو خاركۆفو ریجاو فیلناو تومسكو تەفلیس......

چاودێری پۆستو نامەی هاتووو ڕۆشتویان دەكرد. بۆ لایەنگران یا ئۆپۆزسیۆن یەك شت بوو.نامە دیبلۆمانەكان كە بە تەلەگراف دەنیران ڕاگیران.....

((ئەلكساندر سافنسكی)) دادگای پشكنینی وەزارەتی دەرەوەی سالّی ١٩٠١ز بەڕێوەدەبرد، لەو ماوەیەدا گەلّێ ڕێگای لەبەرگرت تا كۆدی بالّیۆزخانەكان بزانێ، كار گەیشتە دزیكردنو كڕین.. چالاكیەكانی ئۆتشرنار ڕوسی بەشێوەیەكی رۆتینی بەردەوام بوو تا هەلّگیرسانی شەڕی یەكەمی جیهانی، ئەوەی جێگای گالّتەپێكردن بوو ((ئۆتشرنا)) نەیتوانی كۆدێكی نوێی ئەلّمانیا هەلّبێنێ‌و بیكاتەوە كە لە سالّی ١٩١٢ز بەكاریان دەهێنا. سالّی ١٩١٧و ١٩١٨ز بەهۆی بولشەفیكەوە چەند كەسێكیان دامەزراند بۆ خوێندنەوەی كۆدەكان ((شفرە))، بەلاّم زۆری نەبرد ئاشكرابوونو هەموویان هەلّواسران.

## ◆ ◆ ئەلفرید ریدل و تۆپی ئوبرا ◆ ◆

دەزگای خزمەتی نهێنی نەمساوی باشترین دەزگای موخابەرات بوو لە جیهاندا، لەلایەن ((ئەلفرید ریدل))ەوە نویێ کرایەوەو چاکسازی تێداکرا. ((ریدل)) لەساڵی ۱۹۰۷ بۆ ساڵی ۱۹۱۱ز سەرۆکی ئەم دەزگایە بوو، ئامرازی نوێی تێداکرد، ئەم کارەی پاداشت کراو پایەیەکی نوێیان لە سوپادا پێدا، پێش هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی پیاوێکی بەتوانا جێگای گرتەوە بەناوی ((رونگ)) بوو.

((رونگ)) لەکارەکەیدا بەتوانا بوو، کاتێ ئەگەری بەرپابوونی شەڕ لە ئەورووپا زیادی کرد، دەستی کردە پیادەکردنی سیستەمی چاودێرکردنی پۆستە. لە ئازاری ساڵی ۱۹۱۳زدا، دوو نامەی ئاشکراکرد، کە بۆ پۆستەی ڤیینا بەناوێکی نهێنیەوە نێرابوون: ((تۆپی ئۆپرا _۱۳)) دەرکەوت ئەو نامە لە شارێکی نزیکی سنووری روسیاوە نێراون، ئەمە گومانی زیاتر خستە سەر نامەکان، چونکی ڕوسیا دوژمنی نەمسابوو. کە نامەکانیان کردەوە، ۱٤۰۰۰ کروزیان تێدابوو، یانی نزیکەی ۹۰۰ جونەیهی ئەستەرلینی دەکرد. پرسیاری ئەوە کرا ئایا ئەمە پارەی کرێگرتەی سیخوڕییە...زەنگێکی نهێنی لە دایەرەی پۆستە دانرا، دوو پۆلیسیان تەرخان کرد لە بنکەیەکی پۆلیسی هاوشانی دایەرەکە تا بزانن کێ ئەو نامانە وەردەگرێ....

چەند هەفتەیەك تێپەڕی کەس بۆ وەرگرتنی نامەکان نەهات. پیاوانی پۆلیس تووشی بێزاری بوون، لە ۱٤ مایس، پیاوێك خۆی بەدایەرەکەدا کردو داوای نامەکانی کرد. لەوکاتەدا دوو پۆلیسە نهێنیەکان لەوێدا نەبوون. یەکێکیان بۆ ئاودەست چووبوو، ئەوی دیکەیان دەستی دەشۆری. کارمەندی پۆستە زەنگی لێداو هەوڵی دا گومان لێکراوەکە بخافڵێنێ و دوای بخات، بەلاَم پۆلیسەکان تا پیاوەکە نەڕۆیشت

دیارنەبوون، کابرا بە ئۆتۆمبێلێکی کرێ دوورکەوتەوەو ڕۆیشت دوای وەرگرتنی نامەکان.

دوو پۆلیسەکە شڵەژان، بەڵام چاوەڕێی گەڕانەوەی شوفێرەکەیان کرد. لە ڕێی شوفێرەکەوە زانییان لە چاپخانەیەك دابەزیوە. بەپەلە ڕۆیشتن، بەڵام لە چاو ون ببوو دیارنەما...

تومەز لەوێوە، بە ئۆتۆمبێلێکی کە چووە بۆ ئوتێل. جارێکی کە کەوتنە سۆراخی، سیماو شکلی ئەو کابرایەیان نەدەزانی، بەڵام لەناو یەکێ لەو ئۆتۆمبێلانەی بەکرێ گرتبوو مشتووی خەنجەرێکی لێ بەجێمابوو دوو پۆلیسەکە بیریان لە فێڵێ کردەوە، : داوایان لەدەرگاوانی ئوتێلەکەکرد لە میوانانی ئوتێلەکە بپرسێت کێ کێلانێکی ون کردووە. خۆشیان لەوێ چاوەڕێیان دەکرد، خۆیانیان بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەکانەوە مەژوول کردبوو، پیاوێکیان بینی کە لە ناوەڕاستی تەمەنیا بوو لە پێپلیکەکان وا دادەبەزێت، دەرگاوانەکە کێلانەکەی پێ نیشاندا، وتی من خاوەنیم... بەمجۆرە کابرایان دەسگیرکرد، بەڵام هەر دەسبەجێ سەریان سوڕما و کابرایان یەکسەر ناسیەوە کە کۆلۆنێل ((ئەلفرید ریل))ە.... سەرۆکی پێشووی موخابەرات..

ئایا سەرۆکی پێشووی موخابەراتی نەمسا دووسەرە کاری دەکرد؟ یەکێ لە پۆلیسەکان، پەیوەندی بە سەرۆکی نوێوە کرد، ئەوی دیکەیان کەوتە دووی ((ریل)). سێبەر ئاسا لێی نەدەبووەوە، شەقامەکانی ((ڤییەننا))یان تەی کرد. دیارە ((ریدل)) هەستی کردبوو یەکێکی بەدواوەیەو چاودێری دەکات. لەدوای گەڕانێکی زۆر دووبارە گەڕایەوە ئوتێلەکە. ئەو شەوە چوار ئەفسەر هاتن و گرتیان.

((ریدل)) پێی وتن : ((دەزانم بۆ هاتوون)). داوای لێکردن بە تەنها لە ژوورە جێی بهێڵن تا چەند وشەیەك دەنووسێ. بەر لەوەی دەرگاکەی لێ

بگرن وتی: هەموو شتێك لەبارەی کاری سیخوڕی منەوە لە ماڵەکەمدایە لە ((براگ)) ریدل، چەند وشەیەکی ماڵئاوایی نووسیو بە دەمانچە خۆی کوشت. نامەکەی ئەمەی تێدا بوو.... ((سەرکێشیو نەزانین بەسەرما زاڵ بوونو لە نرخی ئەو گوناهانەم ژیانم دەدەم. ئێستا سەعات یەكو چارەگە، وا ئێستا دەمرم، تکا دەکەم مەهێڵن لاشەکەم تەشریح بکەن... دوعای خێرم بۆ بکەن........ ئەلفرید ...)).

نەمسا بەدرێژایی مێژووی خۆی سیخوڕێکی لێهاتووی وەك ((ریدل))ی تیادا نەبووە. بەڵام شەیدای رابواردنو تێرکردنی ئارەزووەکانی بوو، ئەم کارانەی غەرقی کردبوو لە قەرز، کە روسەکان بەرامبەر بە نهێنیەکانی نەمسا پارەی لەبەردەم دانا ڕازی بوو. بۆ ماوەی دە ساڵ زانیاری گرنگی بە روسەکان دەدا وەکو سەرۆکی خزمەتی نهێنیەك..

لەکارەکەیدا ئامرازی نوێی بەکارهێنا، ئەوەی گومانی لێ دەکرد لە ژوورێکدا چاوی پێ دەکەوت پڕبوو لە جیهازو ئامرازی گوناهبارکردن لەوانە:

- سندوقێك پەنجە مۆری ڕووندەکردەوە.
- جیهازی تۆمارکردنی دەنگی گومان لێکراو بە قەوان، چونکی ئەوکاتە جیهازی تۆمارکردنی ئەلکترۆنی نەبوو.
- کامێرای شاراوە.

گەورەترین خیانەتەکانی ((ریدل)) ئەوەبوو، نوسخەیەکی لە پلانی نەمسای کە بۆ هێرش کردنە سەر سربیا ئامادەکردبوو گەیاندە دەستی روسەکان. ڕوس دۆستی سربەکان بوون. ئەوانیش پلانەکەیان بە سربەکان دا. شەڕ هەڵگیرسا، نەمسا لەبەر کەمی کات نەیتوانی پلانەکان بگۆڕێو هێرشیان کردە سەر سربیا، هەموو جیهان هەواڵی سەرکەوتنەکەی سربیای خوێندەوە. ئەوکاتە کەس نەیدەزانی کەوا

خیانەتی ((ریدل)) نهێنی سەرکەوتنی سربیا بوو. شارەزایانی سوپا، خیانەتەکەی ((ریدل))یان بە نیوملیۆن کوژراوی نەمساوی لە نێوان کوژراوو زامداردا هەژمارکرد.

## ♦ ♦ سیخوڕەکانی شەڕێ یەکەمی جیهانی ♦ ♦

لەگەڵ هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕی یەکەمی جیهانی، ئامرازەکانی گواستنەوەو پەیوەندی کردن هەنگاوێکی پێشکەوتووی گەورەیان بڕیبوو. گواستنەوەی هەڵمی لە وشکانی و دەریادا پێشکەوتنی بەخۆوە دیبوو. پەیوەندی بێ تەل و تەلداریش گەشەی سەندبوو، چالاکی و بزوتنەوەی دیبلۆماتیش بلاوبیوەوەو زیادی کردبوو، حکومەتەکانیش دەزگا موخابەراتیەکانی خۆیان پەرەپێداو گرنگیان بە مەشق و تواناکانەوە دا. بەتایبەتی دوای داهێنانی فڕۆکەکان. کار ڕایی کوتوپڕو توندی نا ئاسایی لەبەرگیراو ئە کارەش بە موخابەراتی سپێردرا.. لەوانە بۆ نمونە: بەریتانیا هەموو ئەو کرێگرتەو سیخوڕانەو بیانیە گومانلێکراوەکانی لەناو ولآتدا بوون گرتنیانن. وەکو کارێکی خۆپارستن بۆ دابینکردنی نهێنیەکانی و پاراستنی دامو دەزگاکانی. موخابەراتی بەریتانی توانی کۆدی دەریایی ئەڵمانی پەیدا بکات، بەوە توانی لە جلانەوەکانی هێزی دەریایی ئەڵمانی ئاگاداربێت.

## ♦ ♦ بیتەر هاهنی نانەوا ♦ ♦

زۆربەی حکومەتەکانی سانسۆری توندیان لەکاتی شەڕی یەکەمی جیهانیدا خستە سەر پۆستە، لە ئەنجامی ئەمەدا چاودێرانی بەریتانی ئەنجامی گەورەیان وەدەست هێنا، لەوانە؟، جارێکیان ڕۆژنامەیەکیان دۆزییەوە لە ((دبتفۆرد))ەوە نێرابوو بۆ شوێنێك لە ((ئەمستردام)) ئەو شوێنەی لەناو لیستی گومانلێکراوەکاندا بوو. پشکنینەکان دەریان خست لەسەر ڕۆژنامەکە بە مەرەکەبی نهێنی نامەیەك نووسراوە. نامەکە

دەڵێ: ((س- ڕۆیشت بۆ باکور- لە ٢٠١ وە ئەمەتان بۆ دەنووسم)).

چاودێرانی پۆستە، موخابەراتیان ئاگادارکردەوە، ڕۆژنامەکە لەبەر ئەوەی لە ((دیبتفۆرد))ەوە نێردرابوو، لە شەقامێکی درێژدا بەدوای خانووی ژمارە ٢٠١ گەڕان، شەقامێکیان دۆزییەوە ناوی ((های ستریت))بوو، بۆیان دەرکەوت ئەوە ئەدرێسی نانەوایەکە ناوی ((پیتر هان))ە، کە بە ڕەگەز ئەڵمانیە، کە شوێنەکەیان پشکنی شووشەسەمەرەکەبی نهێنیان دۆزیەوە.

لە ڕێگای ((هانە))وە، موخابەراتی بەریتانی- کە ئەوجا سکۆتلاندیارد- بوو، توانیان کەسایەتی – س – بدۆزنەوە. دەرکەوت سیخوڕێکی ئەڵمانی بەناوی ((مولر))ە، چوو بۆ باکور تا زانیاری لەبارەی بنکەکانی دەریایی بەریتانی وەدەست بهێنێ. ((مولر))یان دەسگیرکردو حوکمی هەڵواسینی درا، بەڵام بەریتانیەکان بەردەوام بوون لە نامە ناردن بۆ ئەدرێسەکەی ئەمستردام بەناویەوە، کە هەمووی زانیاری هەڵەو ناڕاست بوون، لەوێشەوە، لە موخابەراتی ئەڵمانیەوە نامەیان بۆ دەهات، نەیاندەزانی ((مولر)) نەماوە... تا ٤٠٠ جونەیهیان بۆ نارد....

## ◆ ◆ سیخوڕ بە کۆمەڵ ◆ ◆

لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا گەلێ ناوی سیخوڕی بەناوبانگ دەرکەوتن، لەهەموو شوێنێ ناوبانگیان ترسی لە دڵ دەنا، گومان دەکەوتە سەر هەرکەسێك ناوەکەی ناوێکی بیانی بوو، کەسانێکی زۆر لە وڵاتە جیاجیاکان سەرەڕای پاکیان تووشی دەردەسەری دەهاتن بە هۆی ناوەکانیانەوە، کەچی سیخوڕە ڕاستەقینەکان ئازاد بوون و بە نهێنی کارەکانیان ئەنجام دەدا، چونکی سیخوڕ بووە پیشە، گەلێ بنکەو قوتابخانە بۆ فێرکردنی سیخوڕێتی و مەشق کردن لەسەر هونەری سیخوڕی لە وڵاتە پێشکەوتووەکان دامەزرا. تەنها لە ئەڵمانیا، سێ

قوتابخانە بۆ ئەم مەبەستە دامەزرا، لەوانە قوتابخانەی سیخوڕی ئەڵمانی لە ((بادن – بادن)). کە کچێك لە دەرچوانی ئەو قوتابخانەیە بووە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سیخوڕێ نویێ لە ((ئەنتویرب)) لە کاتی داگیرکردنی بەلجیکادا.

ئەو کچە ناوی دکتور ((ئەلیزابیت شراگمولر)) بوو. لەژێر دەستی ئەو کچە قوتابخانەی ((ئەنتویرب)) بووە بەناوبانگترین قوتابخانەی سیخوڕی.

دەسکەوتەکانی موخابەراتی لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا بە گرنگی ئەو کارانەی ئەنجامیان دەداو سوودی چەندە دەپێوران. بەبێ ((تیپی ژمارە ٤٠)) کە بەڕێوەبەرایەتیەکی تایبەت بوو بۆ کردنەوەی ڕەمزو کۆدەکانو سەر بە ئەدمیرالیەتی بەریتانی بوو، بەبێ ئەمە نەیان دەتوانی کۆدی ((زیمرمان))ی تەلەگرافی بکەنەوەو ئەمریکاش لەگەڵ هاوپەیمانانندا نەدەچووە شەڕ'وە.

شەڕی یەکەمی جیهانی، شەڕی ئیمپراتۆرییەتە گەورەکان بوو، هەردوولا سیخوڕەکانیان بەکاردەهێنا بۆ نانەوەی ئاژاوەو بلاْوکردنەوەی نائارامیو دووبەرەکیو کەمکردنەوەی ورەو بڕواو چاندنی تۆی بڕوا نەکردنو گومان پەیداکردن لە نێوان گەلانو حکومەتەکانیاندا و چنینی پیلانو تێکدانی ڕای گشتیو بلاْوکردنەوەی پڕوپاگاندەو ڕوخێنەر..... لەو سیخوڕانە:

### ◆ ◆ مارس ریتشر ◆ ◆

ئەو کچە فرەنسیەی کە بۆ ئەڵمانەکان کاری دەکرد. بەلاْم لە کۆتایدا دڵسۆزی بۆ ولاْتەکەی نیشانداو پێکهاتەی ئەو مەرەکەبە نهێنیەی موخابەراتی ئەڵمانی بەکاری دەهێنا بۆ موخابەراتی فرەنسی ئاشکرا کرد. هەروەها زانیاری تەواوی لەبارەی ژێر ئاوییەکەی ئەڵمان ((یو _

٥٣))ی گەیاند.

## ◆ ◆ کولۆنێل تی. لۆرانس ◆ ◆

کە بە ((لورەنسی عەرەب)) ناسراوە. بەباشی زمانی عەرەبی فێربووو وەکو کەسێکی عەرەب بەجل و بەرگی عەرەبییەوە هەموو تورکیا گەڕا. لە بیابان شۆڕشێکی بەرپاکرد دژی دەسەلاتی تورکی و لە ڕوداوێکی ماتۆرلێخوڕیندا دوای شەڕ لە ئینگلتەرا کۆچی دوایی کرد.....

## ◆ ◆ ویلهیلم واسیموس ◆ ◆

لەسر ڕێبازی ((لۆرانسی عەرەب)) کاری کرد، چووە ناو ئەو هۆزانەی لە بەرزاییەکانی ((فارس)) بوون، هۆزە ئێرانیەکانی دژی تورکیاو بەریتانیا هان دەدا، لەبنەڕەتدا قونسولی ئەلمانیا بوو لە ئێران، لە کارەکانیا بەدەست بلاوی پارەی دەدایە سەرەك هۆزو کرێگرتەکان.....

## ◆ ◆ ماتا هاری ◆ ◆

یان ((چاوی شەبەق)) ئەو سەماکارە جوانەیە کە بووە بەناوبانگترین سیخوڕ لە جیهاندا.

ناوی ڕاستەقینەی ((مارگرێت زبل))ە. دواجا ناونرا ((مارگریت ماکلیود)). فرەنسیەکان سالی ١٩١٧ بە تۆمەتی سیخوڕێکی ئەلمانی دەسگیریان کرد. چالاکیەکانی لە پاریس و ڕۆمانیا، ڤییەننا، بەرلین و شوێنی تر ئەنجام داوە. بەتایبەتی لە سالانی ١٩٠٥ ت ١٩١٧ز. کە گرتیان وتی من بێ تاوانم. هەندێ لە مێژوونووسان گومانی ئەوە دەکەن کەوا سیخوڕ بووە، بگرە فەرماندەرو سەرکردەکانیش عاشقی ببوون. هیچی لەسەر ئسپات نەکرا، کەچی لە پاریس لە سێدارە درا، هیچ بەلگەیەکیانیش بە دەستەوە نەبوو بۆ تاوانبارکردنی

## ♦ ♦ فرانس فون رینتلین ♦ ♦

لە هاوینی ١٩١٤زدا، هێزەکانی ڕوسیا زۆر بەئاسانی، دوو تیپی ئەڵمانی لە بڕوسیای ڕۆژهەلآت لەناوبرد، ڕوسیا بۆ ئەم سەرکەوتنە چەك و جەبەخانەیەکی زۆری لەدەست دا، ڕوسەکان لە شەڕی ((تانبینرگ)) زیانی گەورەیان لێ کەوت، کاتێ تۆپ باران کران و نەشیان دەتوانی ولآمیان بدەنەوە. ڕوسیا هەستی کرد دەبێ چەك لە ئەمریکا بەزووترین کات بکڕێ. ئەڵمانیا پەیوەندی بە سیخوڕ ((فۆن رینتلن)) کرد، تا ئەو ڕێککەوتنە سەرنەگرێ، چونکی ناردنی چەك بۆ ڕوسیا، دەبێـە هۆی کوشتنی سەربازە ئەڵمانیەکان، سەرنەگرتنیشی بەئاسانی کوشتنی سەربازی ڕوسی لێ دەکەوێتەوە. ((رینتلین)) تەماشای کرد چەکەکان هەموو ئامادەکراوە بۆ ناردن و وا لەبەندەری نیویۆرك دانراوە.
((رینتلین)) ئامرازی ئاگرکەوتنەوەی کیمیایی وەدەست هێنا، شارەزایەکی راسپارد تا ژمارەیەکی بۆ پەیدا بکات، هەندێ لە کرێکارەکانی بەندەرەکەشی قەناعەت پێ کرد کە لەنێوان سندوقەکاندا دایان بنێن. ئاگرێك دواجا هەڵایسا هەموو ڕێگای لەنێوان نیویۆرك و بەندەری ڕوسیا ((ئەرشخجل)) گرتەوە، کەیەکە یەکە ئەو پاپۆڕانە بەدەم ڕێگاوە دەسوتان ((رینتلین)) لەگەڵ ئەوەشدا کۆمپانیایەکی لەگەڵ کابرایەکی ئەڵمانیدا دامەزراند، ئامادەیی خۆی بۆ ڕوسیا نیشاندا چەکیان بۆ بە نهێنی، بە ملیۆنەها دۆلار گرێبەستی بەست بۆ هێنانی خواردەمەنی و جل و بەرگ و پێڵاو ئەسپ و کەل و پەلی دیکە.
بەڵێنی دا لەماوەی ٤٥ ڕۆژ ئەو کەرستانە بگەینێ، بەلآم ماوەکە کۆتای هات و هیچی پەیدا نەکرد، ئەمە گوشاری خستە سەر ڕوسیا و سەربازە ڕوسەکان لەدۆخێکی خراپدا مانەوە و ناچار کشانەوە و هێزەکانی ڕوس نەیانتوانی خۆیان لەبەرامبەر هێرشی جەنارالە ئەڵمانیەکە بگرن، ناچار

پاشەکشێیان کرد تا چەك و جبەخانەکانیش لە جێگای خۆیان مانەوەو بەرگری کردن کارێکی نەکردەنی بوو. زیانەکانی ڕوسیا مەزندە نەدەکرا نەوەندە زۆر بێ بێگومان پاڵەوانی ڕاستەقینە لەم شەڕانەدا سیخوڕ ((رینتلین)) بوو، کەچەکی بەدەست سوپای ڕوسیاوە نەهێشت، کردیانە نێچیرێکی ئاان بۆ سوپاکەی جەنەراڵ ((فۆن واکنسین)). سیخوڕە ئەڵمانیەکە سەلماندی کەوا بەتواناترین سیخوڕە تاکو ئێستا.

هەرچەندە خاوەنی ئەم زیرەکییەو لێهاتووییە بوو، بەلاّم لە ئابی ساڵی ١٩١٥ چالاکیەکانی وەکو سیخوڕێك کۆتای پێ هات،و ئەڵمانیا داوای لێ کرد بگەڕێتەوە وڵات. نامەکە لە لایەن موخابەراتی بەریتانیاوە نێرابوو، بۆیە بە پاپۆڕێك لە ئەنریکا گەڕایەوەو کەوتە داوەوە. کە پاپۆڕە هۆڵەندیەکە چووە ناو ئاوی بەریتانیاوە، کۆمەڵێ ئەفسەر چوونە ژوورەکەی و بردیان لە بەریتانیا زیندانیان کرد.

## ♦ ♦ ویلهیلم واسمون لۆرانسی ئەڵمانی ♦ ♦

((لۆرانسی ئەڵمانی)) لە هیچ لایەنێکەوە لە ((لۆرانسی عەرەب)) نەدەچوو. ئەو ئینگلیزە کە جل و بەرگی عەرەبی دەپۆشی لە بیابان سواری حوشتر دەبوو... ((ویلهیلم واسموس)) کورتەبالاّ بوو، قەڵەو، ئازا، ڕوومەت خڕ، دوو چاوی بچووکی لە پشت چاویلکەیەکی بچووکەوە دەشاردنەوە. هەر لە نوێنەری کۆمپانیای تەئمینی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا بەریتانیا پارەیەکی زۆری تەرخان کرد ((٥٠٠٠٠٠)) جونیە، هەرکەسێ بە زیندووی یا مردووی بیگرێ. سوپایەکی بەریتانی شپرزە کردبوو، شایەکی ڕاستەقینەی هۆزەکانی چیاکان بوو. خەریك بوو مێژوو بگۆڕێ. هەرچەندە بۆ ئەم کارانە مەشقی نەکردبوو، بەلاّم سیخوڕێك بوو لە ریزەکانی پێشەوە، لەوانە نەبوو خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بێ، بەڵکو، کاری سەرەکی ئەو گۆڕینی ڕژێمە سیاسیەکان بوو بۆ

بەرژەوەندی وڵاتەکەی، ((واسموس)) هەندێ ئامرازی بەکارهێنا، دواجا بوونە سەرچاوەی سیخوڕی شەڕێ سارد، بۆ دووبەرەکی و ئاژاوە نانەوە لە نێوان گەلاندا، ئەم کارانەش بە پارەو پڕوپاگاندەو تەڵەکەبازی و گەمەی سیاسی.

((واسموس)) کە کرا بە قونسول لە ((بوشەهر)) ساڵی ١٩٠٩ز نەیدەزانی لە داهاتوودا چی ڕۆڵێ دەگێڕێ. ئەوکاتە تەمەنی ٢٩ ساڵ بوو، یەکێك بوو لە دیبلۆماتە دیارەکانی ئەڵمان، لە کاتێکی ناسکدا گەیشتبووە شوێنێکی هەستیار. ئەو دەمە وڵاتی فارس مەیدانی شەڕی نێوان ئەڵمانیا و بەریتانیا بوو، لەپێناو دەسکەوتێکدا زۆر بەنرخ، ئەویش پترۆل بوو، کە ئەوەی سەربکەوتایە تیایدا دەبووە خاوەنی بەرهەمی پیشەسازی گەورە بە هەموو توانایەکیەوەو دەچووە ڕیزی دەوڵەتە پێشکەوتووەکان. ئەوەشی شکستی دەهێنا لە دواوە دەمایەوە.

گەلانی ئێرانی ئەو دەمە لەباری دواکەوتن دەژیا، هەروەك لەسەدەی دوانزەهەمدا بێت. حکومەتی مەملەکەتی فارسیش لاواز بوو، توانای هیچ لایەنێکیانی نەبوو لەگەڵیا بکەوێتە ململانێوە. لە ڕۆژئاواوە کەوتبووە ژێر فشاری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، ڕوسیا لە باکورەوە، هندیش لە باشوورو باشووری ڕۆژ ئاواوە. کە پاکستانی ئەمڕۆیە. شای ئێران _ ئەوکاتە _ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی دەرەبەگ بوو، بەلآم دەسەلآتی لە تاران تێنەدەپەڕی، ئەوەی لە وڵاتەکەش مابووەوە لە ژێر دەسەلآتی هێزە چەکدارەکان بوو..

ئەو ئامۆژگاری و ڕێنماییانەی ئاراستەی ((واسموس)) دەکران بریتی بوون لەوەی بە هەچی نرخێك دەبێ، لەوناوچەیەدا بەرژەوەندییەکانی ئەڵمانیا پەرەی پێ بدرێ. بۆ ئەمە پارەو زێڕێکی زۆری لەبەر دەست دانا، تاکو سەرۆك هۆزەکانی پێ بکڕێ، لە لایەکی تریشەوە بەریتانیاش

هەوڵێکی لەو جۆرەی دەدا، ئێران بووە بازاڕی فرۆشتنی ئینتیماو دڵسۆزی، لە ساڵی ١٩١٤زدا، ئەڵمانیاو بەریتانیا چوونە ناو شەڕەوە، بەریتانیا لەوە سوودی بینی، سوپاو هێزی لە هێند بوو. بۆیە لەناوچەکەدا دەسەڵاتی هەبوو، چەند تیپێکی سەربازی ڕەوانەی ئێران کرد، بارودۆخەکە ئاڵۆز بوو، دیبلۆماتە ئەڵمانیەکان لە ((بوشەهر)) نەمانەوە، دوای ئەوەی ڕووداوەکان وای نیشان دەدا دەسەڵاتی ئەڵمان لە ناوچەکەدا ئاسان نییە، بەڵام ((واسموس)) سەرکردەکانی خۆی لە بەرلین ئاگادار کردەوە، کەوا لە ئێران دەمێنێتەوەو شەڕی داگیرکردنەکەی بەریتانیا لە چیاکانەوە دەست پێ دەکات.

لەهەمان کاتدا، موخابەراتی ئەڵمانی ئاگادارکردەوە، دەبێتە چاوی موخابەرات لە ناوچەکەدا، بەرلین ڕازی بوو، هەرچەند نائومێد بوو کە دیبلۆماتێکی ئەڵمانی بە تەنها بتوانێ کارێکی وات بکات، لە ناوچەکەدا هەمووی کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەوە.

تەنها پیاوێك لەگەڵ ((واسموس))دا مایەوە، ئەویش یاریدەدەری قونسوڵی ئەڵمانیو ١٤٠٠٠٠ مارکی زێڕو هیچی تر.

توانی دەست بە ڕێکخستن بکاتەوەو کەوتە چالاکیەکی بێ وێنە. زمانی فارسیو شێوەزاری تانجستانی فێر ببوو. لەماوەی چەند مانگێکدا توانی کار بکاتە سەر هۆزەکانی چیا نشینو ڕووبەڕووی ئینگلیز ببنەوە. هێزەکانی ئینگلیز کەوتە بەر پەلاماردان، لەوکاتەوە بنکەکانی خۆیان لە کەنارەکان بەجێ هێشتبوو. لە گەڵیا دەستی بە پروپاگاندە کردبوو دژی ئینگلیز بە یارمەتی کۆمەڵێ لە ڕۆشنبیرانی فارس. خەڵکەکەیان بۆ جیهاد هان دەدا دەست بدەنە چەك دژی داگیرکەری بەریتانی((کە خاکی موسڵمانانیان پیس کردبوو)). بەم پروپاگاندەیە خەڵکێکی زۆر بڕوای کرد کە دەبێ جیهاد بکەن، بەتایبەتی قوتابیانی زانیارییە ئاینەکان،

یـەکێ لەوانـە قوتابیـەك بـوو بـەناوی ((خومـەینی))یـەیوە کـە دواجـا دەسەلاٌتی گرتە دەست. لە ساڵی ١٩١٧زدا، ((واسموس)) بووە جێگـای مەترسـی بـۆ ئینگلیـز. تـەنها لـە ئێـران چـالاکی نـەدەکرد، بـەڵکو لـە ئەفغانـستانیش چالاکی دژی ئینگلیـز ئـەنجام دەدا. لـەوێش هۆزەکـانی ورووژانـدو هـانی دان هێـرش بەرنەسـەر هێزەکـانی ئینگلیـز، سـەرنجی فارسـەکانی ڕاکیشا، ڕێزیـان لێ دەگـرت و خۆشـیان دەویـست. پـارەو زێـڕ بارمەتی دەرێکی باشی ئەو بوون و سەریان سوڕ دەما وا بە فارسیەکی جوان دەدوێ.

بەوەوە ڕانەوەستا، واسموس کچی سەرەك هۆزێکی مەجوسی مارە کرد. لـە ئاهـەنگی ژن گواسـتنەوەیدا هـەزاران فـارس ئامـادە ببـوون، لەوانـە تـۆڕێکی سـیخوڕی کـە خـۆی داینـابوو لـەوێ ئامـادە ببـوون. ئـەو تـۆڕە لەسەرتاپای ئێراندا چالاکی دەنواند، تا چالاکیەکانیان گەیشتە بەشێکی ئەفغانستان کە ناوی نابوون ((دەهەزار چاو)).

ئینگلیزەکـان بڕیاریـان دا ((واسمـوس)) لـەناو بـەرن. بـەلاٌم هـەموو هەوڵـەکانیان سـەر نەکـەوت، چـونکی دەسـت و پێوەنـدەکانی لـەکاتی گونجـاودا ئاگاداریـان دەکـردەوە. ئینگلیزەکـان بۆیـان دەرکـەوت کـەوا ((تـۆڕی دەهـەزار چـاو)) چـالاکیەکانی گەیـشتۆتە هنـد، دەرکـەوت کـەوا ئـەڵمان لـە هـەموو جموجـۆڵێکی سـەربازی بـەریتانی ئاگـادارە، هـەر لـە بەغداوە تا دەگاتە بومبای. نا ئومێدی ئینگلیز گەیشتە ئەوەی پاداشتی ٥٠٠٠٠٠ جونەی بداتە ئەو کەسەی ((واسموس)) دەسگیر بکات. بەلاٌم کەسی وایان دەت نەکەوت ئەو کارە ئەنجام بدا....

لـە سـەرەتای سـاڵی ١٩١٧ز، دژی ئـەڵمانیا شـەڕ دەسـتی پـێ کـرد. فارسەکان وایان بەباش زانی بەدوای قازانجی خۆیان بگەڕێن...هەستیان کرد، کاتی ئەوە هاتووە لەگەڵ بەریتانیادا ڕێك بکەون. بەتایبەتی زێڕی

ئەڵمانی لەکورتی دابوو، ئینگلیز دەستی بە پارەو زێڕ بەخشین کردبوو. وسمووس هەوڵی دا کەمبوونی زێڕ بەوە قەرەبوو بکاتەوە زیاتر پڕوپاگاندە بکات، بەجۆرێ وای بڵاوکردەوە کەوا قەیسەری ئەڵمانیا چۆتە سەر ئاینی ئیسلام.

ئینگلیز هێرشێکی بەربلاوی کردە سەر کەناراوەکانی ئێران، هێزێکی دەریایی بچووک و ۱۰۰۰۰۰ سەربازی لەو هێرشەدا بەکارهێنا. ساڵی ۱۹۱۸ز ئەو کێشەیەی کۆتایی پێ هێنا. بەڵام ((واسموس)) بە دزییەوە چووە تورکیا، ئینگلیزەکان کەوتنە دوای، گرتیان و لە زیندانیان نا، کە ساڵی ۱۹۲۰ز بەرەڵلایان کرد، زۆر بە هەژاری ژیانی بەسەر دەبرد و بیری لەو هەوڵ و کۆششانەی دەرکدەوە کە بە فیڕۆ ڕۆیشت.. ساڵی ۱۹۳۱ بە هەژاری مرد و لە بیری کەسدا نەما.

## ♦ ♦ بەزاندنی هێڵەکان ♦ ♦

لە زۆربەی کارە سەربازییەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی سەنگەرەکان دەبووە مەیدانی پێکدادان. جا تێپەڕبوون لەو هێڵە گرنگانە کاری سەرەکی سیخوڕەکان بوو جا دابەزین و کردنە خوارەوەی سیخوڕەکان بەپەرەشوت لەناو خاکی دوژمندا دژوارترین گۆڕانکارییەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی بوو. کارێکی مەترسیدار بوو، زۆر جاریش شەوانە ئەنجام دەدرا. لەوکاتەشدا فڕۆکەوانی کارێکی نوێ بوو، و خۆ خستنە خوارەوەش بە پەرەشووت ئازایەتی تایبەت و مەشقکردنی سەختی دەوێ.

سیخوڕێ پەرەشووت لە شوێنێکی تایبەتی ژێرەوەی فڕۆکەکەوە دادەنران، فڕۆکەوانەکە دەیزانی کەی دەرگاکەی لێ دەکاتەوە و دادەبەزێ. ئەم ڕێگا سەرەتاییە، تا سیخوڕەکە ئامادەشی نەبووایە هەر دەکرایە خوارەوە. زۆرجار کێشەی لێ پەیدادەبوو، بۆ نموونە: سیخوڕێ

ئیتالّی ((ئەلیساندرۆ تاندورا)) لەناو شوێنە تایبەتیەکەی خۆیدا خەوی لێ کەوتبوو، لەوکاتە بەئاگا هات کە لە بەرزی ۳۰۰۰م کرایە خوارەوە. لەگەڵ ئەمەشدا بە سەلامەتی دابەزی.

واباو بوو، سیخوڕەکان لەو شوێنانە دادەبەزین سیخوڕی تێدا بووایە. سیخوڕەکان دەبووایە لەوە دڵنیا بوایەن ئایا ئەو سیخوڕانە کە دەهاتن لەگەڵ خۆیاندان یا سەر بە دوژمنن...

ژنە سیخوڕی بەلجیکی ((مارت کنوکارس)) تێبینی سیخوڕێ گەورەی بەو پەڕی لێهاتووییەوە بەڕێوە دەبرد، ئەو سیخوڕانەی سنووریان دەپەڕاند بۆ یارمەتی دانی دەهاتن دوو دەمبووسیان لە یەخەی چاکەتەکەیان دەدا، بۆیە بە ((پیاوانی دەمبووس)) ناسران.

گواستنەوەی زانیارییەکان لە پشت هێڵەکانی شەڕەوە بۆ سەرکردایەتی موخابەرات لە نیشتیمان کارێکی ئاسان نەبوو، بۆیە هەندێ جار ((کۆتر))یان بەکار دەهێنا. کۆتریش پێویستی بە چاودێری زۆر هەبوو، دەبوا ڕۆژنە دوو جار خواردنی پێ بدرێ و سیخوڕەکە بۆ کوێ ڕۆیی لەگەڵ خۆیدا بیبا، و بینینی کۆتریش بەلای هەر کەسێکەوە بوایە کارێکی مەترسیدار بوو و تۆمەتی سیخوڕیان دەدایە پاڵ.....

سیخوڕەکان بێ تەلیان بەکار دەهێنا، سەلامەت ترەو باشترە. سیخوڕەکە دەیتوانی چەند ڕۆژێك لە جێگایەکدا بیشاردایەتەوەو نزیکی نەکەوتایە.. هەندێ سیخوڕ نامەیان دەگواستەوە گەلێ ڕێگایان بەکار دەهێنا،هەندێکیان لە پاژنەی پێلاوەکانیان دەیان شاردەوە، یان لە تۆی چاوی شووشەییدا: تۆڕێکی سیخوڕی بەلجیکی نامەی لەناو دەستی جەنازەیەکدا شاردبوەوە، دوای ئەوەی ڕێگایان درا جەنازەکە لە ئەڵمانیاوە بگوازنەوە. هەر بەو جۆرە نامەیان بۆ قونسوڵی بەریتانی لە هۆڵەندا نارد ((میجور ئوبنهایمەر)).

هەندێ جاریش، کە سیخوڕەکان کارەکانیان لە خاکی دوژمن ئەنجام دەدا، بە فڕۆکە لە جێگایەکدا هەڵیان دەگرت و دەیان بردەوە. بەلاَم ئەمەیان کارێکی دژوارە، زۆر استەنگە فڕۆکەیە لە خاکێکی دیکە بنیشێتەوەو پێی نەزانرێ. زۆر جاریش دەبووایە سیخوڕەکە بە پێی خۆی بگەڕایەتەوە.

## ♦ ♦ نیکولای و نادجیدا سکوبلن ♦ ♦

هەر وەك دیمەنێکی سینەما هاتە بەرچاو: ژنە سیخوڕی جوان، بەدارێکەوە بەستراوەتەوە، ڕازی نییە، چاوی داپۆشن و ببەستنەوە، تیپێکی ئیعدامیش وا ئامادەیە.

جوانیەکەی هەستی ئەفسەرێکی سوارەی گەنج دەبزوێنێ، بە ئەسپەکەی نزیك دەبێتەوە، داوای لە تیپەکەی کرد تەقەی لێ نەکەن. چوو دەست و پێی کردەوەو لەسەر پرسیارێتی خۆی ئازادی کرد، وتی خۆم خەمی ئەو کارە دەخۆم........

بەوجۆرە جەنەڕاڵ ((نیکۆلای سکۆبلن)) لەگەڵ ((نادجیدا فاسیلبیفنا))ی کچی جواندا ڕەفتاری کردو بۆ یەکەم جار بینی....

بەیانیەکی زوو، لە بەهاری ساڵی ١٩٢٠ز و لە باشووری ڕوسیا ئەم ڕووداوە ڕوویدابوو. دەست بەجێ عەشقی چووە دڵیەوە، ئەمەش ئەنجامەکەی کە لێی کەوتەوە زیانی گەیاندە یەکێتی سۆڤیەت. وە بووە هۆی کوشتنی زیاتر لە ٣٠٠٠٠ کەس. سکوبلن خۆی یەکێك لەو قوربانیانە بوو. هەریەك لە ((سکوبلن)) و ((فاسیلفنا)) کەسایەتیەکەیان لە کەسایەتیەکانی ئۆپێرای ((ڕۆمانۆف گەورە)) دەچێ. بەوەی هەردووو لە ئوروستراکتن. سکوبلن ئەفسەرێکی سوارەی قەیسەر بوو لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا. کە بولشەفیکەکان دەسەلاَتیان بەدەستەوە گرت. ((سکوبلن)) لە شەڕی ناوخۆدا لەگەڵ سپیەکاندا بوو، ساڵی ١٩٢٠ز لە

دژی سوپای سوور لە شەڕێکی دۆڕاودا بوو لە باشووری ڕوسیا، لەهەمان سالٚ قەدەر ئەو دووانەی بەیەك گەیاند، لەگەلٚ ((نادجیدا)) دا هەرچی ((نادجیدا))بوو، ئەمیش لە خانەوادەیەکی ئوروستۆکرات بوو، بووە گۆرانی بێژی ئۆپێرا، پێش شەڕ نازناوی (بولبوول))یان لێ نا. فێری ژیانی خۆش و بەزم و ئاهەنگ گێڕان بوو، فێری ژیانی خۆش و جل و بەرگی جوان بوو، شۆڕشی بولشەوی ژیانی لێ تالٚ کرد، تێدا بواری خۆش گوزەرانی نەبوو، ڕۆژ بەڕۆژ بارودۆخی خراپ دەبوو، تا شووی کردە هونەرمەندێکی هەژاری بالٚی ((ئیدمۆند بیلفیتیسکی)) لە کۆتایی سالٚی ١٩١٨ بوونە ژن و مێرد. بەهەژاری دەژیا وەکالەتی موخابەراتی بولشەوی بەهەل زانی، کەلکی لە ئارەزووو خواستەکانی بینی و لەکاری سیخوڕیدا دژی هێزە سپیەکان بەکاریان هێنا.

لەسالٚی ١٩١٨زدا، موخابەراتی سۆفیاتی داوای لێکرد، دزە بکاتە ناو ڕێکخراوەکانی دوژمنەوە، ئەوانەی جێگای هەڕەشە بوون بۆ ڕژێمی ڕوسی نوێ.

فاسیلفینا، بۆ ئەم کارە لەبارو گونجاو بوو، بۆ ئەو جێگایانە گەشتی دەکرد کە سپیەکان داگیریان دەکرد. بەبێ پارە ئاهەنگی بۆ سەربازەکان دەگێڕا، دۆستایەتی لەگەلٚ ئەو سەرکردانە پەیدا کرد کە دوژمنی بەلشەفی بوون، کە ((بولبول))یان زۆر بەدلٚەوە چووبوو، لەم ماوەیەدا زانیاری لێ کۆدەکردنەوە...... سالٚی ١٩٢٠ز، لەگەرمەی شەڕێ ناوخۆدا، گومان لەوە پەیداکرا کە ڕەنگە گەشتەکانی بە بێ هودە نەبێ، چونکی لەو سالٚەدا زنجیرەیە شکست هێنان تووشیان دەبوو. لە سالٚی ١٩٢٠ز، چەند نامەیەکیان گرت کە بۆ موخابەراتی بەلشەفیك دەینارد، بەمجۆرە بەلٚگەیان بەدەست کەوت، گرتیان، فەرمانی گوللە بارانی بۆ دەرچوو.

((نیکۆلای سکۆبلن)) عاشقی بوو، سوور بوو لەسەر لێ خۆشبوونی لە

دان پێدانانەکانی، گوایە ناچار کراوە کار بۆ بەلشەفیك بکات، موخابەراتی بەلشەفیك گەیشتە بیرۆکەیەکی کە، ئەویش ((نیکۆلای سکۆبلن)) بکەنە کرێگرتەی خۆیان. دەیانزانی چەند ڕوسیا لە لای پیرۆزە. ((سکۆبلن)) لەمیانەی شێتی خۆ بەزا زانینەوە خۆی بە سەرکردەنی هەموو جولآنەوەیەکی نوێ دەزانی، لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٠ز ((فاسیلیفینا))و ((سکۆبلن)) لەگەڵ هێزەکانی سپیەکاندا بۆ تورکیا نێردران......

((سکۆبلن)) موخابەراتی بەلشەفیکی بەکار دەهێنا بۆ گەشتن بە ئامانجەکانی، لە ڕێگایانەوەو بەناوی ئەوانەوە بزوتنەوەی دوورخراوە ڕوسەکانی تێکدەداو دەسەلات بەدەستەوە دەگرێ، ئەگەر ئەم ئامانجەی بێتە دیو گەڕایەوە ڕوسیا دەتوانێ سوپایەکی سەلیبی پیرۆزو گەورە بەڕێوەببات ڕوسیا دەگەڕێنێتەوەو بولشەفیك لەناو دەبا لەگەڵ موخابەراتەکەشیاندا .... خەریکی ئەم خەیالآتانە بوو.

سکوبلن و فاسیلیفنا، خۆیان گەیاندە پاریس، کە سەرکردایەتی بزوتنەوەی ڕوسە ئاوارەکان لەوێدا بوو، کە ساڵی ١٩٢١ز پێکهێنرابوو و مەترسیەکی گەورەبوو بۆ ڕژێمی کۆمۆنیستەکان کە ئەو کاتە لاواز بوو....

زیاتر لە ٣٠٠٠٠٠ چەکدار خۆیان کردبووە قوربانی کێشەی قەیسەری، خەرجی ئەوانەش لەو ملیۆن ئەندامەوە بوو کە لە جیهاندا پەاگەندە ببوون. ((لینین)) کاری لەناوبردنی ئەوانەی بە موخابەراتی بەلشەفی سپاردبوو، ((سکوبلن)) ئامرازێکی جێ بەجێ کردنی ئەوکارە بوو. ((فاسیلفینا))ی خواستو دزەی کردە ناو دوورخراوەکانەوە، ڕابردووی پاکی یارمەتی دەدا، هەروا شارەزایی سەربازی هۆکارێکی تربوو بۆ بڕوا پێکردنی و مێژوویەکی کۆنیشی هەبوو لە بەرەنگاربوونەوەی بەلشەفی،

کەس گومانی لە دڵسۆزی ئەو نەدەکرد. لەسەرەتای سییەکاندا بووە سەرۆکی ڕێکخراوە دژ بە بەلشەفیك و هێزی سەرەکی دوورخراوەکان. لەم جێگایەیەوە توانی مۆسکۆ لەو کەسانە ئاگادار بکاتەوە کە بەدزی گەڕاونەتەوە ڕوسیا. بۆ ئەوەی بزوتنەوەیەکی چەکداری دژی بەلشەفی دروست بکەن.

هەروەها ئاگاداری لەو ساختەکارییانە بوو کە دوورخراوەکان دەیانکرد. وەکو دروست کردنی بەڵگەنامە، بەڵگەنامەی ساختەیان دەرکرد گوایە لە دۆسیەکانی پۆلیسی قەیسەریەوە وەرگیراوە، یەکێ لەوانە، ئەوەی دەردەخست ستالین سیخوڕی پۆلیسی قەیسەری بووە....

ناوی ((موخابەراتی بەلشەفی)) گۆڕاو کرا بە ((موخابەراتی سۆڤیەتی)). توانی هەموو هەواڵەکانی دوورخراوەکان پوچەڵ بکاتەوە. سەرەڕای ئەمەش، دوورخراوەکان دەچوونە ناو موخابەراتی دیکەوەو تووشی خیانەتکاری دەهاتن. دوای ١٥ ساڵ لە دەرچوونیان لە ڕوسیا، دوورخراوەکان هیچ کارێکی سەرکەوتویان لە یەکێتی سۆڤیەت ئەنجام نەدا. بۆیە سەرکردەکانیان بەخۆیانا چوونەوە، ئایا یەکێ لە سەرکردەکانمان لە خیانەتکاری دەستی تێکەڵ بووەو پەیوەندی بە مۆسکۆوە هەیە؟

گومان کەوتە سەر ((سکوبلن))و ((نادجید)) ئەو پیاوە گەورەو بچووکی نهێنی دوورخراوەکان دەزانی، زۆر پرسیار دەکات، ئەوەی ئەو دەربارەی ڕێکخراوەکە دەیزانێ کەسێکی کە نایزانێ، چونکی سەرۆکی بەشی عەمەلیات بوو دژی سیخوڕی دەرەوە، بۆیە مافی ئەوەی هەبوو پلانی بزوتنەوەکە بزانێ. لە لایەکی ترەوە گوزەران و جۆری ژیانیان سەرنجی ڕادەکێشا، بەتایبەتی هیچ دەسکەوتێکی وای نەبوو، ((نادجیدا)) سکوبلن)) ئیدعای ئەوەی کرد کە پارەیەکی باشی لە

کارەکەیەوە دەست دەکەوێت. بەڵام ئەو پارەی خەرجی دەکرد لە فەرەنسا دەستی نەدەکەوت.

((سکوبلن)) کەوتە ژێر چاوەدێرییەوە. بەڵام بەڵگەی پێویست نەبوو، هیچ گوێی بەو قسانە نەدەدا، لە ساڵی ١٩٣٦ گەورەترین کاری ئەنجام دا، سکوبلن، داوای لە موخابەراتی نازی کرد، لەگەڵیاندا کار بکات. پێیانی گوت دەمەوێ ئێوە دەست بەسەر بزوتنەوەی دوورخراوەکاندا بگرن و دواجا دژی یەکێتی سۆڤیەتی بەکار بهێنن. موخابەراتی نازی بەمە ڕازی بوو، چونکی هیچ زیانێك ناکات. بەمجۆرە، ((سکوبلن)) بووە کرێگرتەی نازییەکان لەناو بزوتنەوەی دوورخراوەکاندا، ((سکوبلن)) ئیدعای ئەوەی دەکرد کە سەرچاوەی گرنگی هەیە لە یەکێتی سۆڤیەت، کە جارجار زانیاری گرنگی پێ دەدەن، لەگەڵ موخابەراتی نازیدا کەڵکی لێ وەردەگرین. دوای ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ موخابەراتی نازیدا پەیداکرد. ((سکوبلن)) کەوتە خۆی بۆ قۆناغی دووەم لە کارەکەیدا. ((سکوبلن)) ڕایگەیاند، کەوا بەڵگەی بەدەستەوەیە کەوا سەرکردایەتی سوپای سۆڤێتی خەریکی پلان دانانە کودەتا دژی ستالین ئەنجام بدات. ((سکوبلن)) زۆر بە پەرۆشەوە بوو داوای دوو ملیۆن دۆلار بکات لە بەرامبەر ئەم بەڵگانەدا. ئەمەش زیرەکیەك بوو بۆ ئەو. چونکی ئەگەر بێ پارە ئەو بەڵگانەی بدابا، موخابەراتی ئەڵمانی دەکەوتە گومانەوە. چونکی نرخێکی زۆرە ، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو بەڵگانە ڕاستن.

ئەوەی جێگای گاڵتەجارییە لەم یارییەدا ((رینهارد هیدریك)) سەرۆکی موخابەراتی نازی، ڕاستی و دروستی بەڵگەکانی لە لا مەبەست نەبوو. ئەویش پلانی تایبەتی کاری سەختەکاری خۆی دەکرد. بەو ئومێدەوە بەڵگەنامەی ناڕاست دەستکەوێ تا سەرکردە گەورەکانی سۆڤیەت تاوانبار بکات بە تەکبیرکردنی کودەتایەك دژی ستالین. جا ئەوکاتە

پەرچەکدرای ستالین دەبێتە هۆی پارچە پارچەکردنی یەکێتی سۆڤیەت لە ڕووی سیاسیەوە.

لە نێوان ((سکوبلن)) و ((هیدریك)) بەیەك گەیشتنێکی سەیر ڕویدا، ئەنجامەکی جێگای گاڵتە پێ کردنە.

هیدریك هەر دەست بەجێ بۆی دەرکەوت ((سکوبلن)) کار بۆ موخابەراتی ڕوسی دەکات، ئاشکرایە ((ستالین)) ڕاستەوخۆ بەڕێوەی دەبرد......

بەهەرحاڵ، وتووێژی ((هیدریك)) بە هێمنی تێپەڕی بەوە ڕازی بوو کە ئەو بەڵگەنامانەی ((سکوبلن)) بکڕێ.... وتیشی، بەڵگەنامەی لەمە گرنگتر لامانە، کە موخابەراتی ئەڵمانی دەستی کەتووەو بەڕێگایەکدا بە دەستی یەکێ لەوانەی ((ستالین)) بڕوای پێ دەکات بۆی دەنێێت. ئەویش ((ئێدوارد بینیز))ە، کە سەرۆکی چیکۆسلۆڤاکیەکانە.

ئەنجامەکەشی یەکێك بوو لە کوشتارە بێ وێنەکانی مێژوو. ستالین کەوتە سەر ئەو باوەڕەی کەوا یاخیبونێکی سەربازی نزیکە، دەستی کردە پاککردنەوەی هێزی چەکدار، نزیکەی ٣٥٠٠٠ ئەفسەری هەڵواسی، کە پاککردنەوەکە کۆتایی هات، لە ٩٠٪ جەنەڕاڵەکانی یەکێتی سۆڤیەتو ٨٠٪ کۆلۆنێلو نیوەی لە دەرەجە دارەکان بەدەستی ستالین لەناو بران. سوپا لەم کارەساتە تا چەندین ساڵ نەیتوانی بێتەوە سەر خۆی. کە هێرشی ئەڵمانی دەستی پێ کرد، سوپایەکی هەبوو سۆڤیەت بێ سەرکردە، لەو شەڕەش حەوت ملیۆن جەنگاوەری لەماوەی دوو ساڵدا لەناوچوون.

بزوتنەوەی دوورخراوەکانی ڕوسی ئەم ئەنجامەیان چەند پێ خۆش بێ، بەلاّم ئاگادار نەبوون لە ڕۆڵی ((سکۆبلن)) بەلاّم هەر گومانیان دەکرد لە خۆیو ژنەکەی....

مۆسکۆ _ لەبەر چەند هۆیەك _ وایدەبینی کەوا جەنەڕاڵ ((ئەنتۆن

میلر)) سەرۆکی باڵی سەربازی بزوتنەوەی دوورخراوەکان، پیاوێکی مەترسیدارەو دەبێ لەناو ببرێت.

بڕیار درا لە بارەگای تیپەکەی لە پاریس بڕفێندرێتو دواجا بۆ یەکێتی سۆڤیەت بگوازرێتەوە. جێ بەجێ کردنی ڕفاندنەکەیان بە ((سکوبلن)) سپارد. لە ئەیلولی ١٩٣٧، سکوبلن بۆ نان خواردن بانگی کرد تا لە ستراتیجی پاشەڕۆژ بدوێن. ((میلەر)) لە هەموو کەسێك زیاتر، گومانی لە ((سکوبلن)) هەبوو، ڕازی بوو بە کۆبوونەوەکە بەڵام _ بە وریاییەکی زۆرەوە _ لە مەکتەبەکەی خۆیدا لەسەر پارچە کاغەزێك بانگێشتەکەی سکۆبلنی نووسیبوو. ئەو پارچە کاغەزە بووە هۆی لەناو بردنی سکوبلن، میلەر گەیشتە شوێنی دیاریکراو، چەند کەسێك هێرشیان کردە سەری، بەرنگاری کردنی میلەر سەرنجی چەند شایەت حاڵێکی ڕاکێشا، بەڵام موخابەراتی سۆڤیەت ((میلەر))یان لە ئۆتۆمبێلێك ناو دووریان خستەوە، پۆلیس جێگای ((میلەر))ی نەدۆزییەوەو بەیەکجاری دیار نەما. بەڵام پارچە کاغەزەکەیان دۆزییەوە، کەوتە گەڕان بەدوای ((سکۆبلن))دا، بۆ ماوەیەك دیار نەما، دواجا لەگەڵ ((نادجیدا)) دەستگیریان کرد. هەردووکیان دادگایی کران، تۆمەتی ڕفاندنیان لەسەر سەپێنراو بە ٢٠ ساڵ (نادجین)) حکوم درا، دواجا ساڵی ١٩٤٠ لە بەندیخانە کۆچی دوایی کرد.

مێردەکەی لە زیندانـدا، موحابەراتی سۆڤیەتی پێی ڕاگەیاند کەوا دەیانەوێ بۆ یەکێتی سۆڤیەت بیڕفێنن. ((سکوبلن)) ئەوەی بەسەردا تێپەڕی، کەوا ((ستالین)) ڕازی نابێ ئەوانەی نهێنیان لایە بە زیندوویی بمێننەوە.

بۆ دواین جار ((سکوبلن))یان بە زیندووی لە بەندەری بەرشەلۆنە لە ئیسپانیا بینی کە کۆمەڵێ سەربازی سۆڤیەت پاسەوانیان دەکرد. لەناو

پاپۆڕەکـە، ((مـەی)) یـان دەرخـوارد دا، بـەڵام ژەهـراوی بـوو، زۆری نەخایەنـد بـەو ژەهـرە مـرد، تەرمەکـەیان گەڕاندەوە سۆڤیەتو دایـان بـە موختەبەری یەکێ لە کۆلێژەکانی پزیشکی.

## ♦ ♦ لۆرد بادن باول ((کەشافەی یەکەم)) ♦ ♦

((لـۆرد بـادن بـاول)) بـەوە ناسـراوە کـە کۆمەڵـەی گـەنجانی کەشـافەیە... بـەڵام کـەم کـەس دەیزانـی یەکێکـە لـە سـیخوڕە چالاکەکانی بـەریتانیا.. چـەند خەسـڵەتێکی تێـدابوو بۆنـە هـۆی ئـەوەی بـچێتە نـاو جیهـانی سیخوڕییەوە، لەوانە: حەزی لە سەرکێشی بوو، توانـای کـەڵك وەرگرتنـی لـە هەڵوێـستەکان هـەبوو، ڕێـكو پێـكو شـێك بـوو، خـووی سەیریـشی هەبوو.

بـادن، خوێنـدنی سـاڵی ١٨٧٦ تـەواو کـرد، چـووە تیپـی ((هوسـار))ەوە تیپەکـەی بـۆ ((ناتـال)) گوێزایـەوە لـە باشـووری ئـەفریقا. دوای خزمـەتی حـەوت سـاڵ لـە هێنـد لەوێـدا بـووە کارمەنـدێکی موخابـەرات. وەکـو فەرماندەیـەکی سووسـەکردنو هـەوڵگری لـە سـنووری ناوچـەکەدا درێژییەکـەی ٦٠٠ میل بـوو، دوای دوو سـاڵ بـۆ ئینگلتـەرا گوێزرایـەوە، دووبارە گەڕایەوە باشووری ئەفریقا لە ساڵی ١٨٨٧زدا.

لـە سـاڵی ١٨٩٠زدا، بـاول بـە سـکرتێری سـەربازی لـە لای مامـەی کـە فـەرمانڕەوای ((مالتـە)) بـوو، دامـەزرا. دوای سـاڵێك بـووە ئەفـسەری موخابـەراتی ناوچـەی دەریـایی سپی ناوەڕاسـت. لـەم کارەیـدا مـاوەی ئازادی هاتوچۆکردنی بۆ ڕەخسا. توانـا و دەسـەڵاتی خـۆی لـە خزمـەتی سـیخوڕێتی بـۆ بـەریتانیا دانـا. بـەوە ناسـرابوو، زۆر زیرەکانـەدەیتوانی خـۆی بگـۆڕێو بـشارێتەوە. کـاتێ جارێکیـان ڕایدەسـپێرن زانیـاری کۆبکاتەوە لەبارەی قەڵایەك، خۆی وەکو هونەرمەندێك پێشاندا مەشقی لەسـەر وێنـە کێـشان کـرد. بـەر لـەوەی بـۆ جـێ بـەجێ کردنـی کارەکـەی

بڕوات. تا بەوردی هەواڵی ئەو تانكو تۆپو جبەخانەیەی ئەویٚ بزانێت.
ناوبانگی ((باول)) لە بەریتانیا بلاٚوبووەوە، دوای ئەوەی ۲۱۷ ڕۆژ لەشاری ((مافكینگ)) ئابلۆقەدرا، تا یارمەتی پێگەیشتو ساڵی ۱۹۰۰ ڕزگاری بوو. ناوبانگی وادەرچوو تا تشرشل لەبارەیەوە وتوویەتی ((ئەگەر ناوبانگی گەورەی وەدەست هێنابیٚ ((باول))ە)). بادن باول، چالاكیەكانی بە دوو شت دەشارییەوە.

• یەكەمیان ◆ ◆ پشكێنەری تیپی سووارەی بەریتانیا بوو، ئەم كارەی وای كرد بەم شوێنانەدا بگەڕیٚ: كەنەدا، ئەڵمانیا، هند، میسر، خوارووی ئەفریقا و گەلیٚ ولاٚتی دیكەش.

• دووهەمیان ◆ ◆ یەكیٚ بوو لە پێشەنگەكانی كەشافەو دامەزرێنەرانی. لە كاتیٚ ئابلۆقەكەی ((مافكینگ)) دا كتێبێكی دانا بەناوی ((ئەو ئامرازانەی یارمەتی دۆزینەوە دەدەن)). دەركەوت ئەو كتێبە لەناو ناوەندی مەدەنیدا زۆرتر بلاٚوبووەوە وەك لەناو ناوەندی سەربازیدا.. سەرچاوەیەك بوو بۆ كۆبوونەوەو یانەكانی گەنجان. ئەمە وایلێكرد زۆرتر گرنگی بە كێشەكانی گەنجان بداتو هەوڵی ڕێكخستنیانی دەدا لەناو چوارچێوەیەك بتوانن بە ئازادی هەڵسو كەوت بكەنو ئاواتەكانیان وەدی بێنن....

لە تەموزی ساڵی ۱۹۰۷، سەربازگەیەكی دانا لە یەكیٚ لە دورگەكانی بەریتانیا لەگەڵ ۲۱ گەنجدا، كە ئەوە یەكەم مەعەسكەری كەشافە بوو. كەسیان ئەوەیان بە خەیاڵدا نەدەهات كە ئەم كابرایە دەبێتە ڕابەرو سەركردەیەكی بزوتنەوەی كەشافەی جیهانی...

ساڵی ۱۹۰۹ز ((باول)) بۆ بەرازیل ڕۆیشت، لەویٚ لە ((ریو))و ((بونیس ئایرس)) پێشوازییەكی گەرمی لیٚ كرا،

شیلی، یەكەم ولاٚتە دوای بەریتانیا بیرۆكەی كەشافەی تێدا دەركەوت

پیادەی کرد. لە ساڵی ١٩١٠ز، لە کۆشکی ((کریستاڵ))ی بەریتانی کۆبوونەوەیەکی گەورەی کەشافەی سازاند. کە ١١٠٠٠ کەشافەی بەشداری تێدا کرد. لەدوای ئەوە، بزوتنەوەی کەشافەی لە ولاتە یەکگرتوەکانە ئەمریکا لە ساڵی ١٩١١ز گەشەی سەند.

جا هەندێ کەس، ئەم چالاکیانەی لەبواری کەشافەدا بەوەوە گرێ دەدا، گوایە بەهۆیەوە زانیاری کۆدەکاتەوە....

## ♦ ♦ موخابەراتی شەڕی دووەمی جیهانی ♦ ♦

توندو تیژی شەڕی دووەمی جیهانی، لە شەڕی یەکەمی جیهانی زۆرترو سەختر بوو. زۆرتر تۆپو تانكو فڕۆکەو پەرەشووتی تێدا بەکار برا. کە وای کرد جمو جوڵی سوپاو سەربازەکا خێراتر بێ. بۆیە زانیاری دەربارەی نیازو خواستی دوژمن رەکەزێکی گرنگ بوو، لێرەوە گرنگێتی سیخوڕێتی دەردەکەوێت، وەکو ((ریتشارد سورگ)) ئەوانی دی کە پیش هەڵگیرسانی شەڕ چالاکیەکانیان دەستی پێکرد. جیٚو پێی خۆیان لەو شوێنانە کردەوە کە کارە سیخوڕییەکانیان تێدا کردو دۆستایەتیو هاوڕێتیان کرد لەگەڵ سەرچاوەکانی زانیارییەکانداو خۆیان دەپارستو ئاشکرا نەدەکرد تا کەس گومانیان لێ نەکات.

لە ئەنجامەکانی ((سورج)) _ بۆ نموونە _ دەستگیرکەوتنی زانیاری پێشین لەبارەی پلانی هێرشی یابان بۆسەر بنکەی ((بیرل هاربور))ی دەریایی لە ئۆقیانوسی ئارامدا، بەلاّم لەبەدبەختی یابان دەستپێشخەری کرد. لەلایەکی ترەوە گەلێ زانیاری نهێنی گرنگی بە ڕوسیا دا، لەساڵی ١٩٣٥ تا ڕۆژی گرتنی لە تشرینی ١٩٤١ز وەکو لەمەودوا باسی دەکەین.

ئەمریکیەکان دواجا بەکارێکی سیخوڕی تۆڵەی خۆیان کردەوە لە پرۆسەیەکدا بەناوی ((پرۆسەی جادو)). یابانیەکان کۆدێکیان داهێنابوو ناویان نابوو ((مەکینەی گۆڕینی سومبولی ئەرجوانی)) وایان

دانابوو هەڵە ناکاو پەکیشی ناکەوێت... لەکاتی شەڕدا بەکاریان هێناو زۆربەی فەرمانە دەریاییەکانیان بەوە جێ بەجێ دەکرد. بەلاّم شارەزایانی ئەمریکی رەمزەکانیان هەڵهیناو جۆرێکی تایبەتیان لە مەکینەی ئەرجوانی بۆخۆیان دروست کرد. توانیان لەکاتی شەڕدا جولانەوە دەریاییەکانی یابان لە زەریای ئارامدا بزانن.

((پرۆسەی جادو)) بۆ سیخوڕە پیشەییەکان بوو، بەلاّم بواری هەبوو بۆ ئەوانەی نوێ بوون لە کارەکانیاندا. خزمەتکاری بالّیۆزی بەریتانی لە تورکیا، بە ئەڵمانەکانی ڕاگەیاند کەوا سیخوڕیان بۆ بکات و ناوی خۆی گۆڕی و کردیە ((سیسرۆ)). هەرچی بەڵگەنامەیەکی نهێنی هەبوو لە بالّیۆزخانەکەدا، دزی و وێنەی لێگرتەوە، خۆشبەختانە ئەڵمانەکان، لەو بڕوایەدابوون کەوا ڕاست نین و فیتی ئینگلیزە کە پێیان دەدات...

هیچ کارڕاییەکیان لەبارەیەوە نەکرد. کە ((سیسرۆ)) خەریکی خەرج کردنی ئەو پارە زۆرانە بوو کە پێیان دەدا، بە تۆمەتی ساختەکارییەوە گیرا، دەرکەوت ئەڵمانەکان پارەی قەڵپیان پێداوە. گومانکردنی ئەڵمانەکان لە جێگای خۆیدا بوو، چونکی ئینگلیز گەلێ کاری هەڵخەڵەتێنەریان ئەنجام دابوو، سیخوڕەکانیان ڕاهێنابوو لەگەڵ هێزەکانی بەرگریدا لەو ولاّتانەی نازییەکان داگیریان کردبوو، کاربکەن. پێویستیەکانیان بۆ دابین دەکردن. وەکو دووربین لە شێوەی دار جگارە. خەریتەی زۆر ورد، بەجۆرێ بتوانرێ قەمچ بکرێت و لەناو پێنووسێکدا بشاردرێتەوە.. لە ژێر زەمینێکدا لە ((مۆزەخانەی لەندەنی زانیاری)) کۆمەڵێ لە زانیاریەکان خەریکی دروست کردنی ناسنامەی کەسایەتی نادیار بوون، خەریکی دروست کردنی پاسەپۆرت بوون بۆ هەر کرێگرتەیەک و هەر کارێك بەجیا.

لەنێوان شەڕی یەکەم و دووەمدا موخابەراتی ولاّتەکان لە هەوالّی

کۆکردنـەوەی زانیـاری سـەربازیو دیبلۆماسـیو پیـشەسازیو زانـستی بـوون، تـا دەهـاتیش لـەباری رێکخـستنو شـێوازو مەبەسـتەوە بـەرەو پێشەوە دەچووو لەگۆڕاندا بوو.

هاوتـەریب لەگـەڵ خێرایـی پێـشکەوتنی زانـستدا دەرۆیـی لەهـەموو بوارەکاندا، تاکو ئێستاش وایە.... بۆ نمونە _ وێنە گرتن لە ئاسمانەوە بـۆ هـۆی ئاشـکرا کردنـی شـوێنی سـەربازگەکانو کارگـەو عـەمباری جبەخانەی سەربازی. لە شەڕی دووەمی جیهانیدا، تێکدانو وێرانکردنی مادی بووە ئامانجی موخابەرات، لەپاڵ وێرانکردنو تێکدنی مەعنەوی. بـەکارهێنانی فێـڵو تەڵەکـەبازی پـەرەی سـەند، بـۆ هـەر پلانێکـی ڕاسـتەقینە، پلانێکـی دەسـکردو نـا ڕاسـت بـۆ هەڵخەڵەتانـدن دروسـت دەرکا... ((جەنەڕاڵ مونتگۆمری)) لە بیابانی رۆژئاوادا، سەربازگەیەکی بۆ هەڵخەڵەتاندن دروست کرد. تانکی ساختەی دانا، قاوشی سەربازی دروستکرد، تاکو دوژمن بخەڵـەتێنێ بەر لـە هێرشـی بۆ ((عەلەمەین)) لە ساڵی ١٩٤٢زدا، هەروەها هاوپەیمانەکانیش کە ویستیان هێزەکانیـان لـە ((نورمانـدی)) تێپـەڕێ، وایـان نیـشاندا کـەوا هێـرش لـە ((دەڤـەر))ەوە دەسـت پێـدەکات، لـەوێ تـۆپو ئۆتۆمبێلیـان کـۆکردەوە، تـا ئـەڵمان لـە نورماندی چاوپۆشی بکات، بێ تەلیان بۆ هەڵخەڵەتاندن بەکار هێنا

## ♦ ♦ ((ریتشارد سورج))ی سێ ڕوو ♦ ♦

هـەموو ئـەو لێکۆڵینـەوەو دانراوانـەی کـە کارەکـانی تـۆڕی سـیخوڕی سـۆڤێتی لـە یابـان شـیکراونەوە بـە سەرپەرشـتی ((ریتـشارد سـورج)) هەموویان بەسەر ڕێکەوتن لەسەر گرنگی ڕۆڵی ئەو کارانە دەردەخـەن لە سـەرکەوتنی هێزەکـانی سـۆڤێتی بەسـەر سـوپای ئەڵمانـدا لـە شـەڕی ((ستالینگراد)) کە سەرەتای کۆتای نازییەکان بوو. ئەویش بەهۆی ئەو زانیارییانـەی کـە (سـەرج))و تۆڕەکـەی لـە یابـان کۆیـان کردبـووەوە.

سۆڤیەت بەهۆیەوە توانی دوو ملیۆن سەربازی لە سنووری ڕۆژهەلأت و باشووری سیبریاوە بۆ بەرەکانی شەڕ بگوازێتەوە نەهێلن پایتەختی سۆڤیەت بکەوێتە دەستی ئەلمانیاوەو دواجاریش شکست پێ هێنانیان لە شەڕکانی دیکەدا.

مێژوو نووسە ئەلمانیەکان ((سورج))یان بەتواناترین سیخوڕو دژوارترینیان دایان ناوە لەهەموو سەردەمەکاندا. یەکێکی کە ناسناوی ((پیاوە سێ دەمو چاوەکە))ی پێدراوە. ناسنامەی ئەلمانی هەبوو، سالی ۱۸۹۵ لە باوك و دایکێکی ئەلمان لەدایك بووە.مندالی و گەنجێی لە ولأتەکەی خۆی بەسەر بردووە، شکست هێنانی ولأتەکەی لە شەڕێ یەکەمی جیهانی زۆر کاری کردۆتە سەری و پێی ناخۆش بووە. وەکو کەسانی کە بەدەست بارودۆخی ئابووری خراپی ولأتەکەی ئازاری چەشتووە، دەست بەتالی دەست نەڕۆیی دیوەو نەیتوانیوە پێویستیەکانی ژیان دابین بکات، ئەمە وای کردووە، بڕوای بە زۆر شت لەق بێ. ڕێگا خۆشکەریشی بووە بۆ گۆڕینی بیروباوەڕی بۆ کۆمەلگای ئەلمانی و پالی پێوەناوە، بۆ خوێندنەوەی ئەوانەی لەبارەی کۆمۆنیستیەوە نووسراون... بەتایبەتی کتێبەکەی ((کارل مارکس))و ((لینین))، بڕوای بە ڕژێمی کۆمۆنیست هێناو کەوا تا ڕێگایە دەتوانێ کێشەکانی کۆمەلگەی ئەلمانی چارەسەر بکات.

دواییەکەی چووتە ناو حیزبە کۆمۆنیستی ئەلمانی لە ((هامبۆرگ)) لەو ڕۆژەی کە بڕوانامەی دکتۆرای لە زانستە سیاسیەکان لە سالی ۱۹۲۰ز وەرگرت .

((سورج)) لە خزمەتی بیروباوەڕەکانی حیزب دا کاری کردووە، قوتابیان و کرێکارانی کانەکان و کەسانی دیکەی فێری بیروباوەڕەکەی خۆی کردووە. لە خۆپێشاندانەکانی ((کییل)) بەشدار بووە، هەولی داوە

ئەستولی ئەڵمانی یاخی ببیٚ. ئەم جولانەوانەی سەرنجی بەرپرسانی موخابەراتی سۆڤیەتی ڕاکێشا، کە زیرەکەو، خاوەن ویستێکی بەهێزەو ئامادەیە خۆی بەخت بکات لەپێناوی وەدیهێنانی ئامانجەکانی حیزبی شیوعی. داوایان لیٚ کرد لەگەڵ موخابەراتدا کاربکات، زوو ئامادەیی خۆی نیشاندا، هەموو قۆناغەکانی مەشق کردنی بە سەرکەوتویی بڕی.

لە ماوەی پێنج ساڵدا توانی هەموو ئامرازە هونەرییە پێویستیەکانی سیخوڕی بەکاربهێنی و تیایاندا سەرکەوێت... سیٚ زمانی دەزانی: ڕوسی، ئینگلیزی، فرەنسی سەرەڕای ئەڵمانی. هەروەها خۆی فێری زمانی یابانی و چینی کردو کتێبە سیاسی و ئابوورییەکانی بەزۆری دەخوێندەوە. کە بەڕادەیەك بووە شارەزای کاروباری نێودەوڵەتی. کە لە یابان کاری دەکرد، هەوڵی دا هەموو شتێك پەیوەندی بە سیاسەتی دەرەوەی یابان هەیە بیخوێنێتەوەو.

تۆڕەکە لە پێنج سیخوڕ پێك هاتبوو: سورج، ئۆزاکی، فوکولویتشی، کلاوش، میاگی.. ئەم تۆڕە ساڵی ١٩٣٤ز کەوتە نواندنی چالاکیەکانی....

## ♦ ♦ سورج ♦ ♦

بۆ خۆ شاردنەوە، کاری ڕۆژنامەگەری دەکرد، ویارمەتی جەم و جۆڵەکانیشی دەدا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری، لەلایەکی کەشەوە پەیوەندی ڕواڵەتانەی لەگەڵ ڕژێمی نازیدا نەبڕی، بەتایبەتی لەگەڵ باڵیۆزخانەی ئەڵمانی لە ((تۆکیو))، چووە ڕیزی حزبە نازییەوە لە ئەڵمانیاو چووە بەشی ڕۆژنامەگەری ئەو حیزبەوە. خۆی لەناوەندی ڕەسمی نازی نزیك کردەوە، تا لەو ئاهەنگانە بانهگێشت دەکرا کە ((هیتلەر)) تێدا ئامادە دەبوو. ئەندامی باڵیۆزخانەی ئەڵمانی لە تۆکیۆو بەرپرسانی یابانیەکان بەچاوی ڕێزەوە تەماشایان دەکردو بە بڕوا پێکراوی نازییەکان تەماشایان دەکرد. بووە هاوڕێی باڵیۆزی ئەڵمانی لە

تۆکیۆ. ڕۆژانە لەسەر یەك خوان نانیان دەخواردو برادەرێکی نزیکی ((مولحەقی)) سەربازی ئەڵمانیش بوو. باڵیۆز بە بەڕێوەبەری ئیستیعلاماتی باڵیۆزخانەکەی دامەوراند، کە هەموو نهێنیەکان دەکەوتە ژێر دەستی.

## ♦ ♦ ئۆزاکی ♦ ♦

هاوڵاتیەکی یابانیو لە خێزانێکی ناسراوە، ڕۆژنامەنووس بوو، پێنج کتێبی داناوە لەبارەی پەیوەندییەکانی چینو یابانەوە، ئەو زانیاریانەی دەستی دەکەوت لە ڕێگای ئەو پلەو پایانەی کاری تیا دەکردن پەیای دەکردن وەکو: ڕاوێژکاری بەڕێوەبردنی سەرەك وەزیران، ڕاوێژکاری لیژنەی وزاری بۆ پەیوەندییەکانی چینو یابان، سەرۆکی بەڕێوەبردنی هەواڵگری هێڵی مەنشوریان باشوور، ئەندامیش بووە لە چەند لیژنەیەکدا.

## ♦ ♦ فولولویتش ♦ ♦

ئەفسەرێکی پێشوو بووە لە سوپای یۆگۆسلافیا وەکو پەیامنێری ڕۆژنامەیەکی فەرەنسی و ڕۆژنامەیەکی یۆگۆسلافی کاری کردووە. کاری وێنەگرتنی فۆتۆگرافی دەکردو پەیامنێری ئاژانسی دەنگوباسی فەرەنسی بوو، ئەم کارەی ماوەی گەڕانو جولانەوەو کۆکردنەوەی زانیاری دەدا.

## ♦ ♦ کلاوش ♦ ♦

سەلناندیەتی کە بەتواناترین کرێکاری بێ تەلی موخابەراتی سۆڤیت بووە. ((سورج)) زۆر بڕوای پێدەکرد، هەرچەند ژنەکەی ڕوسە سپییەکان بووو نەیاری ڕژێمی کۆمۆنیست بوو. بەکارکردنی ئازاد خۆی دەشاردەوە. دەزگای موخابەرات بەڕێوەبردنی کۆمپانیای چاپی پێ سپارد، بەهۆیەوە گەلێ زانیاری لەبارەی چاپەمەنی حکومەتی یابانیو

خەریتەی دەریایی و نەخشە نهێنییەکانی دەست کەوت.

## ♦ ♦ میاجی ♦ ♦

هونەرمەندێکی یابانی بوو، لە ولاّتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، سەری سوڕما لەو جیاوازییەی لە نێوان چینەکاندا هەیە، بۆیە مەیلی چەپڕەوی پەیداکرد بوو بە کۆمۆنیست، بووە ئەندامی حیزبی شیوعی ئەمریکی، موخابەراتی سۆڤیەتی خستیە ژێر فرمانی خۆیەوە بۆ ئامانجی سۆڤیەت لە یاباندا...

((سورج)) گەلێ زانیاری گرنگی لەبارەی میژووی دەست بەسەرداگرتنی دەسەلاّتەوە لەلایەن سوپای یابانەوە بە مۆسکۆ گەیاند بەر لەوەی سوپا دەست بەسەر دەسەلاّتدا بگرێ لە سالّی ١٩٣٦زدا. هەروەها کاتی هێرش کردنە سەر چین لەلایەن یابانەوە گەیاندە مۆسکۆ. هەروەها بەدوورو درێژی ئەو وتووێژانەی نێوان ئەلّمانیا و یابان مۆسکۆی لێ ئاگادار کردەوە. هەروەها ئەوەشی ئاشکرا کرد کە ئەلّمان ئارەزووی گرێ بەستێ دەکات لەگەلّ یاباندا دژی یەکێتی سۆڤیت، دەقی ڕێکەوتن نامەکەی دوای دوو ڕۆژ گەیاندە مۆسکۆ، هەروەها ڕاپۆرتی لەبارەی تیپەکانی یابانەوە نووسی کە سەر لە نوێ ڕێکخرابوونەوە لە چین مەنشوریا و یابان مەشقیان دەکرد. هەروەها بەرنامەی هێزی دەریایی یابانی ئاشکرا کرد، لەگەلّ بەکارهێنانی تانکی نوێ و بەنەخشەسازی نوێوە و ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر تەشکیلاتی فڕۆکەکانیاندا هاتبوو، لەگەلّ کەتالۆگی ئامێری پیشەسازی و چەکی نوێوە. لەگەلّ ناردنی ڕاپۆرتێك کە کاتی هێرشی ئەلّمانیای ئاشکرا کردبوو بۆسەر یەکێتی سۆڤیت لە سالّی ١٩٤١زدا. هەموو ئەمانەی بە وردی بە موخابەراتی سۆڤێت گەیاندبوو.

## ♦ ♦ سیخوڕێتی به‌رگری ♦ ♦

له ساڵی ١٩٤٠ بۆ ١٩٤٥ز ئه‌ڵمانیا ئه‌وروپا له‌ژێر ده‌سه‌ڵاتی ئه‌ڵمانیادا بوو، به‌ڵام تاخمی به‌رگری له‌ناو وڵاته داگیركراوه‌كاندا به‌رده‌وام بوون له شه‌ڕو به‌رگری. كۆمه‌ڵه‌كان شه‌پۆلی بێ ته‌لی كورتیان به‌كار ده‌هێنا بۆ ناردن و گه‌یاندنی نامه‌كان. ئه‌و ئامێره‌ی پێیان ده‌گوت ((سندوقه‌كانی مۆسیقا)). هه‌ر له‌و ناوه‌وه تۆڕێكی كۆمۆنیست له‌ناو ئه‌ڵمانیادا چالاكی ده‌نواند، به ((ئۆركێسترای سوور)) ناونرا، به‌رده‌وام بوو له ((ژه‌نین)) زانیارییه‌كان بۆ ماوه‌ی سێ ساڵ بۆ مۆسكۆ ده‌نارد. ئه‌و زانیارییانه‌یان له‌ناو وه‌زاره‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌ڵمانیادا ده‌ست ده‌كه‌وت. به‌وه‌شه‌وه نه‌وه‌ستان، زانیاریان له وه‌زاره‌تی فڕین و وه‌زاره‌تی كارو، وه‌زاره‌تی پڕوپاگانه ده‌ست ده‌كه‌وت. سه‌ركرده نازییه‌كان به‌مه تووڕه‌و ناڕه‌حه‌ت بوون، كه ساڵی ١٩٤٢ ئه‌و شانانه‌یان ئاشكرا كردو گرتنیان ((١١)) سه‌ركرده‌یان به شێوه‌یه‌كی دڕندانه لێ هه‌ڵواسین و لاشه‌كانیان به‌دارا كردن.

ناردنی زانیاری به‌بێ ته‌ل كێشه‌ی نایه‌وه، توانیان جێگه‌ی بێ ته‌له‌كان ده‌ستنیشان بكه‌ن له پرۆسه‌یه‌كدا به‌ناوی ((سێ سووچه‌یی)) كه پشتی به حیساباتی سێ سووچه ((مثلث)) ده‌به‌ست، كه بێ ته‌لێكیان ئاشكرا ده‌كرد، به‌و بێ ته‌له زانیاری هه‌ڵه‌و ناڕاستیان پێدا ده‌نارد، ئه‌فسه‌رێكی موخابه‌راتی ئه‌ڵمانی ((كولونێل نجیسكی)) گه‌مه‌یه‌كی ڕادیۆی ئه‌نجامدا كه به‌و كاره هونه‌ریه توانیان ده‌ست به‌سه‌ر شانه‌یه‌كی ((نێره‌ر _ ارسال)) بگرن، كه به‌رگریكارانی هۆله‌ندی به‌كاریان دهێنا بۆ په‌یوه‌ندیكردن له‌گه‌ڵ موخابه‌راتی به‌ریتانیاندا، توانیان زانیاری و هه‌واڵی درۆ بنێرن و سه‌ركه‌وتنی گه‌وره وه‌ده‌ست بهێنن، سه‌ره‌ڕای ئه‌و سه‌ركه‌وتنانه‌ی به‌رگری كه له هۆله‌ندادا وه‌ده‌ستیان ده‌هێنا، به

پەرۆشەوە داوای ناردنی کرێگرتەی زۆرتر بنێرن، بەریتانیا داواکەیانی جیٚ بەجیٚ کرد. یەك لەدوای یەك سیخوڕی بە فڕۆکە دادەگرت، پیاوانی (جیسکی)) چاوەڕوانیان بوون لەگەڵ دابەزینیاندا دەیانگرتن و بۆ سەربازگەکانیان دەبرن. زانیارییەکان هەمووی لە لایەن سیخوڕە شارەزاو مەشق پێکراوەکانەوە دەست نەدەکەوت، بەڵکو کەسانێکی ناشارەزاو بیٚ ڕاهاتنیش سەرچاوەی زانیاری بوون بۆ کۆمەڵی بەرگری. هەزاران کەسی ئاسایی، پیاوو ژن سەردەمی داگیرکردنی ئەڵمانیایان ڕۆژیٚ لەماڵ و ڕۆژیٚ لە دەرەوە بەسەردەبرد، لەناو ترس و بیٚ ئارامیدا دەژیان، ترسی کوشتن و هەڵواسین.. لەوانە بۆیە چیەکی فرەنسی بەناوی ((رینیە دوتشی))وە، کارێکی لە ((ڕێکخراوی تودت ئەڵمانی)) دەسکەوت، دواجا بووە بەرپرسی دروستکردنی سەنگەرلێدان کە بە (دیواری ئەتڵەسی) ناونرا. توانی خەریتەی ئەو دیوارە بە ڕێگایەکی پڕ مەترسیدار لەناو پاکەتێکی پسکێت و بە بەلەمێکی ڕاو بە لەندەن بگەیەنێت. دواجا دەرکەوت ئەو خەریتەیە گرنگییەکی زۆری هەبوو بۆ هاوپەیمانان بەتایبەتی لەوکاتەوی ویستیان هێزەکانیان بگەیێنن کەنارەکانی باکوری فرەنسا

## ♦ ♦ لیبادومب و ئۆرکسترای سوور ♦ ♦

زۆر جار ((لیبادومب)) دەیگوت ((من کۆمونیستم، چونکی جووم)). ئەمە ئەو لێکدانەوە تەقلیدییەیە کە جووەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات باسیان دەکرد. وایان دەبینی، بڕواهێنان بە مارکسیەت _ یان هەروای پێشان بدەن _ مایەی ڕزگاربوونیانە لە چەوساندنەوە لەلایەن دەوڵەتەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتەوە، بەر لەشەڕی دووەمی جیهانی. ترسی ((مەحرەقە)) شۆڕشێکی لە ناخی (دومب))دا هەڵایسابوو. دەزگاکانی موخابەراتی شەشە دەوڵەت کون بەکون لە ئەورووپا دەگەڕان

بەشوێن سەخترین سیخوڕدا.

لە ساڵی ١٩٢٥زدا، ((دومب)) نۆزدە ساڵی بوو، بڕوای بە توندو تیژی هەبوو بۆ بەدیهێنانی ئامانجی لاوەکیدا. بۆیە لەکارگەی پێسە لە پۆڵەندا دەریانکرد. لەم ساڵەدا ((دومب)) چووە ناو حیزبی شیوعیەوە، شۆڕشگێڕانە کارەکانی ئەنجام دەداو بەهرەی هەواڵگرێتی تێدا دەرکەوت، لەزۆر کاردا ئەوەی دەسەلماند کە توانای کاری گەورەی هەیە، لەهەمان کاتدا، کاربەدەستانی پۆڵەندی سەرنجیان تێ بڕی. ساڵی ١٩٢٨، لەبەر شۆڕشگێڕایەتی زیندانی کراو فەرمانیشی بۆ دەرچوو لە وڵات نەمێنێ، لە بڕی حکومدانەکەی لە وڵات دەریان کرد. بۆ مارسیلیا ڕۆیشت، دواجا بۆ فەلەستین کۆچی کرد. هەرکە گەیشتە فەلەستین، دەستی کردە شانەدانان و ڕێکخستنی شیوعی. لێرەش سەرنجی دەسەلاتدارانی ئینتیدابی بەریتانی ڕاکێشا. بۆ فەرەنسا دووریان خستەوە، لە فەرەنسا بووە کەسایەتێکی ناسراو لەبەشی کرێکرە پەنابەرە یەهودییەکان، لە حیزبی شیوعی فەرەنسی. جارێکی کە لێهاتوویی و شارەزایی سەرکردایەتی ئەو سەرنجی دەسەلاتدارانی ڕاکێشا، بوە مایەی مەترسی بۆ دەسەلاتی فەرەنسی، بەلام، حیزب بەر لەوەی حکومەتی فەرەنسا زیانی پێ بگەیێنێ کەوتە خۆیا، ((دومب))یان بۆ مۆسکۆ نارد، تا لەوێ ڕاییبهێنن لە زانکۆی کەمە نەتەوییە نیشتیمانیەکاندا، کەسەر بە ڕێکخراوی ((ستالین)) بوو، بۆ حیزبە شیوعیە نێودەوڵەتیەکان. کە دەیڕوانیە چالاکی حیزب لە هەموو لایەکی جیهاندا.

ئەمە ئەوە دەگەیێنێ کەوا ((دومب)) ناوێکی دیار بووە لە حیزبدا. خۆی ئامادەکردو ڕادەهێنا تا لە ئایندەدا ڕۆڵێکی سەرکردە ببینێ. بەلام نەگەیشتە پایەی سەرکردایەتی، چونکی موخابەراتی ڕوسی ئاگاداری

تواناكانی بوو، ئه‌مه كاری له ده‌رونی كرد..یه‌كێ له‌و خه‌سڵه‌تانه‌ی ((دومب)) كه سه‌ركردایه‌تی حیزب پێی سه‌رسام بوو، ئازایه‌تی و پڕكێشی ((دومب)) بوو، و توانای رابه‌ریكردنی هه‌بوو، زیره‌كیه‌كی له‌راده‌به‌ده‌ری هه‌بوو، هه‌ستی به به‌رپرسیارێتی ده‌كردو كاره‌كانی به‌وردی جێ به‌جێ ده‌كرد.......

به‌هۆی هه‌مان ئه‌و خه‌سڵه‌تانه‌وه ((جان بیرزن)) گرنگی پێدا، كه سه‌رۆكی موخابه‌راتی ڕوسی بوو، كه تواناییه‌كی سه‌یری هه‌بوو له ده‌ستنیشانكردنی پیاوی ئازاو به‌كاربردنی به‌تواناترین سیخوڕ.)) بیرزن))ی سه‌رۆكی موخابه‌رات ئه‌و سیفه‌ته سه‌ره‌كیانه‌ی له ((دومب)) ده‌بینی كه ده‌بوایه له سیخوڕێكدا هه‌بن... خۆنه‌شڵه‌ژان و له‌سه‌رخۆ بیركردنه‌وه، خۆڕاگر، تواناوبڕوا.....

((دومب)) بۆ ئه‌م كاره ده‌گونجاو ده‌شیا: بالآیه‌كی كورت، به‌هێزو چوار شانه، خاوه‌ن كه‌سایه‌تیه‌كی چالاك‌و توندو تیژ. ئه‌وه‌ی نیشان ده‌دا كه ئاماده‌یه هه‌موو كارێكی گران بكات تا ئه‌وه‌ی ده‌یه‌وێ ده‌ستی بكه‌وێ. ڕواڵه‌تی ئازایه‌تی نیشان ده‌دا، ئه‌و ئامۆژگاری‌و فه‌رمانانه‌شی به‌جێ ده‌هێنا گه‌ر بیزانیبایش هه‌ڵه‌یه.

ساڵآنی كاری حیزبایه‌تی قاڵی كردبوو، ئاماده‌یی خۆی بۆ كاری سیخوڕێ نیشان دا، دوای كاركردنی بۆ ماوه‌یه‌كی كه‌م له‌گه‌ڵ تۆڕێكی بچووكدا له فه‌ره‌نسا له‌سه‌ره‌تای سییه‌كاندا و به‌باشی خۆی ڕاهێنا، ئاماده‌بوو بۆ گێڕانی ڕۆڵێكی ڕاسته‌قینه كه ((بیرزن)) نه‌خشه‌ی بۆ كێشابوو. بیرزن، له‌و بڕوایه دابوو كه‌وا موخابه‌راتی ڕوسی _ به‌په‌له _ پێویسته خۆی بۆشه‌ڕ ئاماده بكات، كه دڵنیا بوو له هه‌ڵگیرسانی، ئه‌ڵمانیا ته‌وه‌ره‌ی سه‌ره‌كی گرنگی پێدانی موخابه‌راتی ڕوسی بوو، به‌ڵآم حیزبی شیوعی ئه‌ڵمانی‌و تۆڕی سیخوڕی سۆڤێت له ئه‌ڵمانیا له ژێر

فشاری ((هیتلەر))دا بوون، وای پێویست دەکرد سەرلەنوێ دەزگایەکی موخابەرات لەوێدا دامەزرێنێ. بۆ چاودێرکردنی دوژمنانی یەکێتی سۆڤێت، ((بیرزن)) لە پلانەکەیدا ئەوەی خستە بەر چاوی خۆی دەبێ دەوڵەتی نازی تۆڕە نوێکە دانەمەزرێنێ، لەبری ئەو زنجیرەیە دەزگای موخابەراتی بچووك بچووکی دانا لەدەرەوەی ئەڵمانیا بە مەرجێ زۆربەی ئەو دەزگایە لە بەلجیکاو فەرەنسادا بێ و ((دومب)) لەناویاندا بێ...

((دومب)) لە ساڵی ١٩٣٩ز چووە برۆکسل، بە گەیشتنی دەست بەکاربوو. دەبوایە چەند بنکەیەکی بازرگانی لەسەرتاپای ئەوروپادا دامەزرێنێ و لەوێوە دزە بکاتە ناو ئەڵمانیاوە، خۆی کردە کەسایەتیەکی پیاوێکی کاری کەنەدی بەناوی ((جۆن گیلبرت))کۆمپانیایەکی بازرگانی دامەزراند ناوی نا ((سیمیکسکۆ))، ساڵێکی پێ نەچوو، کۆمپانیایەکی دیکەی دامەزراند لە پاریس بەناوی ((سیمیکس))ەوە، دەستی کردە پەیداکردنی کرێگرتەو سیخوڕ، هەرکە شەڕی دووەمی جیهانی هەڵگیرسا، تۆڕێکی پتەوی ڕێکخستنی دامەزراند، لە چەندین شانەی سیخوڕی پێك هاتبوو، لەگەڵ شوعیە ناوخۆییەکاندا، شانەکان لە دەریای باکورەوە تا سویسرا لەکارا بوون و چالاکیان دەنواند، شانەیەکی بچووکیش لەناو ئەڵمانیای نازیدا دامەزراند کە لە کۆمەڵێ لە شیوعیەکانی ئەڵمانیا پێکهاتبوو، ئەوەیان دەشاردەوە کە هەواداری کام بەرەی سیاسین و بوونە کارمەندی حکومەت. ئەوانەی لەگەڵ ((دومب))دا، کاریان دەکرد ژمارەیان ٢٠٠ کرێگرتە، هەمووشیان لەو شوێنانە دا بوون کە بنکەی کۆکردنەوەو دابەشکردنی زانیارییەکان بوو. ((دومب)) لەو بڕوایە دابوو کەوا زانیاری بەکەڵك لە بچووکترین دایەرەی حکومیدا دەست دەکەوێت. بەمەرجێ بزانی چۆنی پەیدا دەکات. دومب ڕاستی ئەم بۆچوونەی لە فەرەنسا پەیداکرد. کە زۆربەی کرێگرتەکانی

دوای داگیرکردنی ئەڵمانیا بۆیان دەرکەوت کە چاکترین ڕێگا بۆ وەدەست هێنانی زانیاری لەبارەی جێگاو سیستەمی ئەڵمان و فەرەنسا بوو، ئەویش بەهۆی بریکارێکی بچووکی نەناسراوەوە ناوی ((مەکتەبی فەرەنسی بۆ نیشتەجێکردنی سەربازەکان)) بوو... ئەمە بریکارێك بوو لە ((فیشی)) لەبواری ڕێکخستنی نیشتەجێ کردنی هێزەکانی داگیرکەری ئەڵمانیا کاری دەکرد، بە پێی ئەو سیستەمەی سوپای قرەنسی کاری پێدەکرد... لەمیانەی ئەو کارەوە، بریکارەکە جولانەوەی هەموو سوپای ئەڵمانی پێ دەوانی. بەهەمان شێوەی تۆڕێك لە کارمەندانی هێڵی ئاسنی فەرەنسی کە لەگەڵ ئەڵماندا کاریان دەکرد لە بەڕێخستنی شەمەندەفەرە سەربازییەکانی ئەڵما بە سیستەمی فەرەنسی، بی پێی ئەو هات و چۆو جولانەوەی سوپای ئەڵمانیان لە فەرەنسا و دەرەوەی فەرەنسادا دەزانی. هەروەها ((دومب)) دامەزراندنی کۆمپانیایەکی گرنگی بۆ داپۆشینی چالاکیە سیخوڕییەکانی لە ئەستۆ گرت. لەگەڵ ((ڕێکخراوی تودتی ئەلمانیدا)) کاری دەکرد. بۆ جێ بەجێ کردنی دروستکردنی بیناسازی سەربازی چ ئەو بینایانەی بۆ مەکتەب و دانیشتن بوایە، یا بنکەکانی سەربازی بوایەن، و هەموو شتێکیش پەیوەندی بە شەڕی ئەڵمانیەوە هەبوو. نوێنەرانی کۆمپانیای ((سیمێکس)) پاساپۆرتیان لە دەسەڵاتدارانی سەربازی ئەلمانی وەردەگرت. ڕێگایان پێ دەدرا بچنە ناوچە سەربازییە قەدەغەکراوەکانەوە. ئەمەش خەونێك بوو بۆ سیخوڕەکان...

لەماوەی هەژدە مانگی یەکەمی شەڕدا، ئەڵمانیەکان هیچ زانیارییەکیان لەبارەی تۆڕی ((ومب)) نەبوو کە لە ئەوروپادا بلاًوببووەوە، ((دومب)) زۆر بە وریایی کارەکانی ڕایی دەکرد. دەیزانی ئەو بێ تەلانەی بەکاری دەهێنان بۆ ناردنی زانیارییەکان بۆ مۆسکۆ خاڵی لاوازی ئەوان. چونکی

تیپی دۆزینەوەی شەپۆلی دەزگا بێ تەلەکانی ئەڵمانیا شارەزاییەکی زۆریان هەیە. بۆیە ((دومب)) بەردەوام جێگای بێ تەلەکانی زوو زوو دەگۆڕی و هەر جارەی لە شوێنێکەوە بەکاری دەهێنان.

لەساڵی ١٩٤٠زدا، زانیارییەکانی ((دومب)) سەبارەت بە جموجۆڵوکانی هێزەکانی ئەڵماینا لە فرەنسا و بەلجیکا بەری گرت. کاتێ پیاوەکانی جم و جووڵی هێزەکانی کوتوپڕی ئەلمانیایان بەرەو ڕۆژهەڵات ئاشکرا کرد. لەبەر ئەوەی پۆڵەندا لەناو پلانی ئەڵمانیادا نەبوو هێرشی بکاتە سەر، ((دومب)) بۆی دەرکەوت، کەوا ((هیتلەر)) مەبەستی بەریتانیا نییەو نیازی هێرش کردنە سەر یەکێتی سۆڤێتە.

((دومب)) بەهاوکاری موخابەراتی لایەنەکانی کە، توانی لە ئەیلولی ١٩٤٠ز کۆمەڵێ زانیاری گرنگ لە بێ تەلەکانەوە بنێرێ کە هەرماوەیەك لە شوێنێکدا بوون، بەتایبەتی لەبارەی پرۆسەی ((بارباروسا))وە، کە پلانی هیتلەر بوو بۆ داگیرکردنی یەکێتی سۆڤێت لەبەهاری ساڵی ١٩٤١زدا، دومب پلان و سیستەمی شەڕ'کەی بەتەواوی مۆسکۆی لێ ئاگادار کردەوە.

دومب، کۆششێکی زۆری کرد بۆ ناردنی ئەو هەموو زانیارییانە بەنامەی کورت کورت، بەڵام هەستی کرد کارەکە لەبەر گرنگێتی دەهێنێ ئەو هەوڵەی بۆ بدات. بەڵام ترسێکی بێ شوماری لێ کەوت، کاتێ ستالین بڕوای بەو ڕاپۆرتانە نەکرد، ئەوەندە ستالین دڵنیابوو کە ئەڵمان هێرش نابات، لەسەر موخابەراتی سۆڤێت نووسیبووی دەبێ سزای ئەوکەسە بدرێ ڕاپۆرتەکان دەنێرێ... بەڵام خۆشبەختانە، سەرکردایەتی موخابەراتی سۆڤێتی ڕاسپاردەکەی ((ستالین))یان پیادە نەکرد.

((دومب)) لەگەیاندنی زانیارییەکان لەبارەی کۆکردنەوەو خۆ تەیارکردنی هێزە سەربازییەکانی ئەڵمانیا بۆ هێرش بردن و نیازی

داگیرکردنی یەکێتی سۆڤێت بەردەوام بوو، بەردەوامیش ستالین ئەو زانیاریيانەی بەهەند نەدەزانی و پشت گوێی دەخست. لەپڕ، لەبەرەبەیانی ٢٢ حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١ز، هەموو شتێك گۆڕا كە ئەڵمانیا هێرشی کردە سەر یەکێی سۆڤێت. لێرەوە ڕاستی و دروستی ڕاپۆرتەکەی ((دومب)) دەرکەوت، موخابەرات پەیتا پەیتا داوی لێ کرد، هەرچی زانیاریيەکی دەست دەکەوێت لەبارەی هێزو جبەخانەی ئەڵمانیاوە بینێرێ. ئەویش دەستی پێ کرد، بێ تەلەکانی ((دومب)) بێ ڕاوەستان کەوتنە ناردنی زانیاری، وشیاری ئەوەشی دا، کە ئەڵمانیا نیازی ئەوەی هەیە هێرش بکاتە سەر مۆسکۆ، لە مانگی تشریندا توانی پلانی ئەڵمانیا بۆ هێرش کردنە سەر قوقاز دەست بکەوێ، کە لە (((ستالینگراد)) کۆتایی بە هێرشەکەیان هێنرا.

دومب، ترسی گەورەی لە دۆزینەوەی بێ تەلەکانی بوو، چونکی تیپی گەڕان بەدوای بێ تەلدا ئەوەندەی نەمابوو ئاشکرای بکەن، لەم کاتە ناسکەشدا یەکێتی سۆڤێت لەهەموو کاتێ زیاتر پێویستی بە زانیارییەکانی ((دومب)) بوو، هیچی کەی لە پێشدا نەبوو، لەوەی زیاتر بێ تەلەکانی بەردەوام بێ لە ناردنی زانیارییەکان، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند، ڕێگا بە تیپی پشکنین بدات بۆ دۆزینەوەی بێ تەلەکانی.

ئەڵمانەکان تا دەهات لێی نزیك دەبوونەوە، ئەگەری دۆزینەوەیان زیادی دەکرد. وێستگەکانی ئەڵمان کە بۆ ئەو مەبەستە دانرابوون، پەیتا پەیتا نانەی بێ تەلی کۆدکراویان دەدۆزییەوە کە بەرەو ڕۆژهەڵات دەنێرران، لەچەند دەڤگایەکەوە هەر لەساڵی ١٩٤١زوە. مەزەنەی موخابەراتی سۆڤێتیان دەکرد کاری ئەوان بێ، هەرچەندە نەیان توانی کۆدەکە بکەنەوە، بەلام بەردەوام بوون لەگەڕان بەدوای بێ تەلەکانداو ئەوانەی نامەکان دەنێرن. بۆیە پرۆسەیەکی هاوبەشیان دانا دژ بەوە لە نێوان

جستابوو موخابەراتی ئەڵمانیدا. لە مایسی ١٩٤١، ئەڵمانەکان بۆیان دەرکەوت کە ناردنی نامەکان هەموو ڕۆژێ چەند سەعاتێك دەخایێنێ. بۆیە کەوتە دۆزینەوەی سەرچاوەی ئەو ئیشارەتانە هەروەکو لەوەبەریا، ئدیوجی مۆسیقایان بەکار دەهێنا بۆ ناولێنانی پەخشی نهێنی نوێ. ناوی پرۆسەی تۆڕەکەی ((د ومب)) یان لێ نا بە ((ئورکسترای سوور)) ئەو ناوەیە لەناو باسی سیخوڕیدا ناسراوە.... کە ئەڵمانەکان لە وێستگەی ((دومب)) نزیك دەبوونەوە، ئەوکاتە خۆی تۆڕەکەی هەڵوەشاندەوەو هەلات، بەچەند ناوێکەوە خۆی شاردەوە، یەکێ لەو ناوانە: ((جین گیلبرت)) یا ((مسیو گیلبرت)) بوو، کە دەڵێن گوایە لە پریکا کۆچی دوایی کرد. دومب، کێلی گۆڕیکی بەو ناوەوە بۆ خۆی کردبوو کەلەسەر گۆڕێکی بەتاڵدا لە گۆڕستانێکی پاریس دانرابوو.

((دومب)) مایسی ساڵی ١٩٤٢ دانا بۆ هەڵوەشاندنەوەی تەواوی تۆڕەکەی. بەلام لە ١٣ کانوون، ئەڵمانەکان یەکێ لە وێستگەکانیان لە ماڵێکدا لە برۆکسل دۆزییەوە، هێرشیان کردە سەر ماڵەکەو ژمارەیەکی زۆر ئەوانەی لەوێ بوون گیران، لەوکاتەدا کە خەریکی ناردنی زانیارییەکان بوون، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە، لەوکاتەدا ((دومب)) لەوێ بوو، زوو فریای خۆی کەوت و توانی خۆی قورتار بکات، خۆی وا پیشاندا کە کەرۆێشك فرۆشێکی گەڕۆکەو خۆی قورتار کرد.

ئەوانەی گیران، لە ژێر ئازاردا ڕاستی کەروێشك فرۆشەکەیان درکاند، دەستبەجێ جستابوو دەستیان بە گەڕان کرد. لەهەمان کاتدا تۆڕی ئورکسترای سووریش لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٤٢ لەهەموو ئەورووپا بەتەواوی هەڵوەشایەوە.

((دومب)) توانی تا تشرینی ١٩٤٢ز خۆی بشارێتەوە. کاتێ ئەڵمان، یەکێ لەناوە نهێنییەکانی زانی، دوای کەوتن و دەچووە لای دکتۆری

ددان، کە لای دکتۆرەکە دادەنیشێ بۆ چارەسەرکردنی دانەکانی هاتن گرتیان، دومب لەوکاتەدا پێی وتن ((پیرۆزبایتان لێ دەکەم، کارێکی چاکتان کرد).

ئەوەی دواتر ڕوویدا بوە مایەی مشتومرو قسە لێ کردن، ئەڵمانیەکان وتیان: موخابەراتی ئەڵمانی تەماحی ئەوەی هەبوو پلانێکی زیرەکانە بەکار بێنێ. ئەوان وایان دانابوو، کەوا مۆسکۆ دەزانێ ئۆرکسترای سوور بەرەو نەمان دەڕوا، بەڵام نازانێ کام لق و بەشی نەماوە. ئەوەش نازانێ کە ((دومب)) دیل کراوە، پلانی موخابەراتی ئەڵمانی دەیویست ((دومب)) بۆ قازانجی خۆی بەکار بهێنێ، زانیاری هەڵە بۆ مۆسکۆ بنێرێ. ئەڵمانیەکان دەڵێن: دومب بەمە ڕازی بوو، بەڵکو هاوڕێکانیشی ئاشکرا کرد ئەوانەی لە ئۆرکسترای سوور کاریان دەکرد، لەگەڵ ئەندامانی بەرگری فرەنسیدا، کە لە تۆڕەکەیدا کاریان دەکرد. ((دومب)) دواجار وتی: ڕازی بووە لەگەڵ ئەڵمانەکاندا بەشداری بکات لە گەمەی لاسلکی بچووکدا، بە هیواش بووە کە لە نزیك هەلدا مۆسکۆ لەو گەمەیە ئاگادار بکاتەوە، ئەوەشی ڕەتکردەوە کە ناوی هاوڕێکانی دابێتە موخابەراتی ئەڵمانی بەتایبەتی ئەوانەی لە پرۆسەی ((ئۆرکسترای سووردا)) کاریان کردبوو. ئەڵمانیەکان دەستیان کردە ناردنی زانیاری درۆ بەناوی (دومب)ەوە دەیاننارد، مۆسکۆش وا وەڵامی دەدایەوە کە گەمەی بەسەردا تێپەڕیوە، بەڵام لە ڕاستیدا دەیانزانی، بەڵام بڕوایان بە زانیارییەکان نەدەکرد. لە ڕاستیدا موخابەراتی سۆڤیتی هەر لە یەکەم ساتەوە هەستی بە نەمانی وێستگەکان کردبوو، لە ڕێگای ئامارەی نهێنیەوە. ئەوەشیان بۆ دەرکەوتبوو کەوا ((دومب)) لەژێر فەرمانەدەیی موخابەراتی ئەڵمانیدا کار دەکات. بۆیە ڕوسەکان بەردەوام بوون لە گەمەکە تا کۆتایی و داوای زانیاری زیاتریان دەکرد بۆ ئەوەی وا نیشان

بدەن کە نازانن چی قەوماوە. لە مایسی ساڵی ١٩٤٣زدا، موخابەراتی ئەڵمانی بە شێوەیەك لە شێوەکان هەستیان کرد، ڕوسەکان دەیان خەڵەتێنن، بۆیە وازیان هێنا......

ئەڵمانەکان چ چارەنووسێکیان بۆ ((دومب)) دانابووو چ نیازێکیانن بوو بۆ ئەوەی تۆڵە لە ((دومب)) بکەنەوە نازانرێ، بەڵام ((دومب)) توانی خۆی ڕزگار بکاو هەڵبێ لە دەستی موخابەراتی ئەڵمانی، داوای لە پاسەوانەکانی کردبوو، بچن لە یەکێ لە دەرمانخانەکاندا دەرمان بکڕێ، بەڵام ئەو لە دەرگایەکی دیکەوە بۆی دەرچوو بوو، پاسەوانەکانیش هەر چاوەڕێیان کردبوو، لە پاریس خۆی شاردەوە، دەرنەکەوت تا دوای ڕزگارکردنی فرەنسا، دوای چەند مانگێك دوای ئازادکردنی پاریس، مۆسکۆ داوای کردبوو، تا لەسەر چەند بابەتێك گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن، کە گەیشت، هەڵەیەکی گەورەی کردو کەوا زانیارییەکانی پرۆسەی ((بربا‌روسا))ی لەبیر کرد. تۆمەتی خیانەتی ((ئۆرکسترای سوور)) یان دایە پاڵی کە بۆ ئەڵمان کاری کردووە، بە ١٠ ساڵ حوکم درا، دوای ستالین لە ساڵی ١٩٥٣ ئازاد کراو ڕێگایان دا بۆ پۆڵەندای نیشتیمانی بڕوات.

دومب دەستی لە شوعیەت هەڵگرت و کەتە سەر کێشەی سەهیونییەوە. بووە سەرۆکی ئەوانەی لە تایفەکە مابوونەوە لە پۆڵەندە، زۆری نەبرد لەگەڵ حکومەتدا کەوتە کێشەوە، چونکی حکمەتی پۆڵەندا ڕێگای بە تایفەکە نەدەدا بۆ ئیسرائیل کۆچ بکەن، زۆری نەمابوو بەندی بکەن ئەمجارەش موخابەراتی سۆڤیێت فریای کەوت بەهانایەوە چوون. لەوکاتەدا دەست کرا بە بڵاوکردنەوەی کارە قارەمانیەتەکانی سیخوڕەکان، کە ((دومب)) یەکێك بووە لەوانە، بەمجۆرە بڵاوکرنەوەی ناوی لە بەندکردن ڕزگاری کرد. بەڵام حکومەت سەرەڕای ئەوەش ڕێگای

پێ نەدا بۆ ئیسرائیل کۆچ بکات. لە دواییداو لەژێر گوشاری مۆسکۆ، ساڵی ١٩٧٤ ڕێگایان پێ داو لەساڵی ١٩٨٣ لە قودس کۆچی دوایی کرد.

## ◆ ◆ فریتز کودرز و سەرکەوتنی تەڵەکەباز ◆ ◆

ناوی نهێنی ((ماکس))و ناوی خوازراویشی ((ریتشارد کلات))ە، ناوی ڕاستەقینەشی (فریتز کودرز))ە، ساڵی ١٩٠٣ز لە ڤییەننا لە دایك بووە. تا ئێستا نازانرێ کەی مردووەو لە کوێ نێژراوە... کابرایەکی قسە خۆش، بەڕەوشت، دوو ڕوو، ماستاوچی، خۆی دەبردە پێشەوە، زۆر زیرەك بوو، لەسەرخۆو دڵ گەورەبوو، ئەم خەسڵەتانە کردییە سیخوڕێکی نموونەیی لە ئەورووپای پێش شەڕی دووەمی جیهانی.

دایکی جوو بوو و باوکی کاسۆلیك، کە کاریان کردبووە سەر کەسایەتی، لە ساڵانی پێش شەڕدا بە فێڵو تەلەکەبازی دەژیا. لە تەمەنی بیست ساڵیدا بووە ڕۆژنامە نووس، لە ڕێگای ڕێککەوتنی نا مەشروعەوە پارەیەکی باشی کۆکردەوە، ناسنانەو پاساپۆرتی بە پارەو بەرتیل لە لای کارمەندانی بەڕێوەبردنی ناسنامە دەردەکرد، ئەك کاری سەختەکارییەی لە پێنج وڵاتدا ئەنجام دەدا. بەمجۆرە پەیوەندێکی پتەوی لەگەڵ گەڵێ لە کارمەندانی وڵاتانی ئەورووپا پەیداکرد. هەر لە دەریای بەلتیقەوە تا دەگاتە دەریای سپی ناوەڕاست. ساڵی ١٩٣٩ز ((کودرز)) ئامادەبوو وەکو پرۆژەیەکی سیخوڕی، سەرنجی یەکێکی ڕاکێشا، خۆشی نادیار بوو و بە ناوێکی نهێنیەوە دەناسرا ((ئەندریە تورکهول)) هێنایە ناو تۆڕێکی سیخوڕییەوە، کە لە ڕوسە سپییە دوورخراوەکان پێکهێنرایوو، بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەهەموو ئەورووپادا بە یەکێتی سۆڤیتیسەوە، ئەمە وتەی ((تورکهول)) بوو، بۆ ئەو لیهاتوانەی خستبوونیە ناو تۆڕەکەیەوە - وەکالەتی موخابەراتی ئەڵمانی _ کەچی ئەو دڵسۆزی بۆ

موخابەراتی سۆڤیێتی دەردەبڕی، کە بیست ساڵ لەمەوبەر لەم کارەدا بەکاری دەبرد. ((تورکهول)) بەردەوام بوو لە ئاگادارکردنەوەی سۆڤیێت لە کارەکانی موخابەراتی ئەڵمانی. بیرۆکەی گەمەیەکی گەورە بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئەڵمانیای نازی لە لایەن موخابەراتی سۆڤیێتیەوەو بەکارهێنانی ((کودرز)) بەشێوەیەکی چڕو پڕ مەشقی پێ دەکریٚو ڕادەهێنریٚ تا ببێتە جێگەی باوەڕ پێکردنو ئەنجامدانی ئەو کارانەی پێی ڕادەسپێرن.

((تورکهول)) ڕاهێنانو ئامادەکردنی ((کودرزی)) خستی ئەستۆی خۆی، ((کودرز)) لەژێر ناوی ((ریتشارد کلات))دا خۆی شاردەوەو وای پێشان دەدا یەکێکە لە پیاوانی کار. بە یارمەتی مۆسکۆ، دەستی کردە پێدانی هەندیٚ زانیاری کە نرخێکی وایان نەبوو بە موخابەراتی ئەڵمانی، تا بڕوای پیٚ بکەن، هەندیٚ کاری قارەمانانەشی پێشاندا؛ بۆ زیاتر پیٚ بڕواکردنی، وەکو دزینی هەندیٚ کاغەزی دیبلۆماسی هەستیار، لە قونسولییەتی ئەنریکی لە ((زەگراب)).

((کودرز)) مانگانەیەکی باشی لە موخابەراتی ئەڵمانی وەردەگرت. بەلاٚم ئەو شتێکی دیکەی دەویست، ئەویش پارچە کاغەزێك کە بە پارە نرخی دادەنرا، ئەویش بڕوانامەی سەلماندنی ناسنانەی ئاری، ئەم بەڵگەنامەیە لە حکومەتی نازییەوە دەردەچوو، کە خاوەنی ئە بەڵگەیە ب ((ئاری)) دادەنرێت، ئەم بەڵگەیە وەك ڕزگارکەرێك بوو بۆی، بەبیٚ ئەو بەڵگەنامەی ئەگەری ئەوە هەبوو لەهەر ئانو ساتێکدا بگیریٚو بۆ یەکی لە سەربازگەکانی مردنی ببەن. پەیداکردنی ئەو بڕوانامەیە ئاسان نەبوو. نازییەکان زۆر بە زەحمەت بە کەسێکیان دەدا بۆنی ڕەچەڵەکی ((جوو))یان لیٚ بکردایە، تا گەورە ئەفسەرانی موخابەراتیش بۆیان نەبوو بۆ یەکێکی وا ڕاسپێرییەك بکەن، ئەوانیش لەخۆیان دەترسان گومانیان

بێتە سەر. موخابەراتی ئەڵمانی نەیتوانی ئەو بڕوانامەیەی پێ بدەن. کە لە جستابو دەیپاراست گەر بهاتایە لە کەمێك لە ڕێنماییەکانی نازی لای بدایە. ڕێگا بە جوو نەدەدرا لە وەکالەتی موخابەراتی ئەڵمانی کار بکات، ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو، ((کودرن)) تەنها موخابەراتی ئەڵمانی نەیدەپاراست بەڵکو موخابەراتی نازیش پارێزگاری لێ دەکرد، هۆکەشی ئەوەبوو ((کودرن))یان بە سەرچاوەیەکی بنەڕەتی دەزانی بۆ زانیاری پەیداکردن لە یەکێتی سۆڤێت. بۆیە بە سەرچاوەیەکی بەنرخیان دادەنا، ئەوەی دەهێنا هەرچەندە ((جوو)) بێ بەکارمەند دایمەزرێنن.. ئەم سیخوڕە یەهودییە توانی بۆ ئەڵمانیەکا بیسەلمێنێ کە شایانی ئەو بڕوا پێ کردنەیە، بەهەندێ کار توانی ناوبانگی خۆی لە لایان باش بنوێنێ. ((تورکهول)) یش لە راپۆرتێکدا باسی لە ((کودرن)) دەکات کە تۆڕێکی پەیوەندی تایبەت بەخۆی لە ناوەوەی یەکێتی سۆڤێت دا هەیەو پەیوەندیشی بە گەورە ئەفسەرانی سوپاوە هەیە.

ئەڵمان چووبووە ناو یەکێتی سۆڤێتەوەو داگیری کردبوو، پێویستی بەزانیاری هەبوو سەبارەت بە سوپای سوور. ((کودرز)) بەڵێنی پێدابوون ئەو زانیارییانەیان بۆ پەیدا بکات. بەمەرجێ بێ تەلێکی بۆ بخەنە بەردەستو ئازادی جولانەوەو هاتو چۆکردنی هەبێو داوای سەرچاوەی هەواڵەکانیشی لێ نەکەن......

موخابەراتی ئەڵمانی بە مەرجەکانی ڕازی بوون، لە ((سوفیا)) بەرەللایان کردو ئامێرێکی پەیوەندیان پێدا. ((ماکس))_ ناوی بزتنەوەیەتی _ هەر لەسەرتاوە سەلماندی کە سیخوڕێکە بەتوانایە، ژمارەیە زۆر ڕاپۆرتی لەبارەی سیستەمی سوپای سۆڤێتیو جێگاکانی بە بەرپرسە ئەڵمانەکان دا، دەرکەوت ئەو زانیارییانە جێگای باوەڕپێکردنو ڕاستن، لە ساڵی ١٩٤٢ز کودرز بووە یەکەم سیخوڕی ئەڵماناو گرنگترین

سەرچاوەی زانیارییەکان لەبارەی یەکێتی سۆڤێتەوە. گەلێ لە گەورە سیخوڕان پیایدا هەڵیان داوە لەوانە: ((رینهارد جیهلن)) سەرۆکی موخابەراتی سەربازی ئەڵمانی و ((ویلهیلم کانارین)) سەرۆکی موخابەراتی ئەڵمانی.

لەلایەکی دیکەوە، وەکالەتی موخابەراتی ئەڵمانی لە سۆفیا لەگەڵ ((کودرز)) دا نا تەبا بوون، بەڵکو هەر لەسەرتاوە لێی بە گومان بوون، ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش گومانیان زیادی دەکرد. لە یەکتریان دەپرسی: لە کوێوە هەموو ئەو زانیارییە گرنگانەی دەست دەکەوێت؟....... گودرز وای نیشان دەدا ئەو زانیاریيانەی لە گەورە ئەفسەرانی روسیا وەردەگریٚ و سەرچاوەیکی نزیك ((ستالین))یش دەناسیٚ و زانیاری پیٚ دەدات.. وە ئەو سەرچاوانە هەر دوای دەرچوونی بڕیارەکان لە کۆبوونەوەی ستالین لە ئەنجومەنی شەڕدا، بۆ منی دەنێرن....

وتە گەلی لەم جۆرە، ئەفسەرانی موخابەراتی نایسەلمێنن، بەتایبەتی دەسەلاٚتی ((ستالین)) ئاگاداربوون چەند وردو سیستەمێکی پتەوی ئاسایشی ناوخۆیان هەیە، بۆیە هەندیٚ لە ئەفسەرانی موخابەراتی ئەڵمانی لە سۆفیا کەتنە چاودێری کردنی ماوەی بەکارهێنانی رادیۆکەی ((کودرز)) بۆیان دەرکەوت، ماوەی کارکردنەکەی، لەگەڵ قەبارەی زانیارییەکاندا ناگونجیٚ و بوونی خائین لەناو سەرکردایەتی سۆڤێت و ناردنی زانیاری لەلایەن هەندێکیانەوە، منداڵیش بڕوای پیٚ ناهێنیٚ.

پیاوانی موخابەراتی ئەڵمانی لە سۆفیا گەیشتنە ئەو بڕوایە کەوا ((کودرز)) سیخوڕەو سۆڤێت خستویەتە ناو موخابەراتی ئەڵمانیەوە، بەمەبەستی تێپەڕاندنی حیلەو لە خشتەبردنی ئستراتیجی، سەرەڕای سکالاٚ کردن و شکایەت کردن کەوا ((کودرز)) سیخوڕە، بڕوایان بە کودرز لەق نەبوو چونکی ئەو زانیارییانەی بە ئلمانیای دەدا ڕاستەقینەن و

گرنگ نییە لە کوێوە دەستی دەکەوێت.
ئەلمانیەکان نەیاندەزانی پەتیان بۆ شل دەکەن تا کاتێکی گونجاو دێت، زۆر قوربانیـان دەدا بـۆ لابردنـی گومـانو شـاردنەوەی ((کـودرز)) و وای نیشان بدەن ڕاست دەکات.. لە کۆتایی زستانی ١٩٤٢ز ڕوسەکان کەتنە خۆیـان، ((کـودرز)) بـە ئەڵمانـەکانی ڕاگەیانـد کـەوا سەرچـاوەکەی لـە ڕوسـیا پلانـی ڕووبـەڕوو بوونـەوەی سـوپای شەشـی ئـەڵمانی لـە ((سـتالینگراد)) پـیٚ ڕاگەیانـدووەو سـتالین فـەرمانی داوە لـەو شـارە بـەرگری بکـەن تـا دوا تنـۆکی خـوێن، هـەروەها ((کـۆدرز)) بەدوروردریـژی لـەبارەی شـتی تریـشەوە بـە ئـەڵماننی وتـووە، تـا نـاوی ئـەو تیپەسەربازانەشی پیٚ وتن کە بۆ شەڕەکە ئامادەکرابوون. لەگەڵ پلانی گواستنەوەی یەکەی سەربازەکان لە ڕووباری ((فولگا))و ناوی تەواوی ئەو فەرماندەرانەی کە بۆ دەرکردنی سوپای ئەڵمان دانراون لە شەڕەکە .
زانیارییـەکان وا دەردەکـەوت تـەواو ڕاسـتن، بـەلاٚم هـەر زوو موخابـەرتی ئەڵمانی پـەی بـەوە بـرد کـەوا ((کودرز)) پلانی سۆڤێتی نەزانیوە. کـەوا لەهـەموو لایەکـەوە لـە ڕۆژهـەلاٚتو ڕۆژئـاوای شـارەکەوە نیـازی هێـرش بردنیان هەیەو زیاتریش گوشار دەخەنە سەر ئەو لایەنەی لاوازە، کە لـە هێزەکـانی مەجـەریو ڕۆمـانی هاوپـەیمانانی ئـەڵمان پێـك هـاتبوو. بـەم جۆرە سـوپای شەشـەمی ئـەڵمانی ئابلۆقە دراو هـەموویان بە دیـل گیران، کـە ژمارەیـان ٢٥٠٠٠٠ سـەرباز بـوون، بـەرگریکارانی سـۆڤێت دەورەی سـتالینگرادیان گـرتو ئـەوەی لـە سـوپای شەشـی ئـەڵمانی مابوونـەوە ناچـار بـوون خۆیـان بەدەسـتەوەدا، شکـستیەکی تـووش هـات سـوپای ئەڵمان ئیتر نەیتوانی دوای ئەوە خۆی بگرێتەوە.
سەرەڕای ئەم کارەساتە، هێشتا سیخوڕە یەهودییەکە هەر جێگـای ڕێـزو بڕواپێکردن مایەوە. ساڵی ١٩٤٤ سۆڤێت فیلێکی دیکەی چنی، کە پشت

شکێن بوو و کۆتایی بەڕۆڵی هێنا وەك گەورەترین سیخوڕی ئەڵمانیا.
فێڵەکە پەیوەند بوو بە بڕیاری هێرشێکی سەرتاپایی سوپای سۆڤێت، بۆ تێکشکانی سوپاکانی ئەڵمان لە ڕۆژهەلاّتدا، ((کودرن)) موخابەراتی ئەڵمانی ئاگادارکردەوە کەوا هێرشەکەی ڕوس زۆری نەماوەو ئاراستەی باشووری ((ئۆکرانیا)) دەگرێ، بە مەبەستی داگیرکردنی (بەلقان)) ، ئەمە وای لە ئەڵمانەکان کرد هێزەکانیان لە باشوور کۆبکەنەوە. کە گەرداوەکە هەڵیکرد، بۆیان دەرکەوت هێرشەکەی ڕوسیا لەبەرەی ناوەڕاستەوەیە، کە ٤٠٠ میل لە باشووری ئۆکرانیەوە دوورە. لەوشەڕەدا نزیکەی نیو ملیۆن سەربازی ئەلمانی تیاچوون، کوشتارەکە بەردەوام بوو، هێرشەکەشی ڕانەوەستاو بەرەو پێشەوە دەچوو، تا دوای چەند مانگێك سەربازی سۆڤێت گەیشتە شەقامەکانی بەرلین.
لە نێوان ((کودرن))و ئەفسەرانی پەیوەندیکردنی ئەڵمان لە سۆفیا، ناکۆکی دەستی پێکرد. بۆیان دەرکەوت چەندین پرۆسە بەڕێوە دەباتو پارە دەداتە پۆلیسی بولگار تا چاوپۆشی لێ بکەن. کە ئەوە نیشانەی کەمایەسی بوو لە کەسایەتی کودرزو هەڵسو کەوتی. ئەمە وای کرد چاو بە پرۆسەی ((ماکس))دا بخشێنن، بۆیان دەرکەوت کەوا ((کودرن))سیخوڕەو ڕوسەکان لەناو جەستەی موخابەراتی ئەڵمانی چاندویەتی. موخابەراتی بەریتانیش گەیشتە هەمان ئەنجام، کە خەریکی پرۆسەی ((ئەلترا)) بوون بۆ خوێندنەوەی کۆدەکان کە لە نێوان سۆفیا و بەرلیندا ساڵی ١٩٤٣ هەبوو. ئینگلیزەکان ڕوسە هاوپەیمانەکانی خۆیان ئاگادارکردەوە، کەوا ئەڵمانەکان سیخوڕێکیان هەیە زانیاری لە سەرچاوە سەربازییەکانی ڕوسیاوە وەردەگرێو دەیداتە موخابەراتی ئەڵمانی بە هۆی ((رادیۆ))وە، ئەو سیخوڕەش نیشتەجێی ((سۆفیا)) یەو زانیارییەکان دەگەیەنێتە بەرلین، ناوی بزوتنەوەی

(ماکس)ە، هەروەها موخابەراتی بەریتانیا ئەوەشی بۆ ئاشکرا بوو، کەوا ڕوسەکان ئەم ئاگادارکردنەوەیان بە هەند وەرنەگرت، ئەم گوێ پێنەدانە، ئەوە دەگەیێنێ کەوا ((ماکس)) سیخوڕی ڕوسەو ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ.

لەهەمان کاتدا موخابەراتی ئەڵمانی گەیشتە ئەو قەناعەتەی کەوا ((ماکس)) بۆ بەرژەوەندی ڕوس کاردەکات. ئەمە لە بارودۆخی ئاساییدا حوکمەکەی هەڵواسینە. بەلام ((کۆدرن)) ڕزگاری بوو، چونکی لەو دەمەدا موخابەراتی ئەڵمانی سەری لێ شێوابوو و کاتێکی سەخت و ناسکیش بوو دوای سەرنەکەوتنی پیلانی دژی هیتلەر لە ساڵی ١٩٤٤زدا. کە دەرکەوت ((کودرن))یش دەستی تێدایە، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی موخابەراتی ئەڵمانی دەرچوو و بەڕێوەبردنی درایە دەست لایەنێکی تر. ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە، بەڕێوەبەرایەتیە تازەکەش بڕوای بە ((کۆدرن)) لەق نەبوو، بڕیاری پاراستن و ڕزگارکردنی دا، گواستیانەوە بۆ کارکردن لە موخابەراتی مەجەر، بۆ دزینەوە لەو یاسایەی کە ڕێگای نەدەدا ((جوو))یەك لە موخابەراتی ئەڵمانی یا بەشەکانیدا کارمەندبێ. بەلام ئەم فێڵە سەری نەگرت، هیتلەر زۆر تووڕە بوو کە زانی وەکالەتی موخابەرات ((جوو))یەك سیخوڕە تیایدا، فەرمانی دا بۆ سەربازگەکانی بەندکردنی بنێرن، بەلام جەنەراڵ ((هینز جودیریان)) سەرۆکی ئەرکان وای کرد، فەرمانی بەنکردنەکەی هەڵوەشێنێتەوە. لە ساڵی ١٩٤٥ز ئازاد کرا، لەوکاتەی کە ئەڵمانیا بەرەو ڕوخان دەڕۆیی، بۆ نەمسا هەڵهات ((تورکهول)) پارێزگاری لێ کرد. دوای چەند هەفتەیەك ئەمریکا بەتوندی سیخوڕی نازی دەستگیر کرد.

ساڵێك لەلای ئەمریکییەکان زیندانی کرا، بەلام بە فێڵ توانی لەوێش خۆی ڕزگار بکاتۆ، بەڵکۆ ((مەکتەبی ئیستراتیجی)) ڕزگاری کرد کە بخرێتە لیستی ئەوانەی دژی یەکێتی سۆڤێت کاردەکەن لە نەمسادا،

سۆڤێت ئەم گۆڕانەی پێ ناخۆش بوو،

((تورکهول)) پێی ڕاگەیاندن بەو گۆڕانەی کودرز، لە شوباتی ساڵی ١٩٤٦ هەوڵی فڕاندنیان دا بە یارمەتی کۆمەڵێ کرێگرتە کە جل و بەرگی پۆلیسی ئەمریکایان لەبەردابوو، بەڵام ((کۆدرز)) لەمەش خۆی قورتارکرد. لە ساڵی ١٩٦٤زدا، جارێکی کە لە ڤییەننا سەری هەڵدایەوە، ئامادەیی خۆی بۆ وەکالەتی موخابەراتی ئەمریکی نیشان دا، بەڵام کەس بڕوای پێ نەکرد، داواکەیان قەبول نەکرد، جارێکی کە خۆی شاردەوە.

چەند ساڵێك تێپەڕی ئەوجا ئەمریکییەکان هەندێ بەڵگەنامەیان دەست کەوتن، شییان کردەوە، بۆیان دەرکەوت کەوا ((کۆدرز)) ئەو کەسەیە کەناوی بزوتنەوەکەی ((ماکس))ە، ئەو سیخوڕەی کە کارێکی زۆری کردووە بۆ پەککستنی کارە سەرازییەکانی ئەڵمان لەبەرەی ڕۆژهەڵاتدا.

لەچاو بزربوونی ((کۆدرز)) گەڵێ نیشانەی پرسیاری سەبارەت بە ((پرۆسەی ماکس)) لێ کەوتەوە. یەکێ لەو پرسیارانە، دەربارەی ئەنجامی پرۆسەکە بوو.... بۆ سەری خۆی لەناو دەمی شێر نا، بە فێڵ کردنێك کە دەزانرا ئاشکرا دەبێ؟.

هیچ بەڵگەیەك بەدەستەوە نییە، کەوا لە هەواداراتی شیوعیەت بێ، ئەگینا دەمانگوت، هۆکەی سیاسی بوو، ئایا هەوڵی داوە نازییەکا بڕوخێنێ چونکی خۆی یەهودی بووو ویستویەتی تۆڵە لە هیتلەر بکاتەوە؟..... ڕەنگە، هەر چەند جوویەکی ئیماندار نەبووو هەمیشە دەیگوت من کاسۆلیکێ؟ ئایا بۆ پارەو دەسکەوت بوو؟ ڕەنگە، کە لە هەردوو لا، پارەی وەردەگرت

### ◆◆ لاشەیەك دەبێتە قارەمانی پرۆسەی قیمەی گۆشت ◆◆

لە ساڵی ١٩٤٣زدا، هاوپەیمانان باکوری ئەفریقایان داگیرکردبوو، خۆیان بۆ داگیرکردنی ئەورووپا ئامادەدەکرد، بڕیاریاندا کەوا ((سقلیە))

گونجاوترین شوێنە بۆ لێوە تێپەڕینی هێزەکانیان، بیریان لە هەڵخەڵەتاندنی ئەو دەورو بەرە کردەوە، تا وای نیشان بدەن کەوا هێزەکانی هاوپەیمانان لە جێگایەکی دیکەوە دەپەڕێتەوە، موخابەراتی بەریتانیا ڕێگا چارەیەکی بۆ پرۆژەیەك دۆزییەوە، ناوی ڕەمزی پرۆسەکەیان ناو نا ((پرۆسەی قیمەی گۆشت)) ، قارەمانەکەشی لاشەیەك بوو...

سەرۆکەکانی موخابەرات لاشەیەکیان دەست کەوت، کەلەبەر نەخۆشی سییەکانی مردبوو. جل و بەرگی ئەفسەرێکی دەریایی شاهانەیان لەبەر کرد، بەڵگەنامەو ناسنامەشیان لەباخەڵی نا، کەوا ((میجور مارتن))ە، بۆ کارێکی نهێنی گوایە نێرراوە بۆ لای فەرماندەکانی هاوپەیمانان لە باکووری ئەفریقا، بەڵگەنامەی نهێنیان پێ هەڵگرتبوو ئەوەی نیشان دەدا کەوا هێرشبردنە گەورەکە لە ((سقلیە))وە دەست پێ،اکەن، بەڵکو لە ((سەردینیا))و ((یۆنان))ەوە دەستی پێدەکەن. لاشەکە بە نهێنی و بە ژێرئاوەکەدا _ غواصە _ بۆ کەناری ((هیولفا)) لە ئیسپانیا، گواستیانەوە، دەبوایە دەم شەپۆڵەکانەوە تا وادەرکەوێت کەوا ((میجور مارتن)) کە فرۆکەکەی بەربۆتەوە ناو دەریا خنکاوە... لە ((هیولفا)) ژمارەیەك سیخوڕی ئەڵمانی لێ بوو، موخابەراتی بەریتانی وای دانا، کەوا زۆری پێ ناچێ دەزنن شەپۆڵی دەریا لاشەیەکی گەیاندۆتە کەنارو بەڵگەنامەی نهێنی پێیە، جا سەرکردەکانی ئەڵمانیا ئاگادار دەکەنەوە لەم ڕووداوە.

سەرکەوتنی ئەم فێڵە دەکەوێتە سەر ڕواڵەتی لاشەکە کە تا چەند جێگای بڕوا پێکردنە، موخابەرات دەبووایە بۆ ئەم ((میجور مارتن))ە دەسکردە چیرۆکێك هەڵبەستیّ و بخولقێنیّ، چیرۆکێکی دڵداریان بۆ داتاشی، وایان بۆ هەڵبەست کەوا دەزگیرانێکی هەیەو ناوی ((بام))ە، لە

هێزی دەریاییدا کارد دەکات. وێنەی ئەو دڵدارەیان لەناو جزدانەکەیدا دانا، نامەیەکی دڵداریشیان هەر لەناو جزدانەکەدا نا، وایان کردبوو نامەکەش ئەوەندە خوێندرابێتەوە کۆن بووبێ.. هەروەها، وەسڵی پارەی گرینی ئانگوستیلەیەکیشی ، لەگەڵ نامەیەکی توندی بەڕێوەبەری بانقێك و لەگەڵ نامەیەکی باوکیدا، ئەوەشیان لەبیر نەچووبوو، ((دوو پلیت))یان دانابوو تا وا دەربخات کە دوا شەوی لەگەڵ ((بام))دا لە شانۆدا بەسەر بردووە بەر لەوەی ئەم کارە نهێنییە بکات کە کۆتایی بە ژیانی هێنا.

بۆ ئەوەی بەتەواوی فێڵەکە جێگای بڕوا پێکردن بێت. ئەفسەرانی موخابەراتی هەواڵی مردنی ((میجور مارتن))یان لە لاپەڕەی مردوانی ڕۆژنامەی ((تایمز))دا بلاو کردەوە....

لاشەکەیان خستە سندوقێکەوە، لەسەری نووسیان ((کەرستەی چاو)) بۆ ناو ژێر ئاوییەکەیان برد، لە سندوقەکەیان دەرهێنا، تا شەپۆلەکان بیبەن، ئەم کارەیان لە ٣٠ مایسی ١٩٤٣ز کرد. وەك چۆن دانرابوو، لە هیولفا لاشەکە دۆزرایەوە، بەڵگە نهێنیە سیخوڕیەکانی ئەڵمانی دوای تەواو بوونی شەڕەکە ئەمەی ئاشکرا کرد کەوا چۆن، ئەو لاشەیان بە بەختێکی چاکی ئەڵمان داناون کەوا بەڵگەی نهێنی پێ بووە! بە پێی ئەو بەڵگە نهێنیانەی لاشەکە سوپای ئەڵمان و هێزی دەریایی بۆ یۆنان و سەردینیا نێرراون و پشتیان لە سقلیە کردو بە ئاسانی کەوتنە داوی هاوپەیمانانەوە.....

ئەوەی شایانی باسە، موخابەراتی هاوپەیمانان هەموو پێویستیەکانی سەرکەوتنیان بۆ پرۆسەی ((قیمەی گۆشت)) دانابوو بۆ ئەوەش کەناری ئیسپانیایان هەڵبژارد تا لاشەکەی بگاتێ، چونکی ئیسپانیا هاوپەیمانی ئەڵمانیا بوو، هەرچەندە بەشداری شەڕی نەکردبوو... بۆیە بلاوکردنەوەی نهێنی لاشەکەو گواستنەوەی بۆ ئەڵمانیا مسۆگەر بوو.

ئـەو جانتایـەی بەڵگەنامـە نهێنیـەکانیان تێـدا بـوو، بـە مەچـەکەوەیان بەستبوو، تاوای نیشان بـدەن بە تەنگیەوە هاتووەو نەیویستووە لەناو بچن....

موخابەراتی بەریتانی، کێشەی ئەوەی بۆ پەیدا بوو، کە وێنەیەکی ئەو کابرایەیان دەست نەدەکەوت، ویستیان وێنەی ڕوومەتی بگرن، بەڵام وێنەیـەکی زینـدو دەرنەدەچـوو، دواجـا کەوتنـە سـەر ئـەوەی وێنـەی یەکێکیان پەیداکرد کە زۆر لەوەوە نزیك بووو لەو دەچوو.

## ♦ ♦ سیخوڕی ئەتۆم ♦ ♦

زاناکانی ڕۆژئاوا لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانیدا بۆمبای ئەتۆمیان داهێنا. جیهان دەیزانی کەوا چەکێکی مەترسیدارەو توانای وێرانکردنی شارێکی تـەواوی هەیە. سەرکردەکانی هاوپـەیمانانی ڕۆژئـاوا، بڕیـاری ئەوەیان دابوو، کەوا ڕوسیا لـە نهێنـی ئەتۆم بەشـدار نەکـەن، ڕوسیاش بڕیـاری زانـین و وەدەسـتهێنانی دابـوو، بـۆ ئەمـە، تـۆڕێکی سـیخوڕی دامەزرانـد کـە لـە شـانەی جیـا جیـا پێکهـاتبوو لـە کەنـەداو وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە دەزگای لێکۆڵینەوەی ئەتۆمیان لێ بوو.

هاوپەیمانان تا ئەیلولی ساڵی ١٩٤٥ز ئاگایـان لـە بوونی تـۆڕێکی ڕوسـی نـەبوو. کە یابان خـۆی بەدەسـتەوەدا، شـەڕەکەش کۆتـایی پێهات. دوای چـەند ڕۆژێـك ((ئیگـور حوزینکـۆ)) کـە نووسـەری شـفرە _ کـۆد _ ی ڕوسـەکان بـوو لـە باڵیۆزخانـەی ڕوسـی لـە ((ئۆتـاوا))، داوای پەناهنـدەی سیاسـی کـرد لەکاربەدەسـتانی کەنـەدا، دواتـریش یەکـە یەکـە ئەنـدامانی تۆڕە ڕوسەکی لە کەنەدا بەدەستەوە دا.........

لەوانـە نـاوی زانایـەکی ئاشـکرا کـرد بـەناوی ((کـلاوس فوتـشس)) کـە لەساڵی ١٩٤٩ز لە لەندەن دەسگیرکرا، ئەویش وەك چەند کەسانێکی کە لـە مەفاعلـەکانی ((تـشوك ریڤـر)) لـە ((ئونتـاریو))ی کەنـەدا کـاری دەکرد،

بەڵام ئەمیان لە ((لۆس ئالاموس))یش لە ئەمریکا کاری کردبوو، دەرکەوت شانەیەك لەوێ خەریکی کارکردنن.. ((فوتش)) دانی بەوەدانا، کەوا نهێنی ئەتۆمی بۆ یەکێك درکاندووە ناوی ((ریموند))ە، بەڵام هیچی لەبارەوە نازانێ ئەوەندە نەبێ ((ریموند)) کابرایەکی قەڵەوە، سەری خڕە، لەناوەڕاستی تەمەنیدایە، چەند جارێ لە شوێنی جیا جیا یەکتریان بینیوە. لە ((سانتافی و نیویورك)). ((ریموند)) دەستکێشێکی قاوەیی لەدەست دەکرد، و کتێبێکی بەرگ سەوزی بەدەستەوە بووە... ((ریموند)) تەوەری تاکە شانەیەك بوو، ئەمە کارێکی گران بوو و کەوتە بەردەم مەکتەبی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەمریکی بۆ دۆزینەوەی. دەستیان کردە، پشکنینی تۆماری ئوتێلەکانی شارەکان..... خوشکێکی ((فوتشس)) لە ((بوستن)) دەژیا، کاتێ لەگەڵیا دەدواین، سەرەداوێکی بەدەستەوە دا، گوایە ئەو باسی ((کیمیای)) کردووە. هەروەها مێردەکەشی کلیلێکی دیکەی بەدەستەوەدا، کاتێ باسی شتێکی ((فیلادلفیا))ی کرد، تۆڕەکە تەسکەوە بوو، بە فڕۆکە وێنەی گومانلێکراوێکیان بۆ بەریتانیا نێررا، تا ئەوە بدۆزنەوە کە لەنێوانیاندا کار دەکات. ((فوتشس))یش زیندانی کرا. لە مایسی ساڵی ١٩٥٠ز دوو پیاوی موخابەراتی ئەمریکی ماڵی ئەو ((کیمیاگەرەیان)) دەپشکنی لە ((فیلادلفیا)) بەناوی ((هاری گولد)) کەناوی لەناو گومانلێکراوەکاندا بوو، چوار ڕۆژ خستیانە ژێر پرسیارو لێکۆڵینەوەوە، مکوڕبوو کە بێ تاوانەو سیخوڕ نییە، هەمیشە دەیپرسی: چۆن من فوتشس لەو هەموو جێگایانە دەتوانم ببینم... کەچی لە ژیانمدا لە مسیسیبی نەپەڕیمەتەوە ئەو دیو.....؟. کە ماڵەکەیان پشکنی، یەکێکیان خەریتەیەکی شەقامێکی لە ((سانتا _ فی)) دۆزییەوە. کە ئەوەیان پێشاندا ((گولد)) دانی پێدانا و ئەندامانی شانەکەی ئاشکرا کرد، ئیتر یەکە یەکە

گرتنیانن، تەنها ((رودۆلف ئابل)) نەگیراو هەڵهات. بەردەوام بوو لە کاری سیخوڕی تا ساڵی ١٩٥٧ز گیرا.

## ♦ ♦ ویتاگر شامبرز ♦ ♦

لە بەیانیەکی بەهاری ساڵی ١٩٣٩زو لە ژووری یەکێ لە ئوتێلەکانی شاری نیویۆرك، چاوپێکەوتنی سازکرا، ڕۆژگار سەلماندی کەوا مەترسیدارترین کۆبوونەوەیە لە سیخوڕێتی نوێدا... دوو کەس بەیەك گەیشتن، بڕیاریان دا، کەوا زیانێکی گەورە بە موخابەراتی سۆڤێتی بگەیێنن. ئەو دوو پیاوە تا بڵێی لە یەکەوە دوور بوون هیچ شتێکی هاوبەشیان لە نێواندا نەبوو، یەکێکیان کورتە بنەی سەر گڤن، ددان ڕزیو، ناوی ((ویتاگر شامبرز)) بوو، لە گۆڤاری ((تایم)) دا کاری ڕۆژنامەنووسی دەکرد، ئەوەی تریان ، هاولاتیەکی پێشووی یەکێتی سۆڤیەت بوو، لەولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نیشتەجێ ببوو، ناوی ((شیمکا جینز بیرگ)) بوو، ناوی خوازراوی کە چەند ساڵێکە بەکاری دەهێنیێ ((والتر کریفتسکی))یە، لەڕولاوازو ڕێكو پێك بوو.

سەرەڕای لەیەك نەچوونیان، بەلآم ڕابردوویان یەك بوو، هەردووك کۆنە سیخوڕ بەوون، ((شامبرز)) لە تەمەنی ٣٠ ساڵە بوو، کومونیستێکی ئەمریکی بوو، لەساڵی ١٩٢٤ لەو حیزبە کاری دەکرد. دوای هەشت ساڵ بۆ دەزگای نهێنی سەر بەحیزبەکە دانرا، دەزگاکە شیوعیە بەرزەکانی دەخستە ناو ئەو کارەوەو ئەندامێتی حزبەکەیان لێ وەردەگرتەوەو کاری سیخوڕیان بۆ موخابەراتی سۆڤێتی پێ ڕاسپاردن. ساڵی ١٩٣٣ز، ((شامبرز)) بە نهێنی بۆ ڕاهێنان لەسەر سیخوڕی بۆ مۆسکۆ ڕۆیشت. کە بۆ ئەمریکا گەڕایەوە بووە نوێنەری چەند شانەیەکی شیوعی کە لە هەندێ شوێنی حکومی ولآیەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کاریان دەکرد. زانیاری دەگەیاندە حیزب. بەلآم لە شیوعیەت بێزار بوو و وازی هێنا.

بەڵام ((کریفتیسکی)) تەمەنی ٤١ ساڵ بوو کاتێ چووە ناو موخابەراتی سۆڤیەتەوە. کە ساڵی ١٩٣٦ موخابەراتی سۆڤیاتی گۆڕانی بەسەرداهات، بۆ ((لاهای))یان گواستەوە. بووە بەرپرسی گونجاندن لە نێوان کارەکانی موخابەراتی سۆڤێتی لە ڕۆژئاوای ئەورووپا..... لە ساڵی ١٩٣٨ز کە هاوڕێی کاریو دۆستی تەمەنی ((ئیگناس یوریتسکی)) لە کوشتارگەی ستالین دا کوژرا، کە وەکیلە یەهودیەکانیان تیادا کوشت، ((کریفتسکی)) پەنای بۆ فرەنسا برد. لە فرەنساوە چووە کەنەدا، پەیوەندی بە مەکتەبی لێکۆڵینەوەی فیدراڵیەوە کرد، لەوڵاتە یەکگرتووەکان جێگایان بۆ دابین کرد، بەمجۆرە ((کریفتیسکی)) لەبەندوباوی شیوعیەکان ڕزگاری بوو، بریاری دا، تۆڵەی ئەو هاوڕێیانەی لە موخابەراتی سۆڤێتی بکاتەوە کە بونەتە قوربانی....

((شامبرز))و ((کریفتیسکی)) قسەیان کردە یەكو لەو ڕۆژە بەهارییەدا ڕێککەوتن کە دزە کردنەکانی موخابەراتی سۆڤێتی بۆ ناو دیموکراتی ڕۆژئاوا ئاشکرا بکەن. بەڵام هەر زوو زانییان، ئەمە کارێکی ئاسان نییە، چونکی یەکێتی سۆڤێت خۆی بۆ ئەگەری کاری وا ئامادەکردبووە. لە کۆتای ساڵی ١٩٣٩ز، ((شامبرز)) پەیوەندی بە یاریدەدەری وەزیری دەرەوە ((ئەدۆلف بیرل)) کردو پێی ڕاگەیاند کەوا موخابەراتی سۆڤێتی توانیویەتی دزەبکاتە ناو وەزارەتەکەیەوە. بەڵام _ وادیارە _ ویستی ناوی ئەو کەسانە ئاشکرا نەکات کەدەیزانی ئەندام بوون لە شانەیە شیوعیداو بۆ موخابەراتی سۆڤێتی کاریان دەکرد. بێگومان: قسەکانی ((شامبز)) هیچ نرخێکی نابێ ئەگەر ناو ئاشکرا نەکات، بۆیە کۆشکی سپی لەسەردەمی ((ڕەوزفلت)) دا بڕیاری بەهەندورنەگرتنی ئەو بابەتەی دا.

لەساڵی ١٩٤٢ز، ((شامبرز)) پەیوەندی بە مەکتەبی موخابەراتی

فیدرالیەوە کردو ناوی سیخوڕەکانی بۆ ئاشکرا کردن. بەڵام مەکتەبی موخابەراتی فیدرالی لە ئامادەباشیدا بوو، ((کریفتیسکی)) وشیاری کردبوونەوە. وتووبووی، گوێی لێ بووە کەوا موخابەراتی سۆڤێتی ((٦١)) سیخوڕی لە بەریتانیادا هەیە بۆ لەندەن نێرراون. دەبا لەگەڵ موخابەراتی بەریتانیادا لە ئەنجامی ئەمە بدوێن.
((کریفتسکی)) توانی، دوو سیخوڕی موخابەراتی سۆڤێتی دەستنیشان بکاتو ((جون هیربیرت کینگ)) نووسەری شفرە _ کۆد _ لەوەزارەتی دەرەوەو ، ((تایلر کینت)) نووسەری کۆد لە بەشی ئەمریکادا، کە زانیاری بە موخابەراتی ئەمریکیش دەدا. ((کریفتسکی)) زۆر مەبەستی ئەوبوو، خائینە بەریتانیەکان ئەوانەی بۆ ڕوسیا کاریان دەکرد ئاشکرا بکات. بەڵگەی بەدەستەوە بوو دژی ((هـ. ر. فیبلی))و ((دونالد مالکین)) و چەند کەسانێکی دیکەش..... بەڵام دەسەڵاتدارانی بەریتانیا گوێی بەو زانیاریانە نەدەدا... هەروەها نەیتوانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش باوەڕ پێ بهێنێ، تووشی نائومێدی بوو، ساڵی ١٩٤١ز خۆی کوشت...مەکتەبی موخابەراتی فیدراڵی سەری سوڕما کەوا ((شامبرز)) نایەوێ ناوی سیخوڕەکان ئاشکرا بکات، دانی بەوە دانابوو، کە وەکو نوێنەرێك لە خزمەتی ناو شانە سۆڤیەتیەکاندا لەناو ئەمریکادا کاری کردووە. بۆیە ناوی هەموو سیخوڕ'کان دەزانێ، بۆیە مەکتەبی موخابەراتی فیدرالی کەوتە گومانەوە، کەوا ((شامبرز)) نایەوێ ناوی هاوڕێیەکی خۆشەویستی بڵێ. ئەم گومانە تا ئابی ساڵی ١٩٤٨ز دیاری نەداو نەزانرا، کاتێ کە ((شامبرز)) بۆ بەردەم لیژنەیەك بانگ کرا کە بۆ چاودێریکردنی دژە چالاکیەکانی ئەمریکا دانرابوو، لەوێدا بۆمبیکی تەقاندەوە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو، لەوێدا ڕایگەیاند کەوا هاوڕێیەکی دێرینی ((ئالگەرهیس)) یەکێکە لە سیخوڕەکانی سۆڤێت، کە

زانیاری لێیان وەرگرتووە، دانپێدانانێکی سەرسووڕهێنەر بوو، چونکی ((هیس)) گەورە کارمەندێکی بەشی ڕۆژهەڵات بوو لەوەزارەتی دەرەوەدا تاکو ساڵی ١٩٤٤ز، دواجا بووە کۆڵەکەی سیاسی دەرەوەی ئەمریکی.

کە ((هیس)) بەمەی زانی، داوای لە لیژنەی لێکۆڵینەوەکە کرد دانیشتنێکی ئاشکرا ببەستێ، تۆمەتەکەی ئینکار کرد، سوور بوو لەسەر ئەوەی کەوا ((شامبرز)) ناناسێ و یەکیان نەبینیوە؟، لیژنەکە تووشی تەنگ و چەڵەمە بوو، بڕوای نەکرد کەوا ((شامبرز)) سەرکێشی دەکاو خۆی تاوانبار دەکا کەوا بەدرۆ سوێند دەخوات و دژی ((هیس)) بوختانی پێوە دەکات، بەڵام لەلایەکی ترەوە، دان پێدانانی ((هیس)) لە ڕاستییەوە نزیک بوور درۆی نەدەکرد. زۆر ئاستەم بوو بڕوا بەوە بهێنرێ یەکێك لە پایەو پلەیەکی ئاوادا بێ و درۆ بکات.

سەرەڕای ئەوەی ((هیس)) توانی باوەڕ بە هەموویان بێنێ کەوا ڕاست دەکات، بەڵام ئەندامێکی لیژنەکە لەناویاندا دڵنیابوو کەوا ((هیس)) درۆ دەکات. ئەو ئەندامەش ((ریتشارد نیکسۆن)) بوو، کە ئەندامی کۆنگرێس بوولە لایەن ((کالیفۆرنیا))وە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ، داوای لە ((شامبرز)) کرد لە پێش لیژنەکەدا ئامادە بێت و ئەوەی لە ساڵانی سییەکاندا لە بیری ماوە بەدورو درێژی بیگێڕێتەوە لەبارەی پەیوەندی ئەو بە ((هیس))ەوە. هەروەها داواشیان لە ((هیس)) کرد کە لە دانیشتنێکدا ئامادەبێ و باسی ژیانی بەدورو درێژی لەو ماوەیەدا بگێڕێتەوە... گێڕانەوەکان لەهەندێ ڕووەوە لەیەك نزیك بوون. ئەوەی دەردەخست کەوا ((شامبرز)) زۆر باش ((هیس)) دەناسێت. ((هیس)) لە قسەکردندا دەپەشۆکا، لە دواییدا، وتی، بیرم کەوتەوە، پیاوێکی ناسیووە ناوی ((جورج کروسلی)) بوو، هەر لە ((شامبرز)) دەچوو...

سەلماندی ئەمە کێشە بوو، ((شامبرز)) ڕایگەیاند کەوا بەڵگەنامەی

فـەرمی پێـداوە تـا بـە موخابـەراتی سـۆڤێتی. ((شـامبز)) وێنـەی بەڵگەنامـەکانی گرتـووەو دواجـا، ئۆریجیناڵەکـەی بـۆ ((هـیس)) گەڕاندۆتەوە. بەڵام بۆ سەلماندنی ئەم قسانەی هیچ بەڵگەیەکی نەبوو، دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێك ((شامبز)) بەڵگەی هێنانەوە. ئەویش، شوێنێکە کە بەڵگەنامەکانی لەسەر ((میکرۆفیلم)) تیادا شاردۆتەوە. لەوە سـەیرو سـەمەرەتر ، هەنـدێ لـەو فلیمانـە، لـەناو کولەکەیەکـدا لـە مەزرەعەکەیدا شـاردبوویەوە. هەندێ لـەو فلیمانـەش بەدەسـت خـەتی ((هیس)) تێبینیـان لەسـەر نووسراوە. هەندێ بابەتی دیکەش کەدواجا ئاشکرا بوو کەوا بەدەستی ژنەکەی ((هیس)) چاپکرابوون.

لەدواییدا، ((هیس)) بە تۆمەتی سوێند خواردنی درۆ تۆمەتبار کرا، بەڵام کێشەکە لەوە دوورتر ڕۆیشت. ئەم کارە بووە سەرەتای کاری سیاسی ((ریتـشارد نیکـسون)) و زیـاد بـوونی رقـی جـەماوەر لـە شـیوعیەت.

ئەنجامەکان بە گوێرەی دڵی ((شامبز)) نەبوون، بەڵام کەس چاوەڕوانی ئـەو تەقینەوەیـەی نـەدەکرد کـە خـۆی ب ئامـادەکردبوو لـەو ڕۆژەی کـە لەگەڵ ((والتر کریفتیسکی))دا چاویان بەیەك کەوت.... لەسەرکەوتنی خـۆی ڕازی بوو کەوا ژمارەیەك شانەی شیوعیە ئەمریکیەکانی ئاشکرا کـردووە. ئەوانـەی کارمەنـدی دەزگـا حکوکیـەکان بـوون، زیـاد لـە ٤٠ سـیخوڕی موخابـەراتی سـۆڤێتی ئاشـکرا کـرد، کـەتا ئـەو ڕۆژە کـەس نەیدەزانی چ خزمەتێکیان بە یەکێتی سۆڤێت کردووە. بەڵام سێ کەسیان لە مەکتەبی ئستراتیجی کایان دەکرد لە ساڵانی شەڕدا، ((لاشین کوری)) نەبێت کە ڕاوێژکاری سەرۆکی ئەمریکا ((ڕەوزفلت)) بوو....

لـەوە زیـاتر ((شـامبز)) دەتـوانرێ بـە بـاوکی بزوتنـەوەی موحافیزکـاران بژمێررێت. چونکی هەڵمەتەکەی ئەو وای کرد نەوەیەك بە موحافیزکاران بـژمێررێت، لەوانـە سـەرۆك ((ڕۆنالـد دیگـن))، کـە ئـەو کاتـە سـەرۆکی

سەندیکای ئەکتەرانی سینەمابوو. کە لەساڵی ١٩٥٠وە دەسکرا بە پاککردنەوەی ئەو ڕێکخراوە لە شیوعیەکان، دوای ٣٦ ساڵ لەو کاتەوە، سەرۆکی ئەمریکا ((رۆنالد ریگن)) بڕیاری دا، رۆحی ((ویتاکر شامبرز)) مەدالیای ئازادی پێ ببەخشرێ، کە بەرزترین وسامی مەدەنیە.

## ♦ ♦ روس کوزینسکیو سەفەری بێ گەڕانەوە ♦ ♦

بەیانی ڕۆژێکی بەهاری ساڵی ١٩٤١ز، دوو پۆلیس لەپێش خانۆچکەیەکی نزیکی زانکۆی ((ئۆکسفۆرد)) وەستانو یەکێکیان لە دەرگایدا، هەردووك دەیانزانی کەوتوونەتە دوای پشیلەیەکی کێوی مەترسیدار. هەواڵێکیان لەو هەواڵانە بیستبوو کە لە ڕۆژانی شەڕدا مرۆ گوێیان لێ دەبوو، کەوا سیخوڕی دوژمنان لە فلانە جێگادا هەیە..... هاوڵاتیان هەر بەدرۆ گومانیان پەیدا بکردایە خەبەریان دەدا..... ئەو خانۆچکەیە لەوە نەدەچوو ببێتە لانەی سیخوڕان، عەریفێکی هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانی بەناوی ((لیون بورتون)) لەگەڵ ((ڕوس))و ژنیدا بە کرێیان گرتبوو، دوو منداڵیشیان هەبوو، هاوسێییەکیان خەبەری ئەوەی دابوو، کەوا جیهازێکی ڕادیۆیی شەپۆلی کورتیان لە خانۆکەکەدا بینیوە.. بە پێی یاسا، دەبوایە خاوەنی ئەو جۆرە جیهازانە لەلای دەسەڵاتداران بەفەرمی تۆماریان بکردایە بە تایبەتی سەردەمی شەڕ بوو... بەڵام دوو پۆلیسەکە وایان دانا کە عەریفێك بەم دەست کورتیەوەی توانای کڕینی ئەو پارچە تەکنەلۆژیا گرانبەهایەی نابێ....

ئافرەتێکی کورتە باڵا بە دەنگیانەوە هات، ئافرەتێکی قەڵەو، بەروانکەیەکی لەبەر کردبوو، منداڵێکیشی بەباوەشەوە بوو، بە دوو چاوی زەقو کراوەیەوە ڕوانیە دوو پۆلیسەکە، ((ڕوس)) سەری سووڕما لە قسەکانی پۆلیسەکان. داوای لێکردن بێنە ژوورەوەو ڕادیۆیەکی منداڵانیان پێ نیشان دا ((دەبێ ئەمە ئەو ڕادیۆیە بێ کە هاوسێکە

دیتبێتــی؟)). پۆلیــسەکان بزەیــان هــاتیۆ وتیــان: ((ڕەنگــە!)) داوای لێبوردنیـان لـە ئافرەتەکـە کـردو ڕۆیـشتن، ماوەیـەکی زۆر تێپـەڕی بـەر لـەوەی بیریـان بکەوێتـەوە کـەوا جارێکیـان لەگـەڵ زیـرەکترین سـیخوڕی یەکێتی سۆڤێت لە بەریتانیا بەیەك گەیشتن. وەکو هەموو جارێك و وەك شـتێکی ئاسـایی ((روس کوزبنـسکی)) بەتـەواوی ڕۆڵـی خـۆی گێـڕا، بـەجل و بـەرگی کـۆن و سـڕەوەو وەکـو دایکێـك کـە خـەریکی پـەروەردە کردنـی کۆرپەکەیـەتی، ئەمـە یەکـەم جار نـەبوو ئـەو ئەکتـەرە دوژمنـانی هەڵخەڵەتێنێ......

((کوزبنـسکی)) لـە پـشتی ئـەو کەسـایەتیەوە کـە خـۆی نیـشاندا، ژیـانی بەتەواوی بۆ شیوعیەت تەرخان کرد، لە خێزانێکی کۆمۆنیستیدا لە دایك ببـوو. بـاوکی نـاوی ((ریـن)) بـوو، ئـابووری نـاس بـوو، لـە ئەندامـە پێشەنگەکانی حیزبی شیوعی ئەڵمانی بوو، براکەشی ((جورجین)) هەروا کۆمۆنیست بوو. ((رەوز)) لە ساڵی ١٩١٧ز گەنجێتی چووەە ناو حیزبەوە لەهەمان ساڵدا، بۆ نیویۆرك چووو لەوێدا ئۆفیسێکی بڕێوە دەبرد، لـەوێ چاوی بە ((رودلـف همبـورگر)) دەکـەوێت، کە لـەو کاتـەدا ئەندازیاری لـە ئـەمریکا دەخوێنـد، یـەکتریان خۆشویـست و بوونـە ژن و مێـرد.... سـاڵی ١٩٣٠ مێردەکەی لە شنگهای بوو ((رەوز))یش چووە بۆ ئەوێ.

((همبورگر)) کۆمۆنیست نـەبوو، چاوی لە بیرو بـاوەڕی ژنەکـەی پۆشـی، بەڵام ڕازی نەبوو لە شنگهای کاری سیاسی بکـات. قـەبوڵی نـەبوو ژنێکـی ئـەڵمانی بەشـداری خـۆ پێشاندانەکان بکـات و لەگـەڵ پۆلیـسدا ڕووبـەڕوو ببێتـەوە، دروشـم بـەرز بکاتـەوەو لـە شـەقامەکاندا هـاوار بکـات. ((رەوز)) گـوێی بـە نـاڕەزابوونی مێردەکـەی نـەدا، زۆری نـەبرد، کەوتـە کـارکردن لەگـەڵ ڕێکخـراوی کرێکـارە بیانیەکانـدا لـە شـارەکەدا... زۆری نەخایانـد ناوبـانگی دەرکـردو بـووە کەسـایەتیەکی ناسـراوو دیـار لـە جیهـانی

کۆمۆنیستی نهێنیدا... زیرەك بوو، چوار زمانی دەزانی، زۆریش بوێرو چاو نەترس بوو، لەوانەبوو کە ئەوانەی کەسانی هەڵبژاردە دەقۆزنەوە بۆ سیخوڕی لەبەرچاو بوو، لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٣ز، ((ریتشارد سورج)) بۆ موخابەراتی سۆڤێتی پاڵاوتی، ئەو دەمە لە چین دەژیا.... ((سورج)) پێشبینی ئەوەی بۆ کرد کە پاشە ڕۆژێکی دیاری دەبێت لە جیهانی سیخوڕیدا. بۆ مۆسکۆی نارد، تا مەشق بکات و ڕابهێنری لەسەر شفرەو پەیوەندیکردن بەبێ تەل. سەلماندی کە قوتابیەکی لێهاتووە. دوای ساڵێ کە گەڕایەوە چین، ((سورج)) بەرپرسیارێتی زۆرتری پێدا، بەڕێوەبردنی شانە سیخوڕییەکانی خستە ئەستۆی.....

لەساڵی ١٩٣٥ز ((کوزبنسکی)) لە موخابەراتی سۆڤێتەوە فەرمانی پێدرا کە مێردەکە تەلاّق بدات ((رودولف همبرگر)) فەرمانەکەی جێ بەجێ کرد. شووی کردە سیخوڕێکی سۆڤێتی ناوی ((ئەلفرید شولتز)) بوو، کە لە چین کاری دەکرد، ((شولتز)) دوای دوو ساڵ لەو پاکسازییەی کە ستالین بەرپای کردبوو، لەبەرچاو دیار نەما. ژنەکەیان ئاگادار کردەوە کەوا مێردی دووەمی خائین بوو، زۆر بە هێمنی و خوێن ساردییەوە وتبووی: هەڵواسینی کارێکی ڕەوابوو.... ئیتر بە بێوەژنی ژیاو منداڵێکی بەخێو دەکرد.

((کوزینسکی)) کارێکی زۆری بۆ موخابەراتی سۆڤێتی ئەنجامدا، مۆسکۆ پەیتا پەیتا زنجیرە تۆڕێکی لە ئەوروپا دادەمەزراندو ئاراستەی ئەڵمانیای نازی دەکرد، ناویان لێنا ((ئۆرکسترای سوور)) موخابەراتی سۆڤێتی پلانێکی بۆ ((کوزینسکی)) دانا کە ڕۆڵێکی سەرەکی تێدا دەبینێ، بۆ ((وانزیج))یان نارد، دواجار ساڵی ١٩٣٨ز ڕایان سپارد لەنێو سەربازەکانی بەریتانیادا ئەوانەی کۆمۆنیست بوون کرێگرتە بگرێ بەتایبەتی ئەوانەی بەشداری شەڕی ناوەخۆی ئیسپانیایان کردبوو،

لەناو سەربازە بەریتانیە کۆمۆنیستەکاندا ((ئەلکساندەر فوت))یان هێنایە ناو موخابەراتی سۆڤیتیەوە. شارەزاییەکی باشی لە بەکارهێنانی بێ تەلدا هەبوو، دواجا ئەم پیاوە چووە ناو حەلقەیەکی موخابەراتی سۆڤێتی لە سویسرا، ئەڵمانەکان ناویان نابوو ((سێ سوورەکە)).

کاری داهاتووی ((کوزینسکی)) زۆر ئەستەم بوو، فەرمانی پێدرا بۆ بەریتانیا بڕوات و لەوێدا لقێکی ((ئۆرکسترای سوور)) دامەزرێنێ... چونکی هاوڵاتیەکی ئەڵمانی بوو، نەیدەتوانی بێ پاسەپۆرت بڕواتە بەریتانیاوە. حکومەتی نازی پاسەپۆرتی بە شیوعیەکان نەدەدا. ((کوزینسکی))ئەم کێشەیەی بەوە چارەسەر کرد: داوای لە شیوعیە بەریتانیەکان کرد بیخوازن تا بتوانێ پاسەپۆرتی بەریتانی بە شووکردنەکەی وەرگرێ.

((فوت)) داوای لێبوردنی کرد، ((لیون بورتون)) ڕازی بوو، کە گەنجێکی کۆمۆنیست بوو و لە شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا بەشداری کردبوو، لە ساڵی ١٩٤٠زدا، لەگەڵ میردی تازەیدا لە شارۆچکەی ((کیدینگتون)) لە نزیکی ((ئۆکسفۆرد)) جێگیر بوو. ((بورتون)) بۆ هێزی ئاسمانی بەریتانی بانگی کرا، موخابەراتی سۆڤێتی داوای لە ((ڕەوس)) کرد ماوەیك هەروا بمێنێتەوە..

لەو کاتەدا خەریکی بەخێوکردنی منداڵەکەی بوو کە ((شولتزن)) بوو. لە ((بورتون))یش منداڵێکی بوو، دوو منداڵی بەخێ دەکرد کە لە مایسی ساڵی ١٩٤١ز فەرمانی پێ درا دەست بەکار بکات، دەبوایە سەرەڕای ئەرکی ماڵەوە کارە سیخوڕییەکانیشی جێ بەجێ بکات. بەسەرکەوتویی کارەکانی ڕادەپەڕاند. لە پێشدا تۆڕێکی سیخوڕی لە خێزانەکەی خۆی پێکهێنا، کە دوای ئەوەی هیتلەر دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت هەموویان

هەلاتبوون، هەموو خێزانەکە ئامادەبوو وەکو ئەرکێکی شیوعیەکی دڵسۆز فەرمانەکان بەجیٚ بهێنن. باوکی مامۆستای ئابووری بوو لە ئۆکسفۆرد، پەیوەندییەکی بەربلاوی لەگەڵ کۆمەڵگای بەریتانیادا هەبوو، دەستی کردە کۆکردنەوەی زانیاری سیاسی لەسەر ئاستێکی بەرز. براکەی ((جیورجین)) لێکۆلەرەوەیەکی ئابووری بوو لە وەزارەتی فرۆکەوانی بەریتانیادا. کە زانیاری سەربازی گرنگی دەکەوتە بەر دەست. کە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشداربوو لە شەڕدا، چووە مەکتەبی خەدەماتی ئیستراتیجی لەوێش زانیاری گرنگتری دەست دەکەوت. لە نزیکی ماڵی خۆیان ژنەکەی بە ئەفسەرێکی گەورەی هێزی ئاسمانی شاهانەی ناساند کە بە نهێنی بڕوای بە کۆمۆنیست هەبوو. کە نموونەی نوێیٚ تەکنەلۆژیایی هێزی ئاسمانی بەریتانیای بۆ پەیدا دەکرد، لەگەڵ ڕاپۆرتی هونەریداو ((رەوس))یش بۆ مۆسکۆی دەناردن.

هەر لەو شارۆچکەیەوە کە تیایدا دەژی، ((رەوس)) پەیوەندی بەو ئەندامە کۆمۆنیستە ئەڵمانیانەوە دەکرد کە پەناهەندە کرابوون لە بەریتانیا، و بە شێوەیەکی ڕێك شانەکانی کۆدەبوونەوە. دوای هێرشی ئەڵمانی ساڵی ١٩٤١ز بۆ سەر یەکێتی سۆڤێت بە پەرۆشەوە بوون بۆ یارمەتیدانی مۆسکۆ. ((رەوس)) لە تۆڕی زاناکاندا ڕێکی خستن، بەمە بەرهەمیان زۆرتر بوو... لە کۆتایی ساڵی ١٩٤١ز، ((رەوس)) چاوی بە زانایەکی گەنجی ئەڵمانی کەوت، کە لە ساڵی ١٩٣٣زوە، کۆچی کردبوو، لەوکاتەوە کە هیتلەر دەسەلاتی بەدەستەوە گرتبوو، گەنجەکە بەردەوام بوو لە ئامادەبوونی کۆبوونەوەکانی حیزب، بە ((رەوس))ی وتبوو، کەوا زۆر حەز دەکات یارمەتی یەکێتی سۆڤێت بدات، ماوەشی نەبوو زۆر بجولێتەوە. چونکی بۆ ماوی ساڵێك گیرابوو.

بەریتانیەکانی لە یەکیٚ لە پرۆژەکانی کە بۆ بۆڕی دانرابوو، هەندیٚ کاری

پێ سپاردبوو... گەنجەکە، هەستی کرد کەوا ((رەوس)) گوێی بە داواکانی نادا، ((رەوس))ی ئاگادار کردەوە، کەوا ئەو پڕۆژەیەی ئەم کاری تیا دەکات، پەردەیەکە بۆ داپۆشینی نهێنیەکانی هونەری کە بەریتانیا و ئەمریکا پێکەوە کاری لێ دەکەن. ئەویش دروستکردنی ((بۆمبی ئەتۆمیە)) پرسیاری لە ((رەوس)) کرد ئایا ڕوسیا مەبەستی لەمەدا هەیە.....

بێگومان بەلای ڕوسیاوە زۆر گرنگە.. بەمجۆرە ((فوتشس)) بووە ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە تۆڕی ((کوزینسکی))...

((رەوس)) کەوتە خەم و کیشەی ناردنی هەموو ئەو زانیارییانە بۆ موخابەراتی سۆڤێتی سەرەکی لە بالیۆزخانەی ڕوسی لە لەندەن.....دەتوانێ زانیاریەکی یەکجار زۆر بنێرێ... بەلام زانیارییە پەلەکان دەبێ بەبێ تەل بنێردرێ. یانی پێویستی بە بێ تەل هەیە، ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو لەسەردەمی شەڕدا. چەند جارێ لەگەل کوڕەکەیدا بە شەمەندەفەر سەفەری دەکرد، لەگەلّ منداڵەکەدا خۆی نیشان دەداو دەردەخست کە منالەکە لەیستۆکێکی ورچی گەورەی هەمیشە پێ دەبوو، بۆیە دیمەنەکە ئاسایی بووو سەرنجی کەسی ڕانەدەکێشا. لە یەکێ لەو سەفەرانەی چاوی بە یەکێك لە موخابەراتی سۆڤێتی کەوت و هەندێ شتی خێرا پێدا. کە بەشێکی ڕادیۆیەك بوو، رەوس لەناو بووکە شووشە ورژەکەدا شاردییەوەو بەترەین گەرایەوە ماڵەوە...

((رەوس)) دەستی کردە ناردنی زانیارییەکان، بەلام زۆر بە وشیاری. دەیزانی دەزگای بەرگریکاردنی سیخوڕی بەریتانی زۆر وشیارە، بۆیە زۆر بە کورتی نامەکانی دەنارد. بۆ زیاتر چاوبەستەکردنی دراوسێکەیان، داوای لێکرد یارمەتی بدات تا پەتی چل هەلّواسینەکەیان

دامەزرێنن، کە لە ڕاستیدا ((ئەنتی)) رادیۆ بوو، چونکی بە وریایی کاری دەکرد، ئاشکرا نەبوو. هەرچەندیش زانیاریەکی زۆری دەنارد، بەڵکو توانی لە کارەساتێکی گەورە خۆی ڕزگار بکات...........

لەساڵی ١٩٤٧ز ((فوتش)) گیرا، بەتۆمەتی سیخوڕی دەستگیریان کرد، دانی بە سیخوڕی خۆی نا، بەڵام ناوی ڕەوس ((کوزینسکی)) نەهێنا لە دانپێدانانەکەداو ڕزگاری بوو. دوای دووز ساڵ، لە ساڵی ١٩٤٧ز ((ئەلکساندر فوت)) کە شیوعیەکی بەریتانی بوو نهێنیەکەی ئاشکرا کرد.

ناوی هەموو ئەو سیخوڕە سۆڤییەتانەی ئاشکرا کرد کە پەیوەندی پێوە کردبوون، تا ناوی ((کوزینسکی))یشی هێنابوو، بەڵام وتبووی لە ساڵی ١٩٤٠زوە، پەیوەندی بە موخابەراتی سۆڤیەتیەوە نەماوە، لەبەرچەند هۆیەك وای گوتبوو تا بە شێوەیەك لە شیوەیەکان ڕزگاری ببێ..پیاوانی بەربەرەکانی سیخوڕی بەریتانی هاتبوونە بەر دەرگاکەی و دەستیان کردبوو بە پرسیارکردن لەبارەی پەیوەندییەوەی بە موخابەراتی سۆڤیەتیەوە. هەندێ کاری ساوێلکانەی کردبوو، کەوایان بینیبوو ڕۆیشتبوون و لەبەر خۆیانەوە دەیان پرسی: تۆ بڵێی ((فوت)) بەهەڵەدا چووبێ. بڕوایان نەدەکرد، کە ژنێکی کورتە باڵای چاو زەقی ساویلکە وا پەیوەندی بەکاری سیخوڕییەوە هەبێ، نەك ئێستا بەڵکو بەر لە ساڵی ١٩٤٠ یش.......

بەر لەوەی موخابەراتی بەریتانی بیر لە هەنگاوی داهاتووی بکاتەوە، ((کوزینسکی)) لای ئاشکرابوو کەوا ڕۆڵی ئەم کۆتایی پێهات. لەگەڵ میردەکەی و دوو منداڵەکەیدا سەفەریان بۆ ئەڵمانیا کرد، بەبیانوی سەردانی خزمانیانەوە گوایە بۆسەردانی دەڕۆن. بەڵام نەگەرانەوەو ئیتر کەس نەیبینین، لە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتدا دیار نەمان.........

موخابـەراتی بـەریتانی بەتـەنگ دیارنـەمانی ((رەوس))ەوە نـەهاتن. _ لەوبڕوایەدابوون _ هەر زۆر زۆر کارێك بووە لە ئاستێکی نزمداو سالأنێك لەمەوبەریش بووە، لەو بڕوایەدا نەبوون زیانی بە ئاسایشی بەریتانیا گەیاندبێ، بە تایبەتی ئەو لە ساڵی ١٩٣٩ز بۆیان ئاشکرا بوو کەوا زانیارییەکی یەکجار زۆر لە باڵیۆزخانەی ڕوسیەوە لە لەندەن بۆ مۆسکۆ نێرراوە...

سەرۆکی ئەو تۆڕەش کە زانیارییەکانی کۆ دەکردەوە، لە سالأنی شەڕدا، ناوێکی نهێنی هەیە کە ((سونیا))یە..... دوای پشکنین و بەدواداچوون، دەرکەوت ئەو ((سۆنیا))یە، ((رەوس موزینسکی))یە ئەو ژنە بالاّ کورتە قەڵەوە چاو زەقە کە سالأنێك لەمەوبەر خەڵەتاندنی.....

((کوزینـسکی)) لـە ئـەڵمانیای ڕۆژ هـەلأت وەکـو هاولأتیـەکی دڵـسۆز پابەنـدی ڕژێمەکـە مایـەوە.... لەکارێکـدا دایـان مەزرانـد پەیوەنـدی بـە سـیخوڕییەوە نـەبوو. کـە سـاڵی ١٩٨٢ز خانەنـشین بـوو، دەسـتی کـردە نووسـینی یادەوەرییـەکانی، کـە بەڕێوەبەرایـەتی موخابـەراتی سـۆڤێتی بەچـاپی گەیانـدو نووسـیبووی ((ئەگـەر پێـنج ئافرەتـان وەکـو سـۆنیا هەبووایە شەڕەکە زووتر تەواو دەبوو))

## ♦ ♦ ئیگور گوزینکو یەکەم پیاو ♦ ♦

ڕووسی بوو، تەمەنی ٢٦ ساڵ بوو، لەژێر دوو ناودا خۆی شاردبووەوە، ((کـوربی)) و ((کـلارك)). نـاوی خوازراویـشی ((ڕیتـشارد بـراون)) بـوو. چووە کەنـەدا، لـە ڕۆژنامـەی ((ئۆتـاوا)) چیرۆکێکی کورت بلأوکرابوەوە، چیرۆکەکەی لـە ڕۆژنامەکە بڕی و لـە هاوڕێکـانی سـەرکارەکەی دەیپرسـی ((ئەمە سەیرو سەمەرەترین شت نییە بەلای ئێوەوە؟...

چیرۆکەکە ڕوداوێکی ئاسایی شاری ((ئۆتاوا)) دەگێڕێتەوە. کە لـە بارەی بازرگانێکی یۆنانی میوەوەیە، داوای زیانەکەی لـە شارەوانی کردووە بە

هـۆی دروسـتکردنی ڕێگـاوە گوایـە زیـانی بـە بازرگانیەکـەی ئـەو داوە.
((ئیگور گورینکۆ)) چەند جاریێ خوێندییەوە، هەر جارێك دەیخوێندەوە، زیـاتر سەرسـام دەبـوو، چـونکی، کـارێکی وا لەلایـەن هاولاَتیـەکی سۆڤیێتیەوە جێگای بڕا پێکردن نەبوو....
چیرۆکی بازرگانی میوەکە، وانەیەك بوو بۆ ئەو کە لـە ڕۆژئاوا کـارێکی وا دەبێتو بۆیە بـووە هـۆی گـۆڕانی ((گوزینکو)) سـەری لـەو جیاوازییانـەی نێـوان ژیـانی هاولاَتیـەکی کەنـەدیو هـەژاریو نـەداری هاولاَتیـەکی سـۆڤیێتیدا سـوڕما، هەرچـەند لایـەنی ڕۆشـنایی ژیـانی ئـەورووپای دەدی، زیاتر بیروباوەری شیوعیەتی دەبێزانو لێی دوور دەکەوتەوە.
((گوزینکـو)) وەکیلـی موخابـەراتی سـۆڤیێتی بـوو، بارەگاکەشـی لـە باڵیۆزخانەی سۆڤیێتی لە ئۆتاوادا بوو، وەکو نووسـەری شفره _ کۆد _ ی سیستەمی پەیوەندییە دبلۆماسیەکان لە باڵیۆزخانەکەدا کاری دەکرد.
لە مایسی ١٩٤٣ز گەیشتە ئۆتاواو یەکەم کاری لە دەرەوەی ڕوسیا دوای دەرچوونی لە قوتابخانەی سیخوڕی، گرتە دەست.
ساڵی ١٩٤١ز سەربازێکی گەنج بوو، لـە پەیوەندییـەکانی بـیێ تـەل کـاری دەکـرد. کـە زیرەکـی لەکارەکەیـدا نیشـاندا بەتایبـەتی لـە بـواری کـۆد _ شـفره _ دا، سـەرنجی ئەوانـەی ڕاکێشا کـە کەسانی وایان بۆ سیخوڕی دەقۆستەوە.
دەبوایە ((گوزینکو)) بیزانیبا، کەوا موخابەراتی سۆڤیێتی پێویستیەکی زۆریان بەو کەسانە هەیە لە کۆددا شارەزان.
چـونکی داگیرکردنـی یـەکێتی سـۆڤیێت لەلایـەن ئەڵمانـەوە، موخابـەراتی سۆڤیێتی ناچارکرد کە هەرچـی لـە توانایـدا هەیـە بەگـەڕی بخـات. یـەکیێ لەوانە بەکارهێنانی سەدان سیخوڕو کرێگرتـە، شـیوعیەکان بـۆ ئـەم کـارە خۆیـان تـەرخان کـرد، هـەبوو کۆمۆنیست نـەبوو، بـەڵام دژی هیتلـەر بـوو.

بێتەڵ و شارەوایانی شفرە ڕەگەزی بنەڕەتی بوون لە موخابەراتدا لە جیهانێکدا کە پێویستی بەخێرایی و دەست و بردی هەبوو. تا بەزووترین کات نامەکان بگاتە مۆسکۆ، لە ئۆتاوا ((کوزینکو)) زانی کەوا وێستگەکانی موخابەرات لەوێدا گرنگی خۆیان هەیە. لێرەشەوە پەیوەندی بەهەموو ئەمریکای باشوورەوە دەکرێت. تەنها لە کەنەدا، ٢٥ وێستگەی موخابەراتی هەبوو، شوێنەکانیان زۆر بەوردی هەڵبژێرابوون.

کە گەیشتە ئۆتاوا سەری سوڕما کە دانیشتوانەکەی لەچی ژیانێکدا دەژین و مۆسکۆ بەهۆی شەڕەوە دانیشتوانەکانی برسی و لێکەوتە بوون. سەری لەو ئازادییە سوڕدەما کە دانیشتوان تیادا دەژیان، ڕوسیاش لە ژێر زەبرو زەنگی ستالیندا دەینالاند، لێرەوە ئەوەی لە مێشکیان دایە دەتوانن دەری بڕن و ڕەخنە لە حکومەت بگرن....

((کوزینکو)) هەستێکی سەیر دایدەگرت کاتێ بەشارەکەدا دەگەڕا، هەستی بە ئازادی دەکرد کە مۆسکۆ نەیدەبینی. بۆ هاوڕێکانی ئەمەی دەگێڕایەوە، دەیزانی کارێکی ترسناکە چونکی ((کوزینکو)) نووسەری شفرە بوو. مانای وایە ئەو نهێنیانەی بۆ باڵیۆزخانە دێ، یان دەنێررێت ئاگادارە. لەلایەکی ترەوە، ترسی ستالین باڵی بەسەر موخابەراتی سۆڤێتیدا دادابوو، ئەو ١٠٠ کەسەی لە وێستگەکە کاریان دەکرد، ڕاسپێرابوون چاودێری یەکتر بکەن. هەر شتێك دەبینن سەرووی خۆیان ئاگادار بکەنەوە.

دیارە یەکێ لە باڵیۆزخانەکە خەبەری لە ((کوزینکو)) دابوو، چونکی لە ئەیلولی ساڵی ١٩٤٤ بەپەلە بۆ مۆسکۆ بانگ کرا بۆ وتووێژ لەسەر هەندێ کاری دیاریکراو... ((کوزینکو)) ماوەیەکی زۆر لە موخابەرات کاری کردبوو، دەیزانی مانای ئەو نامەیە چییە.. زانی لە تەنگژەیەکی مەترسیدار دایە، ڕەنگە گومانی لێ کرابێ و گوایە بەلای ئایدۆلۆژیەتی

ڕۆژئـاوادا مـەیلی پەیـدا کردبـێ، بـەڵکو ڕەنگـە مەترسـیەکی لـەوە گـەورەتریش بـێ. ((کوزینکـو)) جارجـار دەیبیـست کـەوا موخابـەراتی سـۆڤێتی ئـەو نووسـەرانە بـانگ دەکـەن کـە خـەریکی شـفرەن، چـونکی نهێنیان لەلا هەیە ڕەنگە ون بکرێن کاتێ بۆ مۆسکۆ بانگ دەکرێن......
گوایە دەڵێن موخابەراتی سۆڤێتی ئەوانەی لە کۆد کاردەکەن یەکە یەکە دەیانکوژێت و کەسانی دیکە لە جێگایان دادەنێن هۆکەشی ئەوەیە کە نهێنـی زۆریـان لەلایـە، مۆسـکۆ نایـەوێ بـەهۆی یەکێکـەوە کـە شـفرە دەنووسـێ زیـانی لێ بکـەوێ. یـان بـچێتە پـاڵ دوژمنـان و ئـەوەی دەزانـێ و گوێی لێ بووە لە نهێنی ڕوسیا ئاشکرایان بکات، تا دەگاتە ئەو کارە نا یاسـاییانەی باڵیۆزخانـەکان دەیـانکرد و ئـەو سـیخوڕانەش کـە لەگـەڵیا کاریان کردووە ئاشکرا بکات.
بەرپرسـەکانی ((کوزینکـو)) لـە ئۆتـاوا نـەیان هێـشت بگەڕێتـەوە، بـە بیانووی ئەوەی شارەزایی ئەم لای کەسـی تر نییە، مۆسکۆ بە مانەوەی ڕازی بوو.
بەرپرسەکانی گوزینکو لە ئۆتاوا، زیادەڕۆییان نەکرد کە وتیان ((کاتێکی هەستیار)) ە چونکی وێستگەی ئۆتاوا هەموو توانای خۆی بۆ کارێکی تر دانا. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەکریکاو بەریتانیا لە پرۆژەیەکی نهێنیدا هاوەبەش بوون. ئەویش دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی بوو..
ئەوە نهێنیەك بوو لە ڕوسیایان شاردبووەوە، داوا لە موخابەراتی سۆڤێتی کرا کە ئەو پرۆژەیە بەهەر نرخێ دەبێ ئاشکرا بکەن. ((ستالین)) ماوەی بە هاوپەیمانەکانی نەدەدا چەکێ دروست بکەن ڕێگایان پێ بدا دەست بەسەر جیهانی دوای شەڕدا بگرن...
موخابـەراتی سـۆڤێت بـۆ ئـەم مەبەسـتە پرۆسـەیەکی ئامـادەکرد بـەناوی ((پرۆسەی کاندی))، هەموو توانیان خستە سەر کەنەدا، کە کۆمـەڵێك لـە

زانایـان خـەریکن کێـشەی بەرهـەمهێنانی یورانیـۆم چارەسـەردەکەن. ((کوزینکو)) چەند نامەیەکی موخابەراتی سۆڤێتی بۆ تۆڕی پەیوەندییە بێ تەلەکان نارد، داوا لـە پیـاوانی خۆیـان دەکـات هـەر زانیارییـەکیان سەبارەت بـە پـرۆژەی بـۆمبی ئـەتۆمی یـەوە دەست کـەوت بینێرن. دوای چەند مانگێك بـۆی دەرکـەوت کـەوا موخابـەراتی سـۆڤێتی سـەرکەوتنی گـەورەی وەدەسـت هێنـاوە لـەم باریـەوە... دەسـتی کـردە نـاردنی ئـەو کۆمەڵـە زۆرەی زانیارییـە، وادەردەکـەوت ئـەو زانیاریانـە ڕاسـتەوخۆ لـەو سیخوڕانەوە دەست کەوتوون کە لە پرۆژەکەدا کار دەکەن. ((کۆزینکو)) دەری بڕی، ئەو کەسە سەرەکیە کە زانیارییـەکانی داوە سـیخوڕەو نـاوی نهێنی ((ئلیکس))ەو یەکێکە لەو زانایانەی لەو چرۆژەیەدا کار دەکەن.

لەسـەرتای هـاوینی سـاڵی ١٩٤٧ز ((کوزینکو)) ڕاپـۆرتێکی سـەرۆکەکەی کۆلۆنێل ((نیکۆلای زابوتین)) نارد، ناوی نهێنی ((گرانت)) بوو، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کەوا موخابەراتی سۆڤێتی توانیویەتی بچێتە ناو پرۆگرامی ئەمریکیەوە.

((زابـوتین)) هـەر بـەوەوە نەوەسـتا کـە مۆسـکۆ بەدوورودرێـژی لـەوەی لـە ((لۆس ئالاموس)) لە نیومکسیکۆ، ڕوودەدات ئاگـادار بکاتـەوە، مێـژووی دیـاری کـراوی یەکـەم تاقیکردنەوەشـی بـۆ دەرکـەوتبوو لەگـەڵ کـاری هونەری چۆنیەتی دروستکردنیشی زانی...

لـە هـەمووی گـرنگتر، نموونـەی ((یورانیـومی پیتـاو کراویـشی)) دەسـت کەوتبوو ((یـو _ ٢٣٥)) فڕۆکەیـەکی تایبـەتی لـە مۆسـکۆوە هـات تـا ئـەو یۆرانیۆمە بۆ یەکێتی سۆڤێت ببات، کە بۆ پێشخستنی بەرنامـەی چەکی نـەوەوی سـۆڤێتی بـەکار هێنـرا..... ڕێـز لێنـانو دیـاریو پـارەو پلـە بەرزکردنـەوەی دەسـتی پێکـرد بـۆ وێستگەی موخابـەراتی سۆڤێتی لـە ئۆتاوا لە پاداشتی ئەو سیخوڕییە ئازایانەدا.. بەڵام ((ئیگـور کوزینکو))

پاداشت نەکراو ڕێزی لێ نەنرا. زانی هێشتا گومانی لێ دەکەن، زۆریش نابا لەوانەیە بیگەڕێننەوە بۆ مۆسکۆ، ئەگەری ئەوە هەیە گوللەیەکی بەسەرەوە بنێنن......

((کۆزینکو)) بڕیاریدا هەڵبێ، بەلام لەو کردەوە ڕەنگە کەنەدا بیداتە دەستی مۆسکۆوە. چونکی هەردووك هاوپەیمان بوون. بڕیاری دا تا بۆی دەکرێ بەڵگەنامەی تایبەتی بەکارە سیخوڕییەکانی سۆڤێتی لەسەر کەنەدا لەلای خۆی دانێ. ئەگەر کەنەدییەکان بزانن یەکێتی سۆڤێت سیخوڕیان دەرهەق کەنەدا کردووە، لەوانەیە تەسلیمی ڕوسیای نەکەن.

ئێوارەی ٥ ئەیلولی ١٩٤٥ز، ((کۆزینکو)) کارە ئاساییەکانی لە ژووری شفرەدا تەواوکرد، لە باڵیۆزخانەکەدا هاتە دەرو ١٠٩ بروسکەی لە جانتا دەستیەکەیدا بوو، دەیزانی سیستەمی ئەمنی باڵیۆزخانەکە چەند توندە، دەیزانی دوای چەند سەعاتێکی تر دیار نەمانی ئەو بروسکانە ئاشکرا دەبێ. بۆیە کاتێکی دیاریکراوو کەمە لەبەردەمدا بوو بۆ جێ بەجێ کردنی پلانەکەی.

((کوزینکو)) ترسی لێ نیشت کاتێ بۆی دەرکەوت نەیتوانی کەنەدییەکان تێ بگەێنێ کەدەیەوێ چی بکات. یەکەم جار چووە ڕۆژنامەی ((ئۆتاوا جۆرنال)) و لەدەرگایانی دا، ئەو ڕۆژنامەیەی چیرۆکی میوە فرۆشەکەی تێدا خوێندەوە.

نووسەری ڕۆژنامەکە لە مەبەستو کارەکەی ((کوزینکۆ)) تێنەدەگەیشت داوای لێکرد بڕواتە دەرەوە.

ئەمجا چووە ئۆفیسی حکومی ترەوە، لەمانەش نا ئومێد بوو، تووشی نا ئومێدی هات، خۆیو ژنەکەیو منداڵێکی دوو ساڵانی لەماڵەکەی خۆیاندا خۆیان دوو ساڵ شاردەوە. لەپڕ پیاوانی موخابەراتی سۆڤێتی لە دەرگاکەیان دا داوایان لێ کرد- دەرچێتە دەرەوە. ((کوزینکو)) بۆ

هاوسـێیەکی گێڕابـووەوە، کـە ئەفـسەرێکی فڕۆکـەوانی کەنـەدی بـوو، داڵدەی دابوو خۆی و منداڵەکانی لە ماڵەکەی خۆیدا پاراستبوو. لەوێوە گـوێی لێ بـوو وا چـوار لــە موخابــەراتی ســۆڤێتی دەرگــای ماڵەکــەی دەشکێنن و دەچنە ژوورەوەو دەست بە پشکنین دەکەن.

ئەو ئاژاوەو ژاوەژاوەی موخابەراتی سۆڤێتی لە قازانجی ((کۆزینکو)) دا بـوو، پۆلیـسی کەنـەدی هـاتبوون، زانیبوویـان ئـەوەی دەوری گـیراوە یـەکێکی ئاسـایی نییـەو ئـەو بەڵگەنامانـەش پیـاوانی باڵیۆزخانـە بـۆی دەگـەڕێن گـرنگن، لەوکاتـەدا بـە ڕێکـەوت سـیخوڕی لێهـاتوو ((ولـیم ستیفسون)) پەیدا دەبێ، کە لە کەنەدا لە دایك بووەو پلەیەکی بەرزی هـەبوو لـە موخابـەراتی بـەریتانیا لـە نیویـۆرك، هەواڵەکـە بلاوبـووەوە، دەزگــای کەنەدیــشی لێ ئاگــادار بــووەوە. کــە ((ستیفنــسون)) بــە مەسەلەکەی زانی، هەستی کرچی ڕوویداوە، دەستی کرد بە پەیوەندی لەگەڵ سـەرەوەی خۆیـدا، تـوانی سـوارە پۆلیـسی کەنـەدی و ئاسایـشی کەنەدی بجووڵێنی تا ((کوزینکو)) و خێزانەکەی بخەنە ژێر پارێزگاری خۆیانەوە. لەهەمان کاتدا ڕوسەکان داوایـان دەکـرد ((کۆزینکو)) تەسلیم بکـەن گوایـە پارەیـەکی زۆری لـە باڵیۆزخانەکە دزیـوە، دەبـێ بـۆ مۆسکۆ بنێردرێتەوە....

کەنەدییــەکان داوای ســۆڤێتیەکانیان ڕەتکــردەوە، چــونکی زانییــان نێچیرێکی گـرنگ کەوتۆتـە بـەر دەستیان. دەبـێ کارێکی بـۆ بکـرێ و ئـەو ((٢٥)) کەنەدییـە مـە بووبوونـە سیخوڕی موخابـەراتی سۆڤێت دەستگیر بکـرێن، کارەکـە گـەورە بـوو، سـەرۆکی ئـەمریکایان لێ ئاگـادار کـردەوە ((ترومـان))، کـەوا نهێنـی بـۆمبی ئـەتۆم کـە ئـەمریکا بەتـەما بـوو بیـست سـاڵی دیکە ئاشـکرا نـەبێت ئاشـکرا بـووە، ئاگـاداری بـەریتانیا کرایـەوە کـەوا یـەکێ لـە زاناکـانی بـۆ ڕوسیا کـار دەکـات، دەرکـەوت کـەوا دکتـۆر

((ئالان نان مای)) ئەو کەسەیە کە ناوی نهێنی ((ئەلیکس)) بەکار دێنێ....

دکتۆر ((مای)) ساڵی ١٩٤٦ز حوکم دراو تۆمەتی سیخوڕی لەسەر سەلمێنرا، ١٠ ساڵ حوکم درا، دانی پێدا نا کەوا یارمەتی شیوعیەکانی داوەو موخابەراتی ڕوسیا بەکاری هێناوە لە ساڵانی شەڕدا تا زانیاری زانستی بەریتانیا بداتە سۆڤێت. سەیرو سەمەرەترین چیرۆکی ((مای)) و نهێنی بۆمبی ئەتۆمی، ئەو هەموو کارەی بۆ سۆڤێت ئەنجام دا لەبەرامبەر ٧٠٠ دۆلارو بوتڵی ویسکی ئەمەش سەیرترین ڕێکەوتنە لە مێژووی سیخوڕیدا.

مەسەلەی ((کوزینکو)) کاردانەوەیەکی خراپی کردە سەر جیهانی ڕۆژئاوا... شەڕی سارد هێشتا دەستی پێنەکردبوو. ڕوس هێشتا لەبەر هاوپەیماناندا بوو کە قوربانیەکی زۆریان دا لە پێناو نەمانو شکست پێ هێنانی هیتلەردا، بەڵام مەسەلەی ((گۆزینکو)) درۆی ئەو هاوپەیمانیەی نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا ئاشکرا کرد. ڕۆژئاوا نهێنی ئەتۆمی لە ڕۆژهەڵات دەشارێتەوە، ڕۆژهەڵات سیخوڕەکانی بەگەڕ دەخات بۆ زانیاری پەیداکردن لە ڕۆژئاوا، و هانی سەدان کەس دەدات خیانەت لە نیشتمانەکەی خۆیان بکەن، ڕۆژئاواش لە ڕۆژهەڵات باشتر نەبوو، ئەوەش ئاشکرا بوو کە گوایە نیزی دوژمنکاری لە نێوانیاندا نییە...

((کوزینکو)) زۆری پێ بوو بە پیاوانی قەڵاچۆکردنی سیخوڕێتی هاوپەیمانان بگەیێنێ: ((ئەمریکا, ئینگلتەرا، کەنەدا، فرەنسا). لە سیستەمی کارکردنو ئەو کەسایەتیانەی لە موخابەراتی سۆڤێت کاریان دەکرد. چی لە مۆسکۆ چی لە دەرەوە.....

((کوزینکو)) گەلێ هەواڵی ناخۆشی بۆ نوێنەرانی موخابەراتی ئەمریکی درکاند... ئەوەی پێ ڕاگەیاندن: کەوا بردەرەکانی لە مۆسکۆ ئاگاداریان

کردۆتەوە کەوا سیخوڕێکی ئەمریکیان قەناعەت پێ کردووە بۆ مۆسکۆ کار بکات، ئەوشیان وتووە کەوا ئەو ئەمریکیە، پلەو پایەیەکی بەرزی لە حکومەتدا هەیە. چونکی ((ویتاگر شامبرز)) بە ئەمریکییەکانی ڕاگەیاندبوو کەوا ((ئالجر هیس)) بۆ ڕوسیا کاری دەکرد. یەکسەر بە گوێرەی وتەکانی ((کۆزینکو)) بیریان بۆ ((هیس)) ڕۆیشت....

هەواڵی ناخۆشیشی بۆ بەریتانیەکا پێ بوو، وتی: بیستوومە سیخوڕێك ناوە نهێنیەکەی ((ئیللی))یەو فەرمانبەرێکی گەورەی قەڵاچۆکردنی سیخوڕی ئینگلیزییە، بەڵام لەوە زیاتر زانیاری دیکەی لەبارەیەوە نەبوو تا ئەو سەرچاوەیە دیاری بکات.... بەڵام بیری کەوتۆتەوە کەوا هەندێ کارمەندی موخابەراتی سۆڤیاتی ئاماژەی ئەوەیان کردووە لەبارەی ئەو کابرایەوە، کەوا لە ڕابردوودا شتێکی ڕوسی هەیە..... بەڵام ئەو موخابەراتە بەریتانیە ((ڕۆجەر هویس)) کە ((کۆزینکو))ی دەدوان، ئەم ئاماژەیەی بە گوێ نەگرت، چونکی ((ئیللی)) ناوی حەرەکی یەکێك لە سیخوڕەکانی کەنەدا بوو کە بۆ موخابەراتی سۆڤێتی لەکاردابوو، سۆڤیەتیش یەك ناو بۆ دوو سیخوڕ دانانی لەیەك کاتدا... دوای چەندین ساڵ گومان کەوتە سەر ئەوەی کەوا ((هویس)) خۆی سیخوڕی موخابەراتی سۆڤێت بووە،

((کوزنیکو)) لەکەنەدا مایەوە، پۆلیسی سوارەی شاهانەی کەنەدی پاسەوانیان دەکرد. ناسنامەیەکی نوێی پێدرا وەکو پەناهەندەیەکی چیکی بەناوی ((ریتشارد براون)) تا لەگەڵ شێوازە سوڵاڤیەکەی بگونجێ. کتێبێکی لەبارەی ژیان ئەزموونی خۆی لەناو موخابەراتی سۆڤێتی نووسی، لەگەڵ چیرۆکی هەڵاتنەکەیدا. هەروەها ڕۆمانێکی نووسی، لەلایەن ڕەخنەگرانەوە پەسەند کرا. سەبارەت بە ژیان لە یەکێتی سۆڤێت. ناوی ڕاستەقینەی خۆی بەسەر هەردوو کتیبەکەیەوە دانا.

((پەیوەندی کوزینکو)) و پۆلیسی کەنەدی ڕێك نەبوو، گەلێ جار بە گلەوگازاندەبوو لەکەم دەرامەتی و ژیانی لە کەنەدا.... یەکێ بوو، پارەی خۆش دەویست، حەزی بە دەوڵەمەندی دەکرد، خەونی دەدی ببێتە سەرمایەدارێك بەلأم کابرایەکی دەست بلأو بوو ئەو خەونانەی نەدەهاتەدی.....

تووشی قەرزاری بوو، تووشی تەراخۆما هات، وەلەئەنجامدا کوێر بوو، لە حەفتاکاندا جارێکی کە بەریتانیەکان سەردانیان کردو، کەوتنە پرسیارو لێکۆڵینەوە لەبارەی دزەکردنی موخابەراتی سۆڤێت بۆ ناو موخابەراتی بەریتانی لەساڵی ١٩٤٥ز کە گوێی لە بەریتانیەکان بوو زۆر توڕە بوو، ئەو ڕاپۆرتانەیان بۆ دەخوێندەوە کە ساڵانی ١٩٤٥ لەبارەی ئەوەوە نووسرابوون.

((کوزینکۆ)) لە مایسی ساڵی ١٩٨٤ز کۆچی دوایی کرد، چەند هاوڕێیەکی ئامادەی ناشتنەکەی بوون. بەپێی ڕەوشتی کۆنی ڕوسی، لە پێش تابوتەکەیدا یەك لەدوای یەك ڕیزیان بەست و دادەچەمین لاشەکەیان ماچ دەکرد. ئەمە ((بەڕێز بڕوانە، کە لە براگەوە هاتووە)).

## ♦ ♦ کلاوس فوتشس دزی بۆمبی ئەتۆمی ♦ ♦

((کلاوس فوتشس)) لە تابلۆیەکی کاریکاتۆر دەچوو لەوەی لە زانایەکی ئەتۆم بچێ... کەڵەگەت، لەڕولاواز، چاویلکەیەکی چوارچێوەی باریکی لەچاو دەنا، ناوچەوانی پان و بەرز، بە لەکنەیەکی ئەڵمانی ئینگلیزی دەدوا، بەمجۆرە بە پێی بۆچوونی ((ولیم سکاردون)) کە یەلێك بوو لە پیاوە زیرەکەکانی موخابەراتی ئینگلیزی لە دواندن و پرسیار لێکردندا.

لەو ڕۆژانەی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٥٠زدا، لە بەرامبەر بەرەوڕوو بوونەوەیەکی گەورەدا بووکە ((کلاوس))ی بە پرسیارەکانی تەنگەتاو کردبوو، دڵنیابوو کە سیخوڕێکی سۆڤێتیەو دەبێ وا بکات دان بە

ڕاستیه‌كاندا بنێ، ئه‌و ڕاستیانه‌ی موخابه‌راتی به‌ریتانی و ئه‌مریكیش ده‌یانزانی.

((كلاوس)) به‌رنامه‌ی داهێنانی بۆمبی ئه‌تۆمی دزی بوو، و گه‌یاندبوویه موخابه‌راتی سۆڤێتی، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی موخابراتی ڕۆژئاوا له‌وه دڵنیا و مسۆگه‌ر بوون. به‌ڵام زاتیان نه‌ده‌كرد، سه‌رچاوه‌ی ئه‌و زانیارییانه له كێشه‌ی سیخوڕی بدركێنن، چونكی دادگایكردنی ((فوتشس)) له‌سه‌ر ناوهێنانی ئه‌و سه‌رچاوه‌یه، نهێنیه‌كی مه‌ترسیداری موخابه‌راتی ڕۆژئاوا ئاشكرا ده‌كات، هیچ چاره‌یه‌كی كه نه‌بوو له‌وه‌ی زیاتر پشت به زیره‌كی ((سكاردون)) ببه‌سترێ له قسه لێ ده‌رهێنانندا. هه‌موو هه‌وڵێكی بۆ ئه‌وه ته‌رخانكرد ((فوتشس)) نه‌رم بكات بڕوای پێ بهێنێ كه‌وا بڵاوبوونه‌وه‌ی زانینی نهێنیه‌كانی دروستكردنی بۆمبی ئه‌تۆمی، ده‌بێته هۆی لاسه‌نگ بوونی هێزه‌كان و ئاشتی جیهانی ده‌خاته مه‌ترسییه‌وه و ئه‌مه‌ش تیۆریكه ده‌بێ ڕێزی لێ بگیرێ......

((سكاردون)) به ده‌نگێكی باوكانه‌وه پڕ له سۆز وتی من له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌م بڕوایان به‌و تیوره هه‌یه، و به‌لایه‌نگرانی كێشه‌ی ئاشتی دایان ده‌نا و به‌و چاوه‌وه ته‌ماشایان ناكات خیانه‌تیان كردووه.

به‌مجۆره ((فوتشس)) ئه‌وه‌ی له دڵیابوو بۆ ((سكاردون))ی ده‌گێڕایه‌وه. كه‌لێ بووه‌وه. به شانازییه‌وه دانی به‌وه‌دانا كه‌وا ئه‌و نهێنیانه‌ی ئه‌تۆمی به یه‌كێتی سۆڤێت داوه، له‌به‌رامبه‌ر ئه‌مه ١٤ ساڵ به‌ندیان كرد.

((كلاوس فوتشس)) له خێزانێكی ئه‌ڵمانی چه‌پ ڕه‌ودا له دایك بووه. ساڵی ١٩٣٢ چۆته ناو حیزبی شیوعی ئه‌ڵمانیه‌وه. له زانكۆی ((كییل)) خوێندنی فیزیایی ته‌واو كردووه و له‌م بواره‌دا سه‌ركه‌وتوو بووه. مامۆستاكانی پێشبینی پاشه‌ڕۆژێكی پرشنگداریان بۆ كردووه. به‌ڵام هیتله‌ر په‌تی ئاواته‌كانی بڕیوه، ژیانی له شیوعیه‌كانی ئه‌ڵمانیا كردبووه

دۆزەخ، ناچار ((فوتشس)) بۆ بەریتانیا هەڵاتووە، لەوێ لەچەند کارێکی زانیاریدا کاری کردووە، چۆتە ناو کۆمەڵەی ئاوارەکانی حیزب لە بریستۆل. هەوڵی ئەوەی دەدا بەهەر شێوەیەك بێ ڕێگایەك بدۆزێتەوە بتوانێ یارمەتی مۆسکۆ بدات، لە ساڵی ١٩٤١زدا، لە پڕۆژەی ((بۆڕی))دا دەستی بەکارکردن کرد. ئەم پڕۆژەیە بۆ شاردنەوەی پڕۆژەی بۆمبی ئەتۆمی بوو.....

((فوتشس)) بۆی دەرکەوت کەوا زاناکانی بەریتانیاو ئەمریکا گەلێ هەنگاویان بڕیوە بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو ئاستەنگانە زانیاریو ئەندازیارییە سەرەکیانەدا لە دروستکردنی بۆمبای ئەتۆمی دا. ئەوەشی زانی، کەوا بەریتانیاو ئەمریکا، زۆر بەتەنگ ئەوەوە دێن ئەم نهێنیە لە هاوپەیمانەکەیان کە یەکێتی سۆڤێت بوو، بشارنەوە. لەم کاتەدا لەوە دڵنیابوو کەوا شتێکی بەدەستەوەیە دەتوانێ پێی یارمەتی سۆڤێت بدات... ((روس کوزینسکی)) هێنابویە ناو تۆڕی سیخوڕییەوە، کە ئەو ئافرەتە لە بەریتانیا بەڕێوەی دەبرد. ((فوتشس)) ((رەوس))ی ئاگادارکردەوە.... دەستی کردە دزینی بەڵگەنامەکان، دەیدایە دەستی ((کوزینسکی))یەوە تا ئویش وێنەی بگرێو بیکاتە فیلمو سەرنجو تێبینیەکانی خۆشی بخاتە سەر.کۆمۆنیستێکی ئەڵمانی وەکو ئەو، چۆنو وا لە پڕۆژەیەکی نهێنی مەترسیدارو پڕۆژەی بۆمبی ئەتۆمیدا هێشتویانە لەوێدا کاربکات؟. لەو ڕۆژانەدا، بەشێکی تایبەت لە موخابەراتی بەریتانی بۆ بەرنگاربوونەوەی سیخوڕی دانربوو. زۆر بەوردی چاوەدێری چالاکیەکانی شیوعییەکانی بەریتانیایان دەکرد. ((فوتشس)) چۆن ئەو هەڵەیەی کرد؟ ئەوانەی ڕاوی سیخوڕنیان دەکرد دوای چەند ساڵێك بۆیان دەردەکەوت کەوا یەکێك لەناو موخابەراتدا ، سیخوڕی بۆ یەکێتی سۆڤێت دەکات.

لــە ســالّی ١٩٤٥ز، موخابــەراتی بــەریتانی هــەموو فایلــەکانی ((جەســتابوو))یــان دەســکەوت لــە مەکتــەبی موخابــەراتی ئــەلمانی لــە ((کییل)). ئەو فایلانە، لاپەڕەو تۆماری هەموو شیوعییەکانی ((کییل)) تیدابوو، ئەو زانیارییانە، بەر لەوەی هیتلەر دەسەلات بەدەستەوە بگرێت کۆکرابوونەوە لە نێوان ئەو تۆمارانەدا، دۆسەی گەورە گەورەی لە بارەی ((کـلاوس فوتــشس))ەوە بــوو، موخابــەراتی بــەریتانی ئــەو تۆمارانــەی دەپشکنی تا ئەو شیوعییانە بناسێ کە بۆ بەریتانیا کۆچیان کردبوو لە سالأنی سییەکاندا بۆ موخابەراتی سۆڤێت کاریان کردبێ...

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە هیچیان لەبارەی ((فوتشس)) نەبینییەوە.

لەسالّی ١٩٤٣ز، ((فوتشس)) لە پڕۆژەی ((مانهاتن)) ((بلوسی ئالاموس)) لە نیو مەکسیکۆ دامەزرا، کە دەزگایەکی ئەمنی پتەوی لێ بوو، شاشەی کۆمپیتەرەکەیان بەکار دەهێنا بۆ نەهێشتنی دزەکردنی هیچ سیخوڕێك بۆ ناو پڕۆژەکە.... بەلأم ((فوتشس)) کەپسولەی موخابەراتی بەریتانی پێ بوو بۆ چوونە ژوورەوە، لەمەش ڕزگاری بوو.

بەر لە کۆتـایی سـالّی ١٩٤٤ز ((فوتـشس)) کلیلـی نهێنـی بۆمباکـەی بـە یـەکێتی سـۆڤێت گـەیانـد، تـا جیهـازی تەقینـەوەی نـاوەکیش کـە هێـزە وێرانکارییەکــە ئــەنجام دەدا. بــەلأم موخابــەراتی ســۆڤێتی لــەکاتی سـەرکەتنیدا هەلەیـەکی گـەورەی کـرد کـە زۆری لەسـەر کـەوت. ئەوەنـدە پەرۆشـی وەدەسـت هێنـانی زانیارییـەکان بـوون کـە ((فوتـشس)) پێـی دەگەیانــدن، موخابــەراتی ســۆڤێتی بڕیاریانــدا، یــەکێ لــە کرێگرتــە ئەمریکییەکانی بەناوی ((هاری گۆلد)) دابمەزرێنێ، تاکو زانیارییەکان لە فۆتشس وەرگرێ. لە پەیوەندییەکدا لە نزیك ((لـۆس ئالاموس)) و دوای شـەش سـالْ. کە ((فوتـشس)) خـۆی دانـی پێـدانا، ئـەوەی ڕاگـەیانـد کـەوا پـەیوەنـدە بـە ((گولـد))ەوە کـرد. موخابـەراتی ئـەمریکیش لـەم قـسانە

سوودی بینی، چونکی پێشتر گومانیان لە ((گۆلد)) هەبوو. جارێکی تر پرۆسەی ((فینوتا)) بۆ بەدوادا گەڕای شەپۆلی بیّ تەل، ئەوەی سەلماند کەوا سیّ حەڵقەی سیخوڕی سەرەکی لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کار دەکەن لەکاتی شەڕدا، و نهێنیەکانی دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی وەدەست دێنن. یەکیّ لەو حەڵقانە، لە زانکۆی ((شیکاگۆ)) کار دەکات، حەڵقەی دووەم لە تاقیگەیەکی تیشکوەری لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە ((بیرکلی))دایە. حەڵقەی سێیەم لە ٢٢ کۆمۆنیستی ئەمریکی پێك هاتبوون، پێش دزینی نهێنیەکانی پیشەسازیو تەکنەلۆژی ئەمریکی دامەزرابوون. ئەم حەڵقەیە لەدەرەوەی ((نیویۆرك)) دابووو ساڵی ١٩٤٣ز کەوتنە سەر سیخوڕیکردن لەسەر ئەتۆم.

ئەو حەلقە سیخوڕییەی کە ((گۆلد)) کاری تێدا دەکرد وەکو حەلقەی پەیوەندی لەسەرەتادا، موخابەراتی ئەمریکی ئاگای لیّ بوو لە ڕێگای ئەو لێکۆڵینەوانەوە کە پێش چەند ساڵێك لەبارەی دزینی تەکنەلۆژیای ڕادارەوە کردبوویان. لەساڵی ١٩٤٥ز ((ئەلیزابێت نبتلی)) لە کۆمۆنیست هەڵگەڕاوە وتی یارمەتی دەری سەرۆکی موخابەراتی سۆڤێتی بوو لە چەند شانەو حەڵقەیەکداو چەندین دزی تەکنەلۆژیایان کردووە، وتی من ئەندامەکانی ناناسم، بەلاّم بیری کەوتەوە کەوا سەرۆکەکەی پەیوەندی بە یەکیّ لە ئەندامەکانیەوە کرد ناوی ((جولیۆس)) بوو، موخابەرات بۆی دەرکەوت کەوا کۆمەڵیّ کەس بەشداریان لە دزینی زانیاری ئەتۆمی کردووە، خزمی یەکێکیان لە پرۆژەی ((مانهاتن)) کار دەکات، ئەوە ڕێك بەسەر ((جۆلیۆس))دا دەسەپا، لەگەڵ ((ئیسیل ڕەوزنبیرگ))دا کە براکەی ((دیڤید گرینگلاس)) لە ((لۆس ئالاموس)) کار دەکات. موخابەراتی ئەمریکی چەند وێنەیەکی گومانلێکراوی لە موخابەراتی سۆڤێت نیشانی ((فوتشس)) دا ((گۆلد))ی ناسی، کە ئەو پیاوەیە

زانیاری لێ وەردەگرێت لە ((لۆس ئالاموس)). دانی بەوەش دانا کە دوو حەڵقەی بەڕێوەدەبرد... ((فوتشس)) ماوەیك زیندانی کرا بەڵام ساڵی ١٩٥٩ز ئازاد کرا، چووە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات، لەوێ لە پەیمانگای ئەتۆمی کاری دەکرد تا ساڵی ١٩٧٩ خانەنشین کراو ساڵی ١٩٩٣ کۆچی دوایی کرد.

## ♦ ♦ موخابەرات لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی ♦ ♦

دوای شەڕی دووەمی جیهانی، جیهان بەسەر دوو لادا دابەش بوو، یەکێتی سۆڤێت و دەستەی ڕۆژهەڵاتی، وهاوپەیمانان و ئەوانەی سەر بەدەستەی ڕۆژئاوابوون. ولآتە داگیرکراوەکان بەرەبەرە سەربەخۆییان وەدەست دەهێنا، دوو ئایدۆلۆجی لە جیهاندا بلأو بووەوە، شیوعیەت و سەرمایەداری، جیهان دابەش بووە سەر ڕۆژهەلأت و ڕۆژئاوا، ڕۆژئاواییەکان هەبوون بوونە هەواداری شیوعیەت، لە ڕۆژهەلأتیش هەبوون مەیلی سەرمایەداریان دەکرد. هەندێ لە کۆمەڵگاکان و حکومەتەکانی خۆیان جیابوونەوەو چوونە ولآتانی دیکەوە، هەندێ لەوانە کاری سیخوڕی سەیرو سەمەرەیان ئەنجامدا.

## ♦ ♦ ئیگۆر جۆزینکۆ ♦ ♦

دبلۆماتکارێکی باڵیۆزخانەی سۆڤێتی بوو لە ئۆتاوا... لە ساڵی ١٩٤٧، _ وەکو لەمەوبەر باسمان لێکرد _ وەکو پەناهەندەیەك لە کەنەدا مایەوە.....

## ♦ ♦ ڤلادیمیر بترۆڤو ژنەکەی ♦ ♦

هەردووك کارمەندی باڵیۆزخانەی سۆڤێی بوون لە ئوسترالیا، کە ژمارەیەك لەو ئوسترالیایانەی کە سیخوڕیان بۆ سۆڤێت دەکرد ئاشکریان کرد.

ئەو ماوەیەی دوای شەڕی دووەمی جیهانی، بەوە ناسراوە، کاری

سیخوڕی زۆر ئەنجام دەدرا، مەسەلەی پەناهەندەیی و چوونە ولآتێکی تر زۆر ڕووی دەدا، سیخوڕو کرێگرتەکان دزەیان دەکردە ناو دەزگا گرنگەکانەوە، ناو کارگەگانەوە، دەچوونە ناو دەستەی لێکۆڵینەوەی زانیارییەکانەوە، ئەم تەشەنە کردنە، بووە هۆی ئەوەی لایەنە موخابەرایەتیەکان گرنگی بە ئاسایشی نەتەویی بدەن لە دژی سیخوڕێتیدا.......

تا دەزگاو تۆڕەکانی خۆیان بپارێزاو نەهێڵن کرێگرتە بیانیەکان دزە بکەن. بەریتانیا لەم ڕووەوە بە بەتواناترین دەوڵەت دادەنرێ لە بەرهەڵستو قەلآچۆکردنی سیخوڕێتی، ئەویش بەهۆی جێگای جوگرافیەوەی کە دوورگەیەکەو هاتنە ناوەوەی ئاسان نییە، لەلایەکی دیکەشەوە میللەتەکەی هەمە چیزە نەبوون وەك یەکێتی سۆڤێت، کە گەلێ میللەتی جیاواز جیاوازی لەخۆ گرتبوو، یان وەکو ولآتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کە دانیشتوانەکەی لە گەلێ میللەت پێك هاتووە.......

لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی، هاوپەیمانان ئەڵمانیایان کردە دوو پارچەوە، ڕوسیای کۆمۆنیست دەسەلآتی بەسەر ڕۆژهەلآتەکەیدا گرت، ئینگلیزو فرەنسیەکان و ئەمریکاییەکانیش چاودێری و سەرپەرشتی بەشە ڕۆئاواییەکەیان دەکرد. بەرنگاربوونەوە دەستی پێ کرد، کەبەناوی شەڕی ساردەوە ناسراوە. بێ کوشتاری ڕاستەقینە لە نێوان سوپای ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوادا. دیبلۆماسی و سیخوڕێتی بووە مەیدانی شەڕی سارد، شارە وێرانکراوو خاپورەکانی ئەڵمانیا ببووە جێگای سیخوڕی هەندێ لەو سیخوڕانە وەك باندێك ڕەفتاریان دەکرد، لەوانە کۆمەڵێك بەناوی _ کوڕانی سەد مارك _ بە ڕۆژهەلآتدا دەگەڕان و بە کۆمەڵێ زانیارییەوە دەگەڕانەوە و ئەو زانیاریانەیان دەفرۆشت..... تاخمێکی

دیکە بەناوی ((رینهارت جیهلین)) بوو، لەو زیاتریان دەکرد

## ♦ ♦ رینهارت جیهلین موخابەراتی تایبەتی ♦ ♦

لە سالأنی شەڕەکەدا، ((جیهلین)) یەکێ بوو لە ئەفسەرە دیارەکانی موخابەراتی هیتلەر، بۆ سیخوڕی کردنی ڕوسیاو ئەوروپای ڕۆژهەلأت دانرابوو، کاتێ هاوپەیمانان ئابلۆقەی سەرکردە نازییەکانیان دا تا دوای شەڕ دادگاییان بکەن. (جیهلین)) توانی ژیان‌و ئازادی خۆی بپارێزێ. فەرمانی بە سیخوڕەکانی خۆی لە ڕۆژهەلأت دا لە جێگاکانی خۆیان نەجولێنەوە، گەلێ سندوقی شاردەوە پڕبوون لە دۆسیێی بەنرخ. کە ئەمریکییەکان دەستگیریان کرد، زۆر ئارام‌و لەسەرخۆ مایەوە، شتێکی گرنگی هەبوو پێیانی بدا لەبەرامبەر ئازادکردنیدا، ئەمریکیەکان بەمە ڕازی بوون، ((جیهلین)) یان بە نهێنی بەفڕۆکە بۆ واشنتۆن نارد، چونکی نەیاندەویست ئەم سیخوڕە گرنگە دەستی سۆڤیێت بکەوێت، کاتێ سالّی ١٩٤٦ز گەڕایەوە، وەکالەتێکی موخابەراتی تایبەتی دامەزراند، بە پالّپشتی ئەمریکا. هەر زوو لێهاتوویی خۆی دەرخست، لەماوەی دە سالّدا، وەکالەتی موخابەراتی ئەمریکی ٢٠٠ ملیۆن دۆلاریان پێدا، بۆ خەرجی ڕێکخستنە نهێنییەکەی. کە سالّی ١٩٥٦ ئەو وەکالەیە بوو بە ڕێکخراوی موخابەراتی فەرمی ئەلّمانیای ڕۆژئاوا، بە سەرۆکایەتی ((جیلهین)) تا سالّی ١٩٦٨ خانەنشین بوو ئەو پایەیەی بەدەستەوە بوو.

((جیهلین)) بارەگای ڕێکخراوەکەی لە ((ولاتش)) بوو کە دەکەوێتە نزیك ((میونخ))ەوە. کردییە قەلأی سیخوڕی، بەناوی چەندین کۆمپانیای ساختەوە کاری دەکرد. وەکو ((کۆمپانیایی پەردەی ڤینیسی)) کە ژوورەکانی کۆمپانیاکە جێگای سیخوڕێ بوو.

موخابەراتی ئەمریکی‌و ڕێکخراوەکەی ((جیهلین)) پێکەوە کاری سیخوڕی زۆریان ئەنجامدا، گرنگترینی ((تۆنێلی تەلەفۆنەکان)) بوو، کە

لە ساڵی ١٩٥٥زدا، ئەمکریکیەکان خەریکی دروستکردنی وێستگەیەکی ڕاداری نوێ بوون لە دەورووبەری شاری ((ڕودو)) لە بەرلینی ڕۆژئاوا..... موخابەراتی ئەمریکی هەڵی قۆزتەوە کە بە یارمەتی شارەزایانی ((جیهلین)) تۆنێلێك بە درێژی ٦٠٠و هەڵکەنن لە ژێر تەلبەندێکەوە بۆ ناو ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات. ئامانجیشی لەمەدا بۆ گوێگرتن بوو لە هێڵی تەلیفۆنە سەرەکیەکانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات. ئەمە کارێکی گەورە بوو، کە دەبووایە هەزاران تەن خۆڵ لەو تونێڵەوە بگوازنەوەو بە فارگۆنی هێڵی ئاسنین کە تایبەت بوو بە سوپای ئەمریکی، لە ژێرەوەش سازاندیان و دیوارەکانیان پڕکرد لە دەزگای تۆمارکردن و گەورەکردنەوەی دەنگ، لە کۆتایی تونێلەکەدا، وایان دامەزراندبوو دەیتوانی گوێ لە ٤٣٢ گفتوگۆی جیاواز لە یەك کاتدا بگرن. ئەو تونێلە نۆ مانگ بووە جێگای سیخوڕی، لە ٢٢ ئەیپرلی ١٩٥٦زدا چۆڵ کرا، ڕوس لێی ئاگادار بووەوە، کە ڕوسەکان هاتنە ناو تونێلەکەوە لەو دیوەوە کەسی تێدا نەمابووەوە، دەزگاو ئامێرەکانیشیان لەجێگای خۆی مابوونەوە. بە کوتوپڕییەکی واوە ڕوسەکان چوونە ناو تونێلەکەوە، قاوەکانیان بەگەرمی بەجێ هێشتبوو.

دەڵێن گوایە ((جورج بلیك))ی سیخوڕ، خیانەتی لە ((جیهلین)) کردو ڕوسی لە نهێنی تونێلەکە ئاگادار کردبووەوە. ((بلێك)) کۆمۆنیستی دوو ڕوو بوو، لە ساڵی ١٩٦١زدا، ئاشکرابوو، وەکو سیخوڕێك دادگایی کراو بە ٤٢ ساڵ حوکم درا، بەڵام توانی لە زینداندا هەڵبێ بڕوا بۆ ڕوسیا......

## ◆ ◆ جۆرج بلێك ◆ ◆

((جۆرج بلێك)) نهێنی تونێلەکەی ئاشکرا کرد. پیاوێکی لەڕو لاواز، پاڵتۆیەکی لەخۆ پێچاوەتەوە، هەر لە تارمایی کەسێك دەچێ کە سەردەمێ قەڵەوو بەخۆوە بووە..... بەیانیەکی ساڵی ١٩٥٣ز لە سنوور

دەچێتە ئەو دیو، هەروەك لە ژێر مۆتەکەیەك بە ئاگا هاتبێتەوە، ئەو کابرایە ((جۆرج بلێك)) بوو........ جێگری قونسولی لەگەڵ دیبلۆماتکارە بەریتانیە هاوڕێکانیدا لە زیندان ئازادکران و لە دوای سێ ساڵ زیندانی لە باکوری کۆریاو مەنشوریا........

((بلێك))یان بردە خاڵی گۆڕینی سیخوڕەکان، لەوێ لەبەردەم زیندانەکەدا چاوی بە ((بوکلین)) کەوت کەسەر بە موخابەراتی بەریتانی بوو، تا هەندێ زانیاری لێ وەرگرێ.

((بلێك)) هەر بۆ چاوبەستەکردن خۆی بە بریکاری قونسول دانابوو، وەکیلی موخابەراتی بەریتانی بوو، ساڵی ١٩٤٨ز چوو بۆ سیئۆڵ، تا یەکەم وێستگەی موخابەراتی لە کۆریا بکاتەوە. لەساڵی ١٩٥٠زدا کۆریای باشوور بۆ سیئۆل هێرشی کرد. ((بلێك))و هاوڕێیانی دیبلۆماسی ماوەی هەڵاتنیان نەبوو، گیران و لە کۆریای باشوورو مەنشوریا زیندانی کران.

موخابەراتی بەریتانیا، پێویستیەکی زۆری بەوە هەبوو پرسیارێك بە پەلە لە ((بلێك)) بکات، تا بزانێ: ئایا کۆمۆنیستەکان زانیویانە پەیوەندی بە موخابەراتەوە هەیە یان نا؟ ((بلێك)) بۆیانی سەلماند نازانن، بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لەوێ زیندانی بوو بە شیوعییەکانی سەلماندبوو کەوا بریکاری قونسولەو سیخوڕ نەبووە..... هاوڕێکانی زۆر هەڵس و کەوتی ((بلێك))یان بە دڵ بووەو دەیان وت زۆر ئازایانە ڕەفتاری دەکردو جێگای تەسەلاو دڵدانەوەی دیلەکانی تر بووە. کە ((بلێك)) بۆ پشوودان لە هۆنگ کۆنگ بوو، جارێکی کە موخابەراتی بەریتانی خستبوویە ژێر پرسیار لێ کردنەوە. موخابەراتی بەریتانیا بەوەی نەزانیبوو کە ئێوارەیەکیان چاوی بە موخابەراتی لایەنێکی کە کەوتووە، کە مەیلی بۆیان هەیە ئەویش موخابەراتی سۆڤێتی یە.

بەزەحمەت بڕوا بەوەدەکرێ کە دوای بەدیل گرتنی و زیندانی کردنی لە مەنشوریا مەیلی بەلای شیوعیەتدا هەبێ. بەلام ئەمە یەکێك بووە لە خووە سەیرەکانی ئەم پیاوە کە چیرۆکی سەیرو سەمەرەترین سیخوڕ لەم کابرایەدا دەبینرێ. بۆ ئەوەی لە ((بلێك)) بگەین، دەبێ ئەوە بزانین کە لە ساڵی ١٩٢٢ز لە دایك بووە بە ناوی ((جۆرج بیهار)) کە کوڕی یەکێکە لە خێزانە کۆنەکانی یەهودی لە ئەمستردام، تەمەنی ١٤ ساڵ بووە باوکی مردووە، لەسەر وەسێتی باوکی بۆ قوتابخانەیەکی ئینگلیزی لە قاهیرە نێرراوە، لەگەڵ خزمەکانیدا ژیاوە، زۆربەی کاتی لەگەڵ مامیدا بووە ((هنری کوریل)).... کە ئەندامێکی چالاکی حیزبی شیوعی میسری بووەو سیخوڕێکی کۆنی موخابەراتی سۆڤێتی بووە، مامەی پێشبینی ئەوەی لێ کردووە، کە ببێتە سیخوڕێکی لێهاتوو. کەم کەم بیروباوەڕی کۆمۆنیستی دەخستە مێشکییەوە. کە بۆ ئەمستردام گەڕایەوە، ئەو بیروباوەڕە بەتەواوی کاری لێ کردبوو. چووە قوتابخانەیەکی بالاوە لە ئۆتردام، بەلام ساڵی ١٩٤٠ز ئەلمان ولاتی داگیر کرد، دەستی لە خوێندن هەلگرت، خوشك و دایکی بۆ ئینگلتەرا هەلاتن، بەلام ئەو بڕیاری دا بمێنێتەوەو بچێتە ناو هێزی بەرگریو شەڕی پارتیزانیەوە، لەژێر ناوی ((ماکس دی فرین))... کە کەوتە دەستی جەستابووو بۆ دادگایکردن هێنایان، توانی خۆی ڕزگار بکاو لە ڕێگەی بەلجیکاوە خۆی گەیاندە لەندەن.

لە ئینگلتەرا ناوی خۆی گۆڕیو کردییە ((بلێك))و چووە ناو هێزی دەریایی شاهانەوە، هیوای ئەوەشی دەخواست. بچێتە ناو کاری موخابەراتیەوە.....

زۆری نەخایەند ئاواتەکەی هاتەدی، بەلام پێی ناخۆش بوو لە ئۆفیسێکدا دایان نا، بەلام لەوێدا تووشی خۆشەویستی بوو،

سکرتێرەیەکی لە موخابەراتی بەریتانیا خۆش ویست بەناوی ((ئیریس بیك)).... بڕیاریان دا بۆیەك بن، بەڵام خێزانی ((بیك)) بەم ژن خواستنە ڕازی نەبوو، ئەو خێزانە بریتانییە بەوە ڕازی نەبوو کچەکەیان بە یەهودییەك بدەن، بەمجۆرە ئەو بەیەك گەیشتنە سەری نەگرت. ((بلێك)) تووشی نائومێدی بوو، تووڕەو بێزارو سوێندی خوارد تۆڵە لەو کۆمەڵگایە بکاتەوە کە لە گەورەترین خۆشەویستی بێ بەشی کرد، سکالای خۆی لای ((هنری)) مامەی کرد، مامی زۆر بە تەنگیەوە هات و گوێی لێ گرت، پێشنیاری تۆڵەسەندنی بۆ کرد، ئەویش بۆ خزمەت و بەرژەوەندی ((کێشەی شۆڕشی جیهانی)) کاربکات. بەمانای ((بلێك)) دزەبکاتە ناو موخابەراتی بەریتانیەوە لە ساتێکی گونجاودا، دەگاتە پایەکی وا دەتوانێ تۆڵەی خۆی بکاتەوەو دەستی خۆی بوەشێنێ.....

زۆری خایەند تا ((بلێك)) گەیشتە ئامانجی خۆی، ئەویش چوونە ناو موخابەراتی بەریتانی بوو..... لەکۆتایی شەڕی دووەمی جیهانیدا، بەردەوام بۆ بەشی موخابەراتی دەریایی کاری دەکرد. گوازرایەوە بۆ (هامبۆرگ)) و کردیانە سەرۆکی یەکەیەکی بچووکی موخابەرات....

لەوێ زیرەکی و لێهاتوویی نیشاندا گوازتیانەوە بۆ موخابەراتی بەریتانی، دواجا، ساڵی ١٩٤٨ز _ دوای ساڵێك _ کارێکی سەرەکیان پێ ڕاسپاردو کردیانە سەرۆکی وێستگەی سیئۆلی نوێ.....

ئەو سێ ساڵە بەندو دیل کردنەی لە بڕیاری تۆڵەسەندنەوەکەی پەشێمان نەکردەوە، ماوەشی بۆ هەڵنەکەوت تا ساڵی ١٩٥٥ز. دوای دوو ساڵ کارکردن لە سەرکردایەتی دا. کە گواستیانەوە بۆ جێگایەکی گرنگتر لەناو موخابەراتی بەریتانیدا، لە بەرلین دایان نا، ئەوێش چاکترین جێگابوو بۆ سیخوڕیکردن بۆ یەکێتی سۆڤێت. ئەو شارە جێگاو هاموشۆی بەردەوامی سیخوڕانی ڕۆژهەلات و ڕۆژ ئاوا بوو، کۆمەڵێکی

زۆر لـە وەکالەتـە موخابەراتـەکانی تێـدابوو، ((بلێـك))یـش نوێنـەری موخابەراتی ئەنگۆ _ ئەمریکی بوو کە چاودێری کاری پەیوەندییـەکانی دەکرد، سەرەڕای سەرپەرشتیکردنی وێستگەی موخابەرایەتیەکەی خۆی کە زۆر هەستیار بوو.

((بلێك)) هەرکە گەیشتە بەرلین هەلێکی گەورەی بۆ ڕەخسا زانی کـەوا موخابـەراتی ئـەنگۆ _ ئـەمریکی خـەریکی کـارێکن بـەناوی ((پڕۆسـەی زێڕ)). کە پلانێکی ئازایانە بوو بۆ هەڵکەنـدنی تونێلێك لـەژێر سنووری ڕۆژهـەلاتو ڕۆژئـاوای بەرلینـدا، و هیلـە تەلەفۆنییـەکان بەیەکـەوە گـرێ بدەن، تـا گـوێ لەنامـەو قسەکردنی هەمووسـەربازو دیبلۆماسـیو کـارە موخابەرایەتیـەکان بگـرن. کـە جـۆرە دەزگایـەکیان بـەکار دەبـردو هـەموو ئاماژەیەکی هێلە تەلەفۆنیەکانی ڕوسی تۆمار بکات.

((بلێك)) ڕوسی وشیارکردەوە لە پڕۆسەکە، موخابەراتی سۆڤیێـی کەوتنە کارکردنو خۆیـان بۆ ئامـادەکرد، ڕێگایـان دا تـا تونێلەکـەیان تـەواوکرد، موخابـەراتی ئـەمریکی بـە ملیۆنـەها دۆلاری بـۆ جـێ بـەجێ کردنـی تونێلەکـەو دامەزرانـدنی سـوپایەك لـە وەرگێـڕ بـۆ وەرگێڕانـی ملیۆنـەها قسەکردنو پەیوەنـدی تەلـەفۆنی بـەکاربرد، موخابـەراتی ئمریکـی وای دانـابوو کـە لـە ١٠٠٪ پڕۆژەکـەیان سـەرکەوتووە، سـەرەڕای ئـەوەی هەستیان بەوەش کردبوو کە سوودێکی ئەوتۆ نـابینن لـە وەرگێڕانـی ئـەو پەیوەندییـە تەلەفۆنیانـەدا، سەرسـوڕمانی موخابـەراتی ئـەمریکی زۆری نـەبرد، چـونکی موخابـەراتی سـۆڤیێتی تونێلەکـەی پڕکـردەوە، کـە بەڕێکەوت پاسەوانانی ئەڵمانیایی ڕۆژهەلات دۆزییانەوە.

دوای پڕۆسـەی تونێلەکـە ((بلێـك)) دەسـتێکی تـری وەشـاند ئـەویش ئاشـکراکردنی نـاوی هـەموو کرێگرتـەکانی موخابـەراتی بـەریتانیو ئـەمریکی بـوو کـە دەیزانـی لـە وێـستگەی بـەرلین کاریـان دەکـرد.

موخابەراتی ڕوسی سوودێكی زۆری لەمەدا بینی. كەزۆر كارو نیازی موخابەراتی بەریتانی و ئەمریكی پوچەڵ دەكردەوە. ئەم خیانەتە گەورەیە، موخابەراتی رۆژئاوای خستە سەر ئەو باوەڕەی كەوا ئەگەری خائینێك لە وێستگەی بەرلین دا هەیە، بلێك بە زیرەكی خۆی توانی دوای پرسیار لێكردنی هەموو گۆمانێ لەخۆی دوور بخاتەوە.

تائەوكاتەی ((هورست ئتن)) سیخوڕی ئەڵمانی لە وێستگەی بەرلین، ئاشكرای كرد كەوا بۆ موخابەراتی سۆڤێتی كاردەكات. ئامارژەی بەوەدا كەوا (بلێك)) ڕەنگە لەوێ كاری كردبێ. ((بلێك)) وتی، خۆی وا نیشان داوە كەوا هەواداری موخابەراتی سۆڤێتە تا بزانێ كێ بۆ سۆڤێت كار دەكات...........

((بلێك)) هەستی كرد وا مەترسی لێی نزیك دەبێـەوە. ((كوریل))ی مامی پێشنیاری بۆ كرد داوای گواستنەوە بكات بۆ كارێكی تر. داوای لە موخابەراتی بەریتانیا كرد، بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی بگوازنەوە. موخابەراتی بەریتانی ڕازی بوو، لەساڵی ١٩٦٠ز، چووە لوبنان بۆ خوێندنی لێكۆڵینەوەی عەرەبی لە كۆلێژی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، تا دواجا لە وێستگەی بەیروت سەر بە موخابەراتی بەریتانی كاربكات، بەلاّم لەمەدا سەرنەكەوت، دیسان تووشی نائومێدی بوو.... ((بلێك)) گەیشتە لوبنان. لەوێ سیخوڕێكی پۆلەندی هەبوو، لەهەمان كاتدا بۆ سۆڤێتیش كاری دەكرد، ڕاپۆرتی گەلێ گرنگی بۆ موخابەراتی ئەمریكی دەنارد، لەناو ئەو ڕاپرتانەدا كە دەینارد، ئەوەشی دەگوت كەوا لەناو وێستگەی موخابەراتی ئەنگۆ _ ئەمریكیدا لە بەرلین، خائینێك دزەی كردووە ناوی ((جۆرج بلێك))ە، لەیەنایری ١٩٦١زدا، دەركەوت ئەو سیخوڕە ناوی ((میكل جولینویسكی)) یە، لە سۆڤێت هەڵگەڕابووەو هاتبووە ناو موخابەراتی ئەمریكیەوە، بەڵگەی زۆر گرنك لە فایلەكانی

موخابەرتی سۆڤێتیەوە دەدزیّ، ئەو بەڵگەنامانەش ئەوەی دەسەلماند کەوا ((بلێك)) سیخوڕی بۆ ڕوسیا دەکات.

موخابەرات ((بلێك))ی بۆ لەندەن بانگ کرد، بە بیانووی ئەوەی کە یەکێکە لە گەورە موخابەراتەکانی بەریتانیا و دەیانەویّ لەبارەی کارێکەوە وتوویژی لەگەڵدا بکەن، بلێك گەڕایەوە و چووە سەرکردایەتی موخابەراتی بەریتانیا، لەویّ ڕووبەڕووی تۆمەت کرایەوە. پێیان سەیر بوو دەست بەجیّ دانی بەهەموو شتێکدا ناو ئەو زیانانەشی خستە بەرچاو کە گەیاندویەتیە موخابەراتی بەریتانی، لەوانەش ئاشکراکردنی ناوی ٤٢ کرێگرتەو سیخوڕو هەڵواسینیان لەلایەن سۆڤێیەوەو ئاشکرا کدرنی نهێنی تۆنێڵەکەی بەرلین و لیستێکی دوورودرێژی دیکەی لەوانە کێشەی ((بیوتر بوبوف))....

لەساڵی ١٩٥٢ز، کۆلۆنێلێکی ڕوسی بەناوی ((بوبوف)) لە ڤییەننا نامەیەکی فڕێدایە ناو ئۆتۆمبێلی دیبلۆماسیەکی ئەمریکیەوە، ئامادەیی خۆی نیشاندابوو کەوا ئامادەیە بۆ موخابەراتی ئەمریکی کار بکات، لە ڕژێمی سۆڤێتی بێزاربیووو بڕیاری دابوو بەشداری ڕوخاندنی بکات. دەیدی کەوا هەندیّ لەکاربەدەستانی سۆڤێت لە ژیانێکدا دەژین شاهانەیەو زۆربەی میللەتیش بەهەژاری دەژین و بە پارەیەکی کەم سیخوڕێتی ئەمریکی پیّ قەبول بوو..... ((بوبوف)) زانیاری لەبارەی سوپای سۆڤێتیەوە دەدایە ئەمریکا، دەربارەی ئەو چەکە تازانەی دروستی کردووە، دەربارەی سیستەمی بلاّوکردنەوەی سەربازو سوپا لە ڕۆژهەلاّتی ئەوروپادا و چۆن سۆڤێت خۆی بۆ شەڕێکی ئەتۆمی ئامادە دەکات ئەگەر ڕۆژئاوا دەست درێژی بکاتە سەر ڕوسیا.... لەساڵی ١٩٥٦ز بۆ وێستگەی موخابەراتی سۆڤێتی لە بەرلینی ڕۆژهەلاّت گواستیانەوە. کە ((بلێك)) بەمەسەلەی ((بوبوف))ی زانی موخابەراتی

سۆڤێتی ئاگادار کردەوە.

موخابەراتی سۆڤێتی ((بوبوف))یان بۆ مۆسکۆ گەڕاندەوە. هەرکە گەیشتە مۆسکۆ گرتیان و لە زینندانیان نا، لە جیاتی هەڵواسینی، موخابەراتی سۆڤێتی بڕیاریدا بیگەڕێنێتەوە جێگاکەی خۆی دوای ئەوەی هەڕەشەی ئەوەیان لێ کرد کە سەرجەم خێزانەکەی دەکوژن.....

داوایان لێ کرد ڕێکۆپێك بڕوات چاوپێکەوتن لەگەڵ بریکاری موخابەراتی ئەمریکی بکات کە تازە لەوێ دامەزرابوو.

کە لە ژووری ئوتێلێکدا چاوی بە کابرای ئەمریکی لە مۆسکۆ دەکەوێت ((بوبوف)) دەستی بە شاشێك پێچراوەو بێ ئەوەی قسە بکات تا جێگای ئازاردانەکەی پێ نیشان بدات دواجا بەدەست بازنەیەك دەکات کە هێمایە بۆ تۆمارکردن، یانی ڕیکۆردی پێیە.... کە شریتی تۆمارکردنەکە دەپشکنن موخابەراتی سۆڤێتی بۆی دەردەکەوێت کەوا ((بوبوف)) کابرای ئەمریکی وشیار کردۆتەوەو ئاگاداری کردووە کە دەنگەکەی تۆمار دەکرێت. جارێکیان ((بوبوف))و بریکاری موخابەراتی ئەمریکی لە ناو لۆرییەکدا لە مۆسکۆ یەکتر دەبینن، لە ساڵی ١٩٥٩زدا بوو، هەردووکیان پێکەوە لەوێدا دەگرن.. ((بوبوف)) هۆشیارییەکی نووسیبوو، کەوا سوپای سۆڤێت بەرزی فڕینی فڕۆکەی ((یو _ ح)) دەزانێ و ئاشکرای کردووە، و بە نیاز بووە یەکێ لەو فڕۆکانە بە مووشەك بێنێتە خوارەوە. بڕیار درا، موخابەراتە ئەمریکیەکە لە وڵات دوور بخەنەوە. بەو پێیەی دیبلۆماتکارە، بەڵام ((بوبوف)) ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر دراو کۆتاییشی، کۆتایی هەموو ئەو کەسانە بوو کە خیانەت لە موخابەراتی سۆڤێت دەکەن. لەناو فڕندا بە زیندووی سووتاندیان، لەبەر چاوی هاوڕێکانی... هەرچی ((بلێك)) بوو، دادگای باڵا بە ٤٢ ساڵ حوکمی دا، ئەوکاتە تەمەنی ٣٩ ساڵ بوو، بەڵام ئەو

حوکم دانە دوا لاپەڕە نەبوو لە ژیانی((بلێک)) دا. ساڵی ١٩٦٧ز لە زیندان هەڵات، دوای ئەوەی شەش ساڵ لە زیندان مایەوە. دەڵێن بە یارمەتی موخابەراتی سۆڤێتی هەڵاتبوو، لە ڕاستیدا هەڵاتنەکەی بە یارمەتی یەکێ لە هاورێ کۆنەکانی بوو، کە ئەندامی سوپای کۆماری ئیرلەندی بوو. بەناوی ((مین بورگ))، چەند هەفتەیەك شاردییەوە، دواجا ڕێگای خۆشاردنەوەی بۆ خۆش کردبوو، بە پارەیەکی زۆر ئەو کارەی ئەنجام دابوو.... دواجا پەیوەندی بە ڕوسەکانەوە کردبوو، توانیان بیگەیەننە مۆسکۆ، ((بۆرگ))یش لەگەڵیا چووە مۆسکۆ، بەڵام دوای چەند مانیگێك گەڕایەوە ئیرلەندە، ئەو چاکەیەی بۆ ((بلیك)) کرد، لە ئەنجامی ڕێکەوتنێ نەبوو لەگەڵ موخابەراتی سۆڤێتیدا، بەڵکو هاورێ بوون و ئەو سەرکێشیەی بۆ ئەنجامدا.

لە مۆسکۆ، خانوویەکی بە ((بلێك)) بەخشێنراو ژیانێکی ئارام و خۆشی بەسەردەبرد و خەریکی خوێندنەوە بوو بە تایبەتی ڕۆمانی ((ریتشارد کۆندۆن)) و ((هاوری مەنشوریەکە)) کە ڕووداوەکەی لە ژیانی ((بلیك))ەوە هەڵێنجابوو. ژنێکی ڕووسیشی خواست و ژنەکەی و دوو منداڵی لە بەریتانیا بەجێ هێشتبوو، لە ساڵی ١٩٩٠ز تەلەفزیۆنی سۆڤێتی چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کرد، شانازی بەوەوە دەکرد کەوا خیانەتی لە ٦٠٠ بریکاری موخابەراتی ئەمریکی و بەریتانی کردووە.....

## ♦ ♦ بازنەی بورتلاندو پێنج سیخوڕەکە ♦ ♦

لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٠ز، ئەفسەرانی ئاسایشی نهێنی لە دەزگای چەکی شوێنە قوڵەکان لە شاری ((بورتملاند)) دەستیان کرد بە گەڕان بەدوای یەکێ لە کارمەندانی دەزگاکە......ناوی ((هاری هوتن)) بوو. کە دەمێك بوو گومانی کەوتبووە سەر، لەم دواییەش کەوتبووە کڕینی شتی نایاب و گران بەها... لەوانە کە کڕیبوونی، خانوویەك بۆ کاتی

پشوودانی و ئۆتۆمبێلێکی نوێ.... گومانەکە لەوە دەکرا: ئەمەی لەکوێ بوو؟

موخابەراتی بەریتانی کەوتە چاودێری کردنی ((هاری هونون)). بۆ ماوەوی نۆ مانگ خۆی و ژنەکەیان، کە لە بورتلاند، کاری دەکرد، خستە ژێر چاوەدێرییەوە. ئەوەش دەرکەوت جارجارەش بۆ لەندەن گەشت دەکەن و لەوێدا چاویان بە کابرایەك دەکەوێت ناوی ((گۆردون لونسدیل))ە، لەو یەکتر بینینەدا ((هونون)) و ((لونسدیل)) دوو پێچراوە بە یەك دەدەن. مەزنە لێ کردنی ئەو شتانە زۆر قورس بوو، ((هوتون گی)) نهێنییەکان بەپارە دەگۆڕییەوە، دوو سیخوڕی لاوەکی بوون... ئەی لەبارەی ((لونسدیل))ەوە چی؟.

((گۆردون لونسدیل)) وەك پیاوێ کاری کەنەدی دەردەخست، کە لە ئیش و کارەکانیا سەرکەوتووەو ئەو پێنج ساڵە لە بەریتانیا دەژی. بەڕێوەبەری کۆمپانیایەکی دیاربوو، خۆشەویست بوو، هەڵس وکەوتی ئەوەی نیشان نەدەدا کە سیخوڕە، لە ڕاستیدا کرێگرتەیەکی ڕوسی دڵسۆز بوو.ناوی ڕاستەقینەی ((کۆلۆنێل کونون ترۆفیموفیتش مولودی)) بوو. سیخوڕێکی ڕاهاتوو بوو، لەژێر ناوێکی خوازراودا دەژیا. ساڵی ١٩٥٤ز بەدزییەوە خۆی گەیاندە کەنەدا، لەوێ ساڵێك مایەوە، زمانەکەی ڕاهێناو پاسەپۆرتی پێدرا. بەر لەوەی بۆ بەریتانیا بڕوا ناسنامەیەکی ڕێك و پێکی باوەڕ پێکراوی هەبوو، تا بەڕادەیەك کە چاوی ((هوتون)) و ژنەکەی کەوت وایانزانی سیخوڕێکی ئەمریکیەو کاری سیخوڕی لە دەزگای بورتلاند دەکات. لە ٧ یەنایری ساڵی ١٩٦١ز، هوتون و گی و لونسدیل لەکاتی گۆڕینی زانیارییەکاندا گیران ((هوتون)) گورج دانی پێدانا و وتی ((من زۆر بێ مێشك بووم...)) ((گی)) هەوڵی دا خۆی وا پێشان بدات کە بێ تاوانە، بەڵام ((لونسدیل)) ی سیخوڕ، هیچ

قسەی نەکردو بڕیاری بێ دەنگی دا. ((سكوتلاندیارد)) کەوتە پرسین و پشکنین لەبارەی برادەرەکانی ((لونسدیل))ەوە، بەڕێوەبەرەکەی بڕیاریدا بڕوات بۆ ئەو خانووە کە لەلادێدا بووو ((بیتر کروجو)) و ژنەکەی ((هیلین)) تیای دادەنیشتن، بازرگانی کتێبی دانسقەیان دەکرد، هەردووك وەك ((لونسدیل)) کەنەدی بوون، کە ناوبەناو سەردانی دەکردن لە ((رویزلیت)) هەردووك ڕوو خۆش و ساز بوون. بەڕێوەبەر ((سمیت)) داوای لێکردن لەگەڵیا بچن بۆ ((سكۆتلاندیارد)) تا لەوێ دەست بە وتوویێژ بکەن، ژنەکەی کروجر ڕازی بوو، پرسی ڕێگەی بدەن تا ((گیزەرەکەیان)) بەرلەدەرچوونیان بکوژێنێتەوە، سمێت وتی: ئاساییە، بەڵام لە پێشدا ئەو جانتایەی دەستم بدەرێ بزانم چی تێدایە)) .... خانم کروجر، ڕازی نەبوو، بەڵام بەڕێوەبەر جانتاکەی بەزۆری لەدەستی وەرگرت، بینی نامەیەکی تێدایە بە ڕوسی نووسراوە شەش لاپەڕەیە. لەگەڵ سێ لاپەڕەی کون کونکراوو لاپەڕەیەکیشی بە کۆرد _ شفرە _ نووسراوە. ((کروجر))و ((هیلین))ی ژنی، بە شێوەیەکی نایاسایی لە بەریتانیا دەژیان و مابوونەوە، هەروەك ((لونسدیل)) .... لە ماڵەکەیاندا کەرستەی سیخوڕی پێشکەوتوو دۆزراییەوە.... لە ((کارنلی)) ییەوە، لە ((رویزلیب)) نهێنییەکانی ((لونسدیل))یان بە ڕەمزی کونکراوو بێ تەل بۆ بنکەی موخابەراتی سۆڤێتی لە مۆسکۆ دەنارد.

((سیمیس)) لەکاتی پشکنیندا حەمامێکی چاوپێکەوتن دەتوانرا بکرایەتە ژوورێکی تاریك بۆ کاری وێنەگرتن و پاسەپۆرتی ساختەو دەزگای ناردنی بێ تەل، کەلە زەوی ئاشپەزخانەکەیاندا شارابووەوە. دوای ئەوەی ((کروجر))یان گرت لەگەڵ ژنەکەیدا ئەوەی دواجا هاتە خانووەکە، بێ تەلێکی لە حەدیقەکەدا دۆزیبووەوە، دەرکەوت ناوی ڕاستەقینەی ((کروجرو ژنەکەی)) _ موریس و لۆنا کوهین))ە. هەردوو

سیخوڕ ڕاهاتوون، لە حەڵقەی ((ڕودولف ئابل))دا لە ئەمریکا کاریان کردووە. کە حەڵقەکەیان لە ئەمریکا هەڵوەشاوەتەوەو ڕوخاوە بۆ ئینگلتەرا هەلاتوون. ((لونسدیل)) ٢٥ ساڵ حوکم دراو کروجەرو ژنەکەشی ٢٠ ساڵ. هوتونو ژنەکەشی گی ١٥ ساڵ بۆ هەریەکێکیان

## ◆ ◆ هارولد کیم فیبلی مامۆستای خیانەت ◆ ◆

ناوی فەرمی ((هارولد ئەدریان رومیل فیبلی))یە، نازناوی ((کیم))ە، دوو ناوی حەرەکی هەبوو ((ستانلی و تۆمی سیخوڕ)).

بەرلەمردنی لێیان پرسی: ئایا هەست ناکات کەوا خیانەتی لە بەریتانیای نیشتمانی کردووە؟....

وتی: خیانەت پێویستی بە ئینتیما هەیە لە پێشدا، منیش قەت هەستم بە ئینتیما نەکردووە)). تا چەند ئەم وتەیە ئاڵۆز بێ، بەلام تەنها ڕاڤەکردنێکە کە سەیروسەمەرەترین سیخوڕ لە مێژووی سیخوڕییێتییدا کردوویەتی.... ((فیبلی)) سیخوڕی وەکالەتی موخابەراتی سۆڤێتی بوو. نهێنی موخابەراتی ولاتەکەی ماوەی سی ساڵ ئاشکرا کردووە. زۆری نەمابوو بگاتە پایەی سەرۆکی موخابەرات، لە هەمان کاتدا بۆ دوژمن سیخوڕی دەکرد. چیرۆکی ئەم سیخوڕە بووە سەرچاوەی نووسینی گەلێ لە ڕۆماننووسانو چیرۆکنووسان کە هەوڵیاندا دیاردەی فیلیبی شی بکەنەوەو لە کەسایەتی بدوێنو ئەو هۆکارانە دیاری بکەن کە بۆ خیانەت پاڵی پێوەناوە.

لێکۆڵەرەوان کەوتە پشکنینو بەدواداگەڕانی ژیانی منداڵی، بەدوای خاڵێکدا دەگەڕان کەوای کردووە بەوجۆرە پێی بخلیسکێو خیانەی نیشتیمان بکات...... ئەم کابرایە، لە هندو بەر شەڕی یەکەمی جیهانی ساڵی ١٩١٢ز لە دایك بووە، دایکی بەریتانیە، باوکی ((سانت جۆن فیلبی)) پیاوێك بوو خاوەنی خووو ڕەوشتێکی سەیر بوو، ناوێکی بۆ

خۆی پێکەوەنا لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کاتێ بۆ موخابەراتی بەریتانی کاری دەکرد. ئەرکی ئەو هاندانی عەرەبەکان بوو دژی تورکیا لە دوای شەڕ...... بڕوای بە عەرەبەکان هێنا کەوا بەریتانیا خیانەتی لێ کردوون، چووەتە مەملەکەتی عارەبی سعودی، بووەتە ئیسلام و ژنێکی عەرەبی هێناوە، هەموو جارێکیش وشیاری بە کوڕەکەی دەدا کەوا بڕوا بە قسەی دەسەلاتدارانی بەریتانیا نەکات...

((فبیلبی)) و کوڕەکەی لەیەکەوە نزیك بوون، بەلام باوکی دەستی لە بیروباوەری سیاسی کوڕەکەی وەرنەدەدا بۆ کۆمۆنیستی.......

ئەم ئاراستەیەی لەو کاتەوە پەیڕەو دەکرد کاتێ کوڕەکەی لە سالی ١٩٢٩ز چووە زانکۆی ((کامبرج)). دوای ئەوەی بووە هاوڕێیەکی نزیکی ((گای بیرجیس)) و ((دۆنالد مالکین)) کە هەردووکیان لە هەوادارانی مارکسیەت بوون، و بیروباوەری کۆمۆنیستسان بلاودەکردەوە. لە پشوەکانیشدا بە ئەوروپادا دەگەڕا لەودەمەشدا نازییەت ترسی بە هەموو لایەکدا بلاودەکردەوە.

ئەم زیاتر پابەندی بیروباوەڕی مارکیسەت و کۆمۆنیست بوو، لەهاوینی ١٩٣٤زدا، لە ڤییەننا بوو بڕیاری دا ببێتە سەربازێك لە ململانێی دژی فاشیەت کەوتە ناو گێژاوەی سیاسەتەوە، ڕاست ڕەوەکان لە ململانێدا بوون لەگەل چەپ ڕەوە نەیارەکانیاندا، ((فیلبی)) ناوی خۆی لە لیستی شۆڕشگێڕانی ئیشتراکی تۆمارکرد کە شیوعیە نەمساوییەکان یارمەتی و پشتگیریان دەکرد، وەکو پەیامنێرێك لەنێوان چەند یەکەیەکی دژ بە حکومەت دەستی بەکارکردن کرد.

لەم کاتەدا، کچێکی نەمساوی شیوعی ناسی و یەکیان خۆش ویست ئەویش ((ئەلیس فریدمان)) بوو. کەبە ((لیتز فریدمان)) ناسرا. ئەویش لەناو ئەو ململانێیەدا بوو، ململانێکە گەیشتە پۆپە کاتێ حکومەت،

خانووەكانی كرێكارانی بۆردوومان كردو سەدانیان لێ كوژرا، ((فبیلبی)) ئەم كوشتارەی بەچاو بینی، لەو ڕۆژەوه بووه ڕادیكاڵێكی توندڕەو.

وارێكەوت لەو دەمەدا، موخابەراتی سۆڤێتی دوو كەسی هەبوو سیخوڕیان بۆ دەكردن، ((تیودور مالی)) مەجەری، كه جاران قەس بووو ببووه كۆمۆنیست، لەگەڵ ((جابوربینز)) ئەمیش هەر كۆمۆنیست بوو، هەردووكیان چاویان له ((فیبلی)) بڕیبوو وایان دەبینی بۆ سیخوڕی شیاوەو ئامادەشه له خزمەتی بیروباوەڕی شیوعیەتدا بێ، بۆیه بەناوی كێشەی شۆرشی جیهانیەوه بۆلای خۆیان ڕاكێشا، وای بەباش زانی خۆی ئاشكرا نەكات كەدڵسۆزی بیروباوەڕی كۆمۆنیستە، هەوڵی ئەوەی دەدا جێگایەك لەناو حكومەتی بەریتانیادا بۆ خۆی دابین بكات، چاكتریش دەبوو ئەگەر لەخزمەتی موخابەراتدا بێ.........

((فیبلبی)) خۆی وا دەردەخست كه هیچ پەیوەندییەكی به كۆمۆنیستو ماركیسیەوه نییە، ئەمە پێویست بوو تا جێگای خۆی وەكو كارمەندێكیش لەناو حكومەتی بەریتانیادا بكاتەوه، بووه ئەندامی كۆمەڵەی ئەنگۆ _ ئەڵمانی. كه كۆمەڵەیەكی ڕاست ڕەو بوو، چلاكی بۆ ئەوه دەكرد كەوا هاوپەیمانیەك لەگەڵ ئەڵمانیای نازیدا ببەسترێ. بۆ زیاتر چاوبەستەكردن دەستی له كۆمۆنیستی هەڵگرتو لێیان دووركەوتەوه، به تایبەتی له ((ئەلیس فریدمان)). ئاخرییەكەی ساڵی ١٩٣٦ز ئەو ئاواتانەی هاتەدیو وەكو پەیامنێری ڕۆژنامەی ((لەندەن تایمز)) دەست بەكار بووو بۆ ئیسپانیایان نارد تا دەنگوباسی شەڕی ناوخۆی ئەوێ بۆ ڕۆژنامەكه بنێرێ...... ئەو ڕاپۆرتانەی دەنارد لایەنگری جەنەڕاڵ فرانكۆی تیادا دەكرد، ناوبانگی بەوه دەرچوو، كه ڕاست ڕەوێكی توندڕەوه، كەچی هەرچی زانیارییەكی لەبارەی دەستو پێكانی فرانكۆوه دەست دەكەوت بۆ موخابەراتی سۆڤێتی دەنارد......

ئەوەنـدەی نـەمابوو ژیـانی سـیخوڕی کۆتـایی پـێ بێـت، کـاتێ سـەربازە نیشتیمانیەکان گومانیان لێ کردو ماوەیەك بەندیان کرد تا پرسیاری لێ بکەن. لەوکاتەدا هەندێ بەڵگەی پێ بوو کە جێگای ئیدانەکردنی بوو، کە داوای جانتاو کاغەزەکانیان لێی کرد، وای پیشاندا کە لێی کەوتووەو لـە ژێـر کورسیەکاندایە، کـە سـەربازەکان داچـەمین بـۆ جانتکـەی ئـەم بەهـەلی زانی هەندێ کاغەزی کە زانیاری تیادابوو قوتی دا.

لەساڵی ١٩٣٩ز هێشتا هەر پەیامنێری ((تایمز)) بوو، ئەو هەلەی دەمێك بـوو چـاوەڕێ بـوو، بـۆی ڕەخـسا، هـاوڕێی قوتابخانـەی‌و هـاوڕێی بیروباوەڕی لە کۆمۆنیستیدا ((جای بیرجیس)) لەوەکالەتی موخابەراتی بـەریتانی کـاری دەکـرد، بردیـە پـاڵ خـۆی. وەکالەکـە چـەند جـارێ، لـە بیروباوەڕو چالاکیەکانی پرسیبوو کۆڵابووەوە، لەباوکیان پرسی: ئایا کۆمۆنیـستە یـا نـا، بـاوکی بەتونـدی ڕەتـی کردبـووەو وتبـووی: هـەموو هـەرزەکارێك تووشـی گەمـژەیی‌و بـێ مێـشکی دەبـێ ماوەیـەك ..)) بەمـە قەناعەتیان هێنابوو مەترسی ڕابردووشی لەسەر لاچوو...

لەسـاڵی ١٩٤١زدا، بەڕێوەبەرایـەتی موخابـەراتی بـەریتانی هـەڵگیراو لـە جێگـای ئـەوە وەکالـەتێکی دیکـە دامـەزراو دامو دەزگاکـەیان سـەر لـەنوێ ڕێکخـستەوە... ئـەوەیان بـۆ ئاشـکرابوو، کـەوا ((فیلبـی)) لـە قـسەکردندا سـەری زوبـان دەگـرێ، بۆیـە لـەکاری مەیـدانیان دوورخـستەوەو لـەکاری نووسین لە بەشی دژە هەواڵگری لە وڵاتە بیانییەکان دامەزرا.

ئەمە ئەو جێگایە بوو کە خەونی پێوە دەبینی‌و لەمە باشتری چاوەڕوان نـەدەکرد، نـەخۆی نـە وەکالـەتی موخابـەراتی سـۆڤێتیش. چـونکی لـەم شوێنەیدا زانیاری زۆری دەست دەگەوێ کە بۆ هیچ سیخوڕێکی مەیدانی دیکە نەدەڕەخسا.

((فیلـی)) لـەناو موخابەراتی بەریتانیـدا ناسـراو بـوو، خۆشەویـست بـوو،

لەلایەکی تریشەوە ئەو زانیارییانەی دەست دەکەوت سەرکردەکانی بڕوایان پێ پەیدا کرد. کەسێکی موخابەراتی لێهاتوو بوو، کە زۆر کەس پێشبینی ئەوەی بۆ دەکرد ببێتە سەرۆکی موخابەرات لە پاشەڕۆژداو ناویان نا ((کیم)) .....

لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٤ز، کارێکی گرنگی بۆ ڕەخسا، سەرۆکایەتی بەشی نۆهەمی وەکالەتی موخابەراتی بەریتانیان پێ سپارد. ئەو شوعبەیە کە کاری ئەوەبوو دژی سیخوڕێتی سۆڤێت ڕابوەستێ ئەم بەشە ڕاگیرابوو سەردەمانێك، چونکی لەماوەیکدا سۆڤێتو بەریتانیا هاوپەیمانی یەکتر بوون. کەشەڕ هاتە کۆتایی هات وادەردەکەوت سۆڤێت دەبێتە دوژمنی ڕۆژئاوا. موخابەراتی بەریتانیا بیری لەوە کردەوە ئەو شوعبەیە زیندوو بکاتەوەو ((فیلبی)) بەڕێوەی ببات، بۆ ئەمەش سەد سیخوڕیان خستە ژێر دەستی......

موخابەراتی سۆڤێتی لەمەدا قازانجێکی زۆری کرد، کەس نازانێ لە ئەرشیفی موخابەراتی مۆسکۆ بەولاوە ((فیلبی)) چ جۆرە خیانەتێکی کردووەو ئەو زانیاریانەی بە سۆڤێتی گەیاندووە چەندە. بەدڵنیایەوە خزمەتێکی گەورەی گەیاندۆتە سۆڤێت لەکاتی شەڕدا. لەو کارانە: ڕێگاگرتنو نەهێشتنی یارمەتی پێگەیشتنی بەریتانیا بۆ ئەوانەی دژی نازییەکان کاران دەکرد. مۆسکۆ ئەوانەی بە دوژمنی خۆی دەزانی، چونکی ئەگەر حکومەتێکی نوێ لەسەر لاشەی نازییەکان بهاتایەتە کایەوە، ئەوا بێ گومان لەگەڵ ڕۆژئاوادا دەبوونە هاوپەیمان ئەمەش دەبووە کارەستێکی گەورە بۆ سۆڤێت، بەتایبەتی ئەگەر ئەڵمان سوپاکەی وەك خۆی بمایەتەوەو بۆ ڕۆژهەڵاتی بناردایە. ((فیلبی)) بۆ ئەوەی ئەم پلانەو ئەنجامەکەی سەر نەگرێ، تا توانی ڕاپۆرتەکانی ئۆپۆزسیۆنەکانی هیتلەری دەشێواند....

خزمەتێکی کەی ((فیلبی)) بۆ موخابەراتی سۆڤێتی ئەوەبوو: ناوی هەموو سیخوڕەکانی بەریتانیایی کە لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات کاریان دەکرد بە موخابەرتی سۆڤێتی دا.... لەهەمان کاتدا ((فیلبی)) خیانەتی لە تۆڕی سیخوڕی دژ بە سۆڤێت کرد. کە خۆی سەرۆکی شوعبەی نۆ بووو بۆ ئەوکارە دامەزرابوو. موخابەرای سۆڤێتی زانیاری و ئاگادارکردنەوەو وشیاری لێ وەردەگرت و زانیاری هەڵەو ناڕاستی دەناردەوە بۆ چەواشەکردنیان، بەمجۆرە چەندین ساڵ موخابەراتی بەریتانیا هەڵدەخەڵەتێنرا..

لەساڵی ١٩٤٥ز، ((فیلبی)) ڕووبەڕووی کێشەیەك بووەوەو زۆری نەمابوو کارەکەی لەدەست بدات... دوو پیاوی موخابەراتی سۆڤێت پەنایان هێنایە ڕۆژئاوا. یەکێکیان ((ئیگور جوزینکو)) بوو کە نووسەری شفرە بوو لە باڵیۆزخانەی سۆڤێت لە کەنەدا، کۆمەڵێ بروسکەی سۆڤێتی زۆر نهێنی هێنابوو. ئەوەی تریان ((کونستانتسین فولوف)) بوو، کە ئەفسەرێکی موخابەراتی ڕوسی گەورە بوو لە ئەستەموول. هاتبووە باڵیۆزخانەی بەریتانیاو داوای پەناهەندەیی سیاسی کردبوو، ئەوەی ڕاگەیاندبوو کە دڵنیایەو مسۆگەرە کەوا موخابەراتی سۆڤێتی دزەی کردۆتە ناو موخابەراتی بەریتانیەوە، بەڵام ((فولکوف)) ئەو سیخوڕە سۆڤێتییەی نەدەناسی کێیە... ئامارژەی بۆ چەند نیشانەیەك کردبوو، ((فیلبی)) پێ ئاشکرا دەبوو ئەگەر لێی ورد ببنەوە.

((فیلبی)) داوای یارمەتی و ئامۆژگاری لە ((یوری مردین)) کرد، کە بریکاری موخابەراتی ڕوسی بوو، و لە لەندەن سەرپەرشتی تۆڕێکی سیخوڕی دەکرد، لەوانە ((فیلبی)) و ((ماکلین)) و ((بورگیس)) و ((ئەنتونی بلانت)) و ((جۆن کینکرۆس)).

((مودن)) لەو بڕوایەدابوو، کەوا ((فیلبی)) ناتوانێ بەرامبەر ئەو دوو

سیخوڕە هیچ کارێك بکات. دەبێ موخابەراتی سۆڤێتی کامیان زۆر گرنگە لەناوی بەرێ، بۆیە ((فولکوف))یان دەستنیشان کرد کە دەبێ نەمێنێ.... ((فیلبی)) چونکی سەرۆکی شوعبەی نۆ بوو، دەبوایە، خۆی بڕواتە لای ((فولکوف))و لێی بپرسێ، کێن ئەوانە کەوا دزەیان کردۆتە ناو موخابەراتی بەریتانیەوە، بۆ قازانجی سۆڤێت....

((فیلبی)) چووە ئەستەمبوول، لە هەمان کاتیشدا موخابەرات بڕیاری لەناوبردنی ((فولکوف))ی دابوو... تا ئێستا نەزانرا چیان لێکرد، بەڵام هەیە بینیویانە کەوا، کەسێك هەموو جەستەی بە لەفاف پێچرابووەو لە فڕۆکەخانەی ئەستەمبوول لە فڕۆکەیان ناوە لەو ڕۆژەشدا ((فولکوف)) ئیتر دیار نەماوە.

دەرکەوت کەوا ((جوزینکۆ)) ئاگاداری لە کارەکانی موخابەراتی سۆڤێتی نییە لەناو بەریتانیادا، هەرواش چاوەڕوان دەکرا،

((فیلبی)) گەڕایەوە لەندەن، لەخۆی دڵنیابوو، لەکۆتایی شەڕدا ئەستێرەی زیاتر لەناو موخابەراتی بەریتانیادا گەشایەوە. هەستیان بە کردەوەکانی نەدەکرد، وەك ئەوەی ناوی موخابەراتی بەریتانی ئاشکرا کردبوو لەگەڵ چەندین کاری دیکەیدا.

دەنگوباس لەناو موخابەراتی بەریتانی بڵاو بووەوە کەوا ((فیلبی)) پایەی بەرز دەکرێتەوەو دەچێتە جێگای ((ستیوارد منزیس))، بەرزکردنەوەی ساڵی ١٩٤٩ مسۆگەر بوو، کردییانە سەرۆکی وێستگەی موخابەراتی بەریتانی لە واشنتۆن، لەژێر پەردەی سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە ئەمریکا ئەو کارەی بەدەستەوە گرت. یەکێ لەو کارانەی کەوتبووە سەرشانی، وەکو حەڵقەی پەیوەندی نێوان موخابەراتی بەریتانی و ئەمریکادا کار بکات. موخابەراتی سۆڤێتی ئەمەی بە بەختێکی هات لەقەڵەم دا، چونکی ((فیلبی)) لەم جێگایەدا

دەتوانێ زانیاری و نهێنی موخابەراتی ئەمریکیش و بەریتانیاش بە مۆسکۆ بگەیەنێ....

((فیلبی)) لە واشنتۆن جێگیر بوو، هەر زوو نهێنی گەورەی ئەمریکای زانی کە شفرەیەکە بەناوی (ف ی ن و ن)) کە بۆ کردنەوەو خوێندنەوەی شفرەکان بەکار دەهێنرا... کە ڕاستەوخۆ لە لەندەن و نیویۆرك و واشنتۆنەوە ئاراستەدەکرا دژی تۆڕی پەیوەندی بێ تەلی هەواڵگری سۆڤێتی لەکاتی شەڕدا واشنتۆن و لەندەن هەستیان کرد گۆڕانێك لە خەستی پەیوەندییەکاندا ڕویداوە. کەوتنە گومانەوە کەوا مۆسکۆ داوای لە هەموو پیاوانی خۆی کردووە زانیاری بنێرن لە کاتێکدا مەترسی لە دژی ڕژێمی شیوعی پەرەی سەندووە، گومانەکەشیان لە جێگای خۆیدا بوو.

پرۆسەکە بە ئاشکراکردنی کتێبێکی سووتاوی شفرەی سۆڤێتی دەستی پێکرد. گەلێ کلیلی کردنەوەی شفرەی گرنگی بەدەستەوەدا بۆ حەلکرن و خوێندنەوەی نامە کۆدکراوەکانی سۆڤێت. دەرکەوت ژمارەی پیاوانی ڕوسیا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا بەسەدا بوو. ئەمانەش ناناسرێن تا ناوی حەرەکیان نەزانرێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانەی شفرەکانیان خوێندەوە توانیان، ناوە شفرەدارەکان لەگەڵ کلیلی دیکەدا بەراورد بکەن کە لەنامەی ترەوە دەستیان کەوتبوو، گرنگیان دایە کەسایەتییە دیارەکان، بەتایبەتی ئەوانەی خەریکی تێپەڕاندنی زانیار بوون لەبارەی بۆمبی ئەتۆمەوە. دەرکەوت ((کلوز فوشن))ە، زەنگی ترسیش لەدڵی ((فیلبی)) دەستی بە لێدان کرد، کاتێ ئاماژەیان بە سیخوڕێکی بەریتانی کرد کە پایەیەکی بەرزی هەبەو ناوی حەرەکی ((هومر))ە... کە زانیاری گرنگ لەو پەڕی نهێنیدایە تێدەپەڕێنێ، بەتایبەتی لە وەزارەتی دەرەوە، لەیەکێ لە نامە شفرەکانەوە هاتبوو

كەوا، لەواشنتۆنەوە چووە بۆ نیویۆرك بۆ سەردانی ژنەكەی كەنەخۆش و باردار بوو. نامەكە ئەوەشی ئاشكراكردبوو كەوا دیبلۆماسیەكی بەریتانی كە لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە واشنتۆن كار دەكات كە ((دونالد مالكین))ە، بەرپرسی پەیوەندییەكانی بەریتانیایە لە واشنتۆن.
((فیلبی)) ئەندامی ئەو گروپە موخابەراتیە بوو كە چاودێری پرۆسەی ((ف ی ن و ن)) ی دەكردو وتا چەند تونیوایانە كەسایەتیە سۆڤییەتیەكان دەستنسشان بكەن، دواجا مەخابەراتی سۆڤێتی ئاگاداركردەوە لە ساڵی ١٩٥١زدا، كەوا بەخوێندنەوەی شفرەكە ((مالكین)) تاوانبار كرا....ئەم هۆشیاری دانە ترسی خستە دڵی ((مودن))ەوە، ئەگەر ((مالكین)) بگیریٚ و دان بنێتە كارەكانی زیان دەگەیەنێتە موخابەراتی ڕوسی. بڕیاریان دا بیفرێنن بۆ مۆسكۆ، دەبیٚ زۆر بەوریایی ئم كارەش ئەنجام بدریٚ، چونكی سەرنەكەوتنی ڕفاننەكە كۆتایی بە قازانجی ((فیلبی)) دەهێنیٚ......
((مودن))یان ڕاسپارد ((مالكین)) لە بەریتانیا دەركات بیداتە دەستی ((جای بورجیس)) كە هاوڕێیەكی نزیكی ((مالكین)) بوو، لەهەمان كاتدا هاوڕێی ((فیلبی)) بوو، لەو كاتەوە هاتبووە ئەمریكا پێكەوە لە ماڵەكەیدا دەژیان. ئەم پەیوەندییە سەر بەخێر نەبوو، بارەكە ئاڵۆزتر بوو كاتیٚ ((بورجیس)) لە پڕێكدا لەبەر چەند هۆیەكی نادیار، بڕیاری دا لەگەڵ ((مالكین))دا بڕوات، بۆ ڕۆژهەڵات. لەمەدا گومان كەوتە سەر ((فیلبی)) بەوەیان دانا كە ((مالكین))ی وشیار كردۆتەوە كە گرتنی نزیكە.
هەڵوێستەكە وەكو كارەساتێك وابوو بۆ موخابەراتی سۆڤێتی لەكاتێكی سەیردا. ((فیلبی)) جێگایەكی هەستاری بەدەستەوە بوو كە زۆر نەمابوو ببێتە سەرۆكی موخابەراتی بەریتانی ئاوا لە پڕێكدا سەركێشیەكەی ((بورجیس)) هەموو شتێك لەدەست بدریٚ. بەڕێوەبەری موخابەراتی

ئـەمریکی ((بیـدویل سمیـت)) نامەیـەکی کـورت و تونـدی بـۆ ((سـتیوارد منـزیس)) نـارد کـە بەڕێوەبەری موخابـەراتی بـەریتانی بـوو تیـادا دەڵـێ: فیلبـی بگەڕێننـەوە، ئـەگینا پەیوەندییـە هەواڵگرییـەکان لـە نێوانمانـدا دەپچڕێن....)) . بەم جۆرە کاری ڕاستەقسنەی ((فیلبی)) بـۆ موخابـەرتی سۆڤێتی کۆتایی هات. موخابەراتی بەریتانیا هێشتیەوە بەڵام گومانیشی لێ دەکرد، ئیتر کەوتە بارێکەوە نەیدەتوانی زانیـاری بە سـۆڤێت بـدات. سەرەڕای ئەمەش کەوتە بەر هێرشی موخابەراتی و ئەمریکی کە گومـانی ئەوەیان لێ دەکرد، کەوا سـیخوڕێکی بەرز بووە لـە پرۆسـەی ((ف ی ن و ن)) بەناوی شفرەیەوە کە ((ستالین))ی بوو. هەر لـەم کاتـەدا ژمارەیـەك لە سۆڤێتە هەڵگەڕاوەکان لە لەندەن و واشنتۆن زانیاریان دابوو کەوا دەستی لە خیانەتکاریدا هەیە.

سـاڵی ١٩٦١ز بـە تـەواوی کەوتـە تەنگەبەرییـەوە، کـە سـیخوڕێکی دیکـە لـەناو موخابـەراتی بـەریتانیاوە بـەناوی ((جـورج بلێـك)) گـیراو هـەموو شتێکی درکاند، لەوانە خیانەتکردنی ((فیلبی)).

((مـودن)) کەوتـە هەوڵـدان بـۆ ڕزگـارکردنی ((فیلبـی)). گەڕایـەوە سـەر بەندێکی یاسای موخابەراتی بەریتانی _ کە یەکێك ئەمـەی پـێ نیشاندا بوو تـا ئێـستا کـەس نازانێ کێیـە _. کەوا ((حەسـانە)) بـە فیلبـی دەدرێ ئەگەر دان بە هەموو شتێکدا بنێ.... ((مودن)) خۆی گەیاندە ((بـەیروت)) بۆ لای ((فیلبی)) لە ژێر پەردەی پەیامنێری ڕۆژنامەی ئۆبزڤەردا.

پلانەکـەی ((مـون)) ئـەوەبوو ((فیلبـی بڕواتـە موخابـەراتی بـەریتانی داوا بکـات لێ پرسـینەوەی لەگەڵـدا بکـەن، دواجـا بـۆ مۆسـکۆ بـڕوات، دوای ئەوەی دان بە کارەکانیدا دەنێ.....)) ((فیلبی)) وایکرد، دانـی بـە هەنـدێ لـە کردەوەکـانی نـا، هـەر ئـەو زانیاریانـەی پێـدان کـە دەیـانزانی. لـە ٢٣ مایسی ١٩٦٣ز خـۆی کـردە نـاو ئاهەنگێکـەوە و لـەوێوە خـۆی شـاردەوە.

دوای شەش هەفتە مۆسکۆ ڕایگەیاند کەوا مافی پەنابەرێتی سیاسی پێداوە....

پەیوەندی موخابەراتی ڕوسی لەگەڵ ((فیلبی))دا تا ساڵی ١٩٨٠ز گۆرانکاری بەسەردا نەهات، کاتێ سەرۆکی ڕوسیا ((یوری ئەندربۆڤ)) رایسپارد ببێتە ڕاوێژکاری کارەکانی ڕوسیا لە بەریتانیادا، کەس نەیزانی چ جۆرە ڕاوێژکردنێکی پێ دەسپێرن، ئەمەی پێ خۆش بوو، بەڵام ئەو توانایەی جارانی نەمابوو، تووشی حەساسیەتی پێست هاتبوو تا مایسی ساڵی ١٩٨٨ کۆچی دوایی کرد.

سۆڤیێت ڕێزی لێنا وەکو سیخوڕێکی گەورە، سیاسەتمەدارانی ڕوسیا لە ناشتنەکەیدا بەشداربوونو پلەی جەنەراڵیان پێ بەخشی بە پێی وەسێتی خۆی لە گۆڕستانێکی ڕوسی ناشتیانو سنگیانیشی بەگەڵێ نیشانە رازاندەوە، لەوانە ویسامی لینین....

## ♦ ♦ ئەنتۆنی بلانت شانەی پێنج سیخوڕەکە ♦ ♦

ناوە بزوتنەوە ((جونسون))ە، ساڵی ١٩٠٨ز لە دایک بووەو ساڵی ١٩٨٣ز کۆچی دەایی کردووە، باوکی پیاوی ئایین بووە، ماوەیەك وەك ((قەس)) لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە پاریس کاری کرد. دایکی بە خزمایەتی دەگاتە شاژنی دایك. بە سیخورکردنی لەلایەن موخابەراتی سۆڤێتیەوە بەسەر وڵاتەکەیدا جێگای سەر سوڕمانە.

وەکو ئەندامانی ((شانەی پێنج زاناکانی ئینگلیز)) چووەتە ((کامبرج)) لەو سەردەمانەدا مارکسیەت لەناو قوتابیاندا بڵاو ببوەوە، ((بلانت)) چووە ناو حیزبی شیوعیەوە، بەکاری سیاسیەوە ڕانەوەستا، بڕوا هێنانی قوڵی بە مارکسیەت وایکرد زوو بچێتە ڕیزی سیخوڕییەوە. لە ساڵی ١٩٣٣ز کەوتە کارکردن بۆ موخابەراتی سۆڤێتی، یەکەم کەسبوو لە ((شانەی پێنج سیخوڕەکە)) کە هاوڕێکانی هاندا، کاری بکەن ڕژێمی

سەرمایەداری بەریتانی تووشی شکست نەیەت و یارمەتی سۆڤێت بدەن کە بەرزگارکەری جیهانیان دادەنا. ((گای بیرجس)) یەکەیەکە هێنانیانیە ناو تۆڕەکەوە، لە پێشدا ((پلانت)) دواجاریش ((دونالد ماکلین)) و ((میشیل ستریت)) کە قوتابیەکی ئەمریکی بوو، دواجا زۆر لێهاتوو بوو....

لەسەرەتاوە ڕەنگە وابزانین، موخابەراتی سۆڤێی گەمژەیی کردووە کەوا قوتابیەکی بێ ناونیشان لە زانکۆی ((کامبرج)) بهێنیتە ناو سیخوڕییەوە، لەگەڵ مێژوو نووسێکی تەمەڵدا، دەبێ ئەمانە چ زانیارییەك ببخەخشن، بەڵام لە ڕاستیدا هەڵبژاردنی ئەمانە کارێکی ژیرانە بوو، چونکی حکومەتی بەریتانیا، پیاوە گەورەکانی و سیاسەتمەدارانی و گەورە کارمەندانی و وەکیلی موخابەراتی لە زانکۆی کامبرج و ئۆکسفۆرد دەست دەکەوت، بۆیە موخابەراتی سۆڤێتی بیری لەو لایەنە کردبووەوە، مێشکیان و دەرونیان بە بیروباوەڕی کۆمۆنیستی پڕ دەکاو دەیانخاتە گەڕ، تا بتوانن دزە بکەنە ناو دەزگاکانی حکومەت و موخابەراتی بەریتانیەوە. ئەوانە وەکو شانەی شێرپەنجە لە جەستەی سیاسی ئینگلیز چاندبوو. هۆیەکی دیکەش هەبوو، بۆ بەکارهێنانی ((پلانت)) ئەو پەیوەندییە بڵاوەو زۆرەی هەبوو کە بە هەموو دەزگاکاندا بڵاوببووەوە. موخابەراتی سۆڤێتی ئەوەشی دەزانی، کەوا برادەرێکی نزیکی کەوا ناوی ((جای لیدیل)) بوو، سەرۆکی موخابەراتی بەریتانیا بوو، سۆڤێت پەلەیان لێ نەکرد، هەوڵی ئەوەشیان دەدا، هەندێ لەوانە ڕەوشتیان نزم بوو بەکاریان بهێنن.....

((پلانت)) هەوڵی دا بچێتە ناو موخابەراتی بەریتانییەوە لە شەڕی دووەمی جیهانیدا. بۆیە چووە تیپی ئاسایشی مەیدان کە سەر بە موخابەراتی سوپا بوو. بەڵام زۆری نەبرد دەریانکرد، چونکی زانیان

باکگراوندی کۆمۆنیستی هەبوو.... ((پلانت)) پەنای بردە لای هاوڕێکەی ((لیدیل))، دیسانەوە گەڕاندیەوە بۆناو موخابەراتی بەریتانیا، لەهەمان کاتدا ((بورجیس)) کەوتە ناو موخابەراتی ئاسایشی بەریتانی. ((بورجیس)) دواجا ((فیلبی)) هێنا، بەمجۆرە موخابەراتی سۆڤێی سێ سیخوڕی چاندبوو لە جەستەی موخابەراتی بەریتانیدا

((مالکین)) لەوەزارەتی دەرەوەی بەریتانیدا بوو، کاتێ بەرهەم بوو.

((پلانت)) کاری کردنەوەی جانتا دیبلۆماسیەکان بە نهێنی کەتە سەر، ئەویش بەوەی ئەوانەی لە پۆستەی بالیۆزخانەکان کاریان دەکرد بە پارەیەکی باش ئەو کارە ئەنجام بدەن ، موخابەراتی بەریتانی زۆری پێ خۆش بوو هەندێ نهێنی دەست کەوتبوو لە وێنەگرتنی ئەو کاغەزانەی ((پلانت)) لەکاتی جانتا کردنەوەدا دەیگرتن. هەروەها سۆڤێتیش پێی خۆش بوو چونکی ((پلانت)) نوسخەیەکی بە سۆڤێتیش دەدا. لەهەمان کاتیشدا ((پلانت)) جمو جۆلی ڕوسە دوورخراوەکانی بە مۆسکۆ دەگەیاند......

لەساڵی ١٩٤٤ز ((پلانت)) بووە نوێنەری موخابەراتی بەریتانی لەسەرکردایەتی بالای هێزەکانی هاوپەیمانان لە ئەوروپا. ئەمە جێگایەکی هەستیار بوو. ئاگای لە کۆدە نهێنییەکان دەبوو. وەکو پرۆسەی ((ئەلترا)) کە شفرەکانی ئەڵمانی شێواندو پرۆسەی داگیرکردنی ((نورماندی))و زۆری کە..... کەس نازانێ پلانت چ جۆرە زانیاری دیکە بە موخابەراتی سۆڤێت داوە. بەڵام _ بەر لەکۆتایی شەڕ _ کارێکی کرد پەیوەندی بە شەڕو موخابەراتی سۆڤێتسەوە نەبوو، بەوکارە خانەوادەی شاژنی ئەلودە کرد.... لە ساڵانی سییەکاندا بەریتانیەکان بە کێشەی ((دوق وند سور))ەوە خەریك بوون، کە پەرۆشی پشتگیریکردنی نازی بوو، ناچار لە تەختی بەریتانیا دەستی هەڵگرت. چونکی نەیویست

پەیوەندی لەگەڵ خانم ((والاس سمبسون)) بپچڕێنیٚ ....
موخابەراتی بەریتانیا ئاگادار بوو کەوا ((دوق)) چاوی بە هیتلەر کەوتووەو پشتگیری خۆی نیشانداوە، بەڕادەیەك فوهرەر، بڕیاری دا کە ئەڵمانیا ئینگلتەرا داگیر بکات دەیکاتە سەرۆکی وڵات. بەریتانیا (دوق))ی بە حاکمی گشتی ((بەرمودا)) دامەزراند دوای ئەوەی زانی ئامادەیە یارمەتی نازییەکان بدات. حکومەتی بەریتانیا، ئەم نهێنیانەی بڵاو نەکردەوە، دەیزانی بەڵگەنامەی گرنگ لە ئەڵمانیادا هەیە، زۆربەی نامەکانی ((دوق))ن کە ئومێدی سەرکەوتنی بۆ نازییەکان تیا خواستووە. ویستی ئەو نامانەی دەست بکەوێت، ((پلانت)) زۆر بە سەرکەوتووییەوە ئەو کارەی ئەنجام دا. خانەوادەی شاهانەلە پادشتی ئەو کارەیدا کردیان بە : ئەمینی مەکتەبی شاهانەو نیشانەی سووارەییان لەساڵی ١٩٥٦ز پێدا.
هەرچەندە بە فەرمی ((پلانت)) دەستی لە موخابەرات کیشایەوە لە کۆتایی شەڕ، بەڵام موخابەراتی سۆڤێت هەر ئومێدی پیٚ بوو.... لە ئاهەنگەکاندا چاوی بەگەروە کارمەندی موخابەراتی بەریتانی دەکەوت، لەوێدا زانیاری گرنگی دەست دەکەوێت و بۆ سۆڤێتی دەنارد. جارێکی کە نرخی ((پلانت)) بۆ موخابەراتی بەریتانیا دەرکەوت ((بورجیس))و ((ماکلین)) ساڵی ١٩٥١ز بۆ مۆسکۆ هەڵاتن ((پلانت))یش موخابەراتی بەریتانی خۆی گەیاندەماڵەکەی ((بورجیس)) بەر لەوەی پۆلیس سیخوڕی بکەن، ئەو بەڵگەنامانەی فەوتاند کە ئوی پیٚ تاوانبار دەبوو، لە نێوان ئەو بەڵگانەدا، یادەوەری ((جۆن کرنکوس)) بوو، کە یەکێك بوو لە شانە پێنج کەسیەکە، لەگەڵ هەندیٚ نامەی ((جورجیس)) کە بۆ ((ئەنتۆنی پلانت))ی نووسیبوو.
ئەوەی دەزانرا ((بۆرجیس)) زمانی ڕوسی نەخوێندبوو، کە بۆ ڕوسیا

هەڵات، موخابەراتی سۆڤیەتی لە فلاتێکدا داینا، لە یەکێ لە خانەی بلاوکردنەوە بووە کارمەندو لەساڵی ١٩٦٣ز کۆچی دوایی کرد.... ((فیلبی)) پەشێمان بوو و پەنجەی خۆی دەگەست. بۆ ئەو گەشتەی کە پاشەڕۆژی وەك سیخوڕێکی گەورە لێ شێواند، ئەو پەشیمانیە وای کرد لە ناشتنی ((بورجیس))دا ئامادە نەبێ. هەروەها لە ناشتنی ((ماکلین))یش دا ئامادە نەبوو کە بە شێرپەنجە ساڵی ١٩٨٣ کۆچی دوایی کرد، لە پڕوسیا بەناوی نهێنییەوە ((راس. بێ . مادزوفسکی)) وتاری بلاودەکردەوە...

کە ژنەکەی لە لەندەنەوە هاتە مۆسکۆ ((فیلبی)) رازی کردو خواستی دەگەڕێنەوە بۆ لای ((پلانت))، لێکۆڵینەوەکان دەریان نەخست کەوا خیانەتی کردووە، بەلام بووە جێگای گومان بەوەی هاوڕێیەکی نزیکی ((بورجیس))ە، داوایان لێ کرد لە بەریتانیاوە بیفڕێنن بۆ یەکێتی سۆڤیێت، بەلام ڕازی نەبوو، موخابەراتی بەریتانیا خستیە ژێر لێکۆڵینەوەو پرسیاری لێ کردن ١١ جار بانگیان کرد بۆ لێپرسینەوە بەلام هیچ بەڵگەیەکیان دەست نەکەوت.

لەساڵی ١٩٦٣ز، ئەوەی سەر بە ((پلانت)) بوون بڕیاریان دا کەیەکێکیان ناوی ((میشیل ستریت)) بوو داوای کارێکی فیدراڵی بکات، چونکی دەیزانی کەوا موخابەراتی ئەمریکی لە ڕابردووی ورد دەبێتەوەو نهێنیەکانی ئاشکرا دەبێ، خۆیان باسی ئەوەیان بۆ کردن کە بەشدار بووە لە موخابەراتی سۆڤیێی، ئەمەش لە ڕێگای ((پلانت))ەوە بووە. هەندێ کاری سیخوڕیشی کردووە بەر لەوەی لە حیزبی شیوعی دوور بکەوێتەوە....موخابەراتی بەریتانی ئەمەی ڕووبەڕووی ((پلانت)) کردەوەو داوایان لێکرد هەموو شتێ بدرکێنێ ئەوا ((حەسانە))ی دەدەنێ. ((پلانت)) بەمە ڕازی بوو، بەلام هەر ئەوانەی گوت کە

موخابەراتی بەریتانی دەیزانی... ئەوەی ئاشکراکرد کەوا ((لیولونگ)) ئەفسەری موخابەراتی بەریتانی لەکاتی شەڕدا چۆتە ناو موخابەراتی سۆڤێتیەوەو بووەتە سەرچاوەی زانیارییەکان بۆیان.

هەروەها گومانەکانی موخابەراتی سەلماند لەبارەی ((جۆن کیرتکوس))ەوە کە پێنجەم کەسی شانەکە بوو. دواجا هەردووک ((لونگ))و ((کیرتکوس)) دانیان بە تاوانەکانی خۆیان نا. هەروەها ((پلانت)) ناوی ئەو ئەفسەرانەی ئاشکرا کرد کە موخابەراتی سۆڤێتی بوون و لەگەڵیاندا کاری کردووە. بەتایبەتی ((وری مودن)) کە پەیوەندی لەگەڵ سیخوڕە ((شارەزاکان))دا هەبوو، پلانت دەیزانی قسەکانی نرخێکی ئەوتۆیان نییە، چونکی ڕوسەکان لەبەریتانیا نەمابوون....

ئەوەی ئاشکرایە ((مودن)) ساڵی ١٩٥٦ز لە لەندەن دەژیا، کە گوازرایەوە بۆ مۆسکۆ، بەگەرمی پیشوازی لێکرا، بەوەی سەرکردایەتی سیخوڕەکانی بەریتانییەکانی کردووەو پلانی هەڵاتنی ((فیلبی)) بۆ مۆسکۆ داڕێژاوە، بۆیە کردیانە گەورە مامۆستای سیخوڕی هەواڵگری سۆڤێت. نەوەیەکی بۆ سیخوڕی پێگەیاند. ساڵی ١٩٩٠ز وەکو ئەستێرەیەکی گەشی سیخوڕی سۆڤێت بوو جێگا گرنگی پێدانی میدیاکان و ئێستگەکانی ڕۆژهەڵات.... سەبارەت بە بابەتی ((پلانت)) موخابەراتی بەریتانی لەگەڵیا ڕێکەوت شتەکان بە نهێنی لە نێنانیاندا بمێنێ، بەڵام هەندێ لە کارمەندی موخابەراتی بەریتانی، ئەم ڕێککەوتنەیان شکاندو نهێنی ڕێککەوتنەکەیان گەیاندە نووسەر ((ئەنتۆنی بویل)) ئەویش کردیە بابەتی ڕۆمانی ((پیاوی چوارەم)).خەڵکی وروژاند سەرۆکی وەزیران ((مرگریت تاتشەر)) ناچار بوو دانی پێدا بنێ کە ڕێککەوتنێکی ئاوها ڕویداوە، کەوتنە پرسیار کردن ئایا پیاوێکی وەك ((پلانت)) شایستەی ئەوەیە حەسانەی پێ

بدریٚ....

لەگەڵ ئەوەشدا ((پلانت)) نرخی ئەوەی دا، نیشانەکانی لیٚ وەرگیرایەوەو بە ئاشکراش لە ڕۆژنامەکان بە خراپە ناویان دەهێنا.... ئیتر نەیدەتوانی بە ئاشکرا لە شوێنە گشتیەکاندا دەرکەوێت، تاساڵی ١٩٨٣ کۆژی کرد.

کە هاوڕێکانی پرسیاریان لیٚ کرد بۆچی خیانەتت کرد؟ وڵامێکی سەیری دایەوە کەوا : پاپا بانگی کردووەو ویستوویەتی

## ◆ ◆ ئەفانسی شوروخوف موخابەراتی سۆڤێتی ئاشکرا دەکات ◆ ◆

ناوە خوازراوەکانی ئەم سیخوڕە: ((ڤلادیمیر بیترۆف ، بروليتا رسكی، سڤین ئەلسون)) ...... لەناو هاوڕێکانیدا کە ئەندامی یانەی ڕوسی بوون لە ((کانبیرا)) لە ئوسترا لیا ناسرابوو، بە ((فلادیمیر بیتروف)) وەك سکرتێری سێیەم لە باڵیۆزخانەی سۆڤێتی کاری دەکرد. ڕوسییەکی نموونەیی بوو، نموونەی پیاوێکی ڕوسی بوو، کە زۆر حەزی لە گۆرانیە غەمگینیەکانی قەرەجەکان دەکرد، لەززەتی لە هەموو شتێکی ئوسترالی وەردەگرت، تا فوتبۆلیش، زانیارییەکی فراوانی هەبوو لەبارەی فوتبۆڵ و تیپەکان و بارودۆخیان....

بە پێچەوانەی کەسی ڕوسی لەسەردەمی ستالین ١٩٥٣، هەمیشە دەم بە پێکەنین و حەزی لە نوکتەو قسەی خۆش دەکرد. ((بیترۆڤ)) ئوسترالیەکانی خۆش دەویست زۆر جار لە بەردەمیاندا ئەم خۆشەویستیەی بۆ دەربڕیون.... هەموو ئەندامانی یانەکە، نەیاندەزانی چۆن چۆنی لە ((بیترۆڤ)) سوود وەرگرن، بەڵام یەکێك لەو ئەندامانە هەوڵی دا پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەو دیبلۆماتکارە سۆڤێیەتیە ببەستیٚ.... ئەمەش ڕێکەوت نەبوو، دکتۆر ((میخائیل بیالۆجسکی)) پەناهەندەیەکی پۆڵەندی بوو، سیخوڕی موخابەراتی ئوسترالی بوو، لەو یانەیە بووە ئەندام کە دیبلۆماتە ڕوسیەکان دەهاتنە ئەویٚ......

بیجگە لە دیبلۆماسەکان، کارمەندە بازرگانەکان و هەندێ لە کۆچەرانیش هاموشۆی ئەو یانەیان دەکرد. موخابەراتی ئوسترالی دەیزانی ئەوە ڕاوێکی چەورە، ((بیالۆجیسکی)) زانی کە خەریکی ڕاوکردنی ((بیترۆڤ))ە، کاری ڕاستەقینەی ((بیترۆڤ)) لە ((کافتیرا)) وەکیلی موخابەراتی سۆڤێتی بوو لە ئوسترالیا، هەر لە ساڵی (١٩٥١ز) ەوە خەریکی ئەو کارە بوو. موخابەراتی ئوسترالی دڵنیابوو کەوا پیاوی موخابەراتی سۆڤێتیە. تەمەنی ٤٤ ساڵ بوو، ناوی خوازراویشی ((ئەفانسی شوروخۆف)) بوو. بیست ساڵە لەکاری دەریایی و دیبلۆماسیدا کاری کردبوو، لە پەکین و ستۆکۆلم مابووەوە. هەمیشەش ((ئیفدوکیا))ی ژنی لەگەڵدا بوو. کە ئەمیش لە موخابەراتی سۆڤێتی کارمەند بوو. ((بیترۆڤ)) لە کۆد _ شفرە _ شارەزابوو، پێشتر لە هێزی دەریایی سۆڤێت لە تەمەنی بیست ساڵیدا کاری کردبوو، دواجا لەبەر شارەزای لە شفرەدا کەوتە ناو موخابەراتی سۆڤێتیەوە... لەژێر دەستی سیخوڕە گەوەکانی ڕوسیا ڕاهێنرابوو و مەشقی پێکرابوو، بۆیە بووە سیخۆڕێکی بەتوانا و زۆر بە باشی کاری شفرە ناردن و خوێندنەوەی دەکرد.

دەنگوباسی لێهاتووی گەیشتە موخابەراتی ئوسترالی، زانییان ((بیترۆڤ)) بۆ ئەوە گواستراوەتەوە بۆ ئوسترالیا، تاکو تۆڕی سیخوڕیەتیەکی سەرکەوتوو زیندو بکاتەوە لەکاتی شەڕدا، زۆربەی ئەندامانیشی کۆمۆنیست بوون، دوای تەواو بوونی شەڕ بەهۆی شەڕی ساردەوە گەلێ پیاوانی موخابەرات خۆیان دوور خستبووەوە، وا ئێستا موخابەراتی سۆڤێتی دەیەوێ سەر لە نوێ تێهەڵچێتەوە......

پلانی موخابەراتی ئوسترالی ئەوەبوو: وا لە ((بیالۆجوسکی)) بکات، کەوا زوو خۆی دەربخات کە کۆچەرێکە لایەنگری سۆڤێت دەکات، و

لەگـەڵ ((بـیترۆڤ)) بکەوێتـە گفتوگـۆی سیاسـیو دواجـا لـە ئـارەزووی سیاسـی ڕاسـتەقینەی دوری بخاتـەوە. ((بیالۆجـسکی)) سـەری سـوڕما لەوەی کـەوا ((بـیترۆڤ)) دەیـەوێ ئەو باسانەی گوێ لێ بـێ کە پشتگیری کردنی سۆڤێت دەردەخات، چەند زیاتر لە ((فولدیا)) _ ئەمە ناسناوێکی بیترۆڤ بوو کە حەزی دەکرد بەو ناوەوە بـانگی بکـەن _ نزیك دەکەوتـەوە، ئەوەنـدە دڵـی خـۆی بـۆ دەکـردەوە، لـە ڕاسـتیدا ((بـیترۆڤ)) لـەو ماوەیـەدا دەیویـست لـە وەهمـی سـیخوڕێتی دوور بکەوێتـەوە، یەکـەم هـەنگاو ئـەم لایەنـەی بـۆ ((بیالۆجیـسکی)) ئاشـکرا کـرد، پێـی گـوت کـەوا ژنەکـەی ((ئیفدوکیا)) حەز دەکات دوور کەوێتەوە، بەڵام مۆسکۆ ڕازی نابێ.

((بیترۆڤ)) هەمیشە نەیدەویست کاری ڕاستەقینەی خۆی ئاشکرا بکات، کـەوا پیـاوێکی موخابەراتـەو بـۆ سـۆڤێت کاردەکـات ... کێشەکەی دوو لایەنە بوو:

یەکـەمیان: کـارێکی سـاختەییان پـێ ڕاسـپاردبوو ئـەویش سـەرلەنوێ دامەزرانـدنی تـۆڕی سـیخوڕی سـۆڤێتی لـە ئوسـترالیا، بـەجۆرێ وەکـو پێـشووی چـۆن بـوو بگاتـە ئـەو ڕادەیـە، ئەمـەش هـەروا ئاسـان نـەبوو، مۆسکۆش پەلەی بوو، بەڵام ئەو داوایەی مۆسکۆ بەلای کەمەوە دەسالێی دەویست....

دووەمیـان: کـە لـە هـەمووی خـراپتر بـوو، کـەوا ((لافتـیری بیریـا)) سـاڵی ١٩٥٣ هەڵواسـرا دوای ئـەوەی سـتالین مـرد هـەوڵی دابـوو دەسـەڵات بەدەستەوە بگرێت. بۆیە دەوست کرابوو بە لابردنـی ئەوانەی هەواداری ((بیریا)) بوون.

بیترۆڤ زانی، کەوا ئەو پیاوانەی کە کاریگەریان هەبوو لەناو موخابەراتی سـۆڤیەتیدا، داوایـان لێکـرا بـۆ مۆسـکۆ بگەڕێنـەوە، لـەوێ بـە گوللـە سەریانیان تەقاندبوو، بیترۆڤ هەستی بە مەترسی کرد، چونکی ((بیریا))

دەیزانی چەندە بەتوانایە بۆیە پلەیان بەرز کردبووەوە، ئێستا لەو پلە بەرزکردنەوەیە دەترسیێ، چونکی ڕەنگە وابزانن کەوا ((بیترۆڤ)) سەر بە ((بیریا))یە پیاوانی موخابەراتی ئوسترالی هەستیان کرد کەوا ماوە هاتووە، فەرمان بۆ ((بیالۆجیسکی)) دەرچوو، تا لەگەڵ ((بیترۆڤ)) دا لەو مەسەلەیە بدوێ. لە ئەیپرلی ساڵی ١٩٥٤ز هەموو شتێك لە میشکیا سڕایەوە کاتێ مۆسکۆ بانگیان کرد تا وتووێژی لەگەڵدا بکەن، هەر زوو بڕیاری خۆی دا، بڕیاری یاخی بوون و هەڵگەڕانەوەی دا، پەیوەندی بە هاوڕێکەیەوە ((بیولۆجسکی)) کرد، هەلآت، بەلآم موخابەراتی سۆڤێتی ژنەکەیان گرت، بیترۆڤیش لەماڵی سیخوڕێکی موخابەراتی ئوسترالی خۆی شاردەوە.....

لێرەوە یەکێ لە سەیروسەمەرەترین لاپەڕەکانی سیخوڕێتی شەڕی سارد دەستی پێکرد. موخابەراتی سۆڤێتی بڕیاریدا، ژنەکەی ((بیترۆڤ)) بۆ مۆسکۆ بگەڕێنێتەوە، مەبەستیش لەمە وەکو بارمتەیەك بێ و مێردەکەی ناچار بکات تا نهێنی موخابەراتی سۆڤێتی بۆ موخابەراتی ئوسترالی ئاشکرا نەکات، مۆسکۆ دەیزانی نهێنی زۆر لە لایە ئەگەر ئەو نهێنیانە ئاشکرا بکات دەبنە کارەساتێك بۆ یەکێتی سۆڤێت، ئەوەشی ئەو لەبارەی شفرەی موخابەراتی سۆڤێتیەوە دەیزانی کێشەیەکی گەورەیە بۆ سۆڤێت.........

موخابەراتی سۆڤێتی فڕۆکەیەکی تایبەتی بۆ ئوسترالیا نارد، ژنەکەی بیترۆڤ بۆ مۆسکۆ بگەڕێنێتەوە، بێگومان لەگەڵ هێزێکی ئاسایشدا کە ئەگەر پێویستی کرد بەهەر نرخێك دەبێ بیگەڕێننەوە بۆ مۆسکۆ، لەلایەن یاساشەوە ئوسترالیا بۆی نییە نەهێڵێ ژنەکەی ((بیترۆڤ)) بگەڕێتەوە.

بەلآم موخابەراتی ئوسترالی پلانێکی دانا، نەك هەر ڕزگاری دەکات بەڵکو

گورزێکی گه‌وره‌ش له موخابه‌راتی سۆڤێت ده‌دات....

ئوسترالیه‌کان ده‌یانزانی که‌وا فڕۆکه‌که له گه‌ڕانه‌وه‌یدا له ((داروِن)) ده‌بێ به‌نزین هه‌ڵگرێ، بۆیه هه‌واڵی فڕۆکه‌که‌یان گه‌یانده ئامرازه‌کانی ڕاگه‌یاندن و کیدیاکان. که فڕۆکه‌که نیشته‌وه، بینیان ژماره‌یه‌کی زۆر له په‌یامنێری ڕۆژنامه‌کان و TV و رادیۆکان و وێنه‌گرو ئاژانسی ده‌نگوباسه‌کان له‌وێدا کۆببونه‌وه. هاتبوون هه‌واڵه‌که بلاوبکه‌نه‌وه: که ژنێك مێرده دیبلۆماسیه‌که‌ی خۆی خۆشده‌وێت و حکومه‌تی یه‌کێتی سۆڤێت به‌زۆر له مێرده‌که‌ی دوری ده‌خاته‌وه و بۆ مۆسکۆی ده‌گه‌ڕێنێته‌وه.

بوونی ڕاگه‌یاندنه‌کان به‌و زۆرییه‌ی بووه مایه‌ی ئاپوره‌یی و واژه‌واژو شپرزه‌بوون.... که موخابه‌راتی سۆڤێتی خسته ناو چه‌ند هه‌ڵه‌یه‌که‌وه..... کارمه‌ندانی کۆچ و پاسه‌پۆرت، داوایان له پاسا و له سۆڤێتیه‌کان کرد که له فڕۆکه‌که دابه‌زن له‌گه‌ڵ ژنه‌که‌ی ((بیترۆڤ))دا، هه‌رچه‌نده هۆیه‌که یاسایی نه‌بوو، پاساوڵه‌کان فه‌رمانه‌که‌یان به‌جێ هێنا، داوایان لێکردن بڕۆنه فڕۆکه خانه‌که‌وه، له‌وێ پیاوانی موخابه‌راتی ئوسترالی، ژنه‌که‌یان جیاکرده‌وه‌و ته‌له‌فۆنێکی وه‌رگێڕیان له‌گوێی نا... که یه‌کسه‌ر مێرده‌که‌ی په‌یوه‌ندی پێوه کرد، داوای له ژنه‌که‌ی کرد، به‌ده‌نگی به‌رز تا میدیاکان گوێیان لێ بێ، داوای په‌ناهه‌نده‌یی سیاسی بکات و بڵێ ((نامه‌وێ بگه‌ڕێمه‌وه بۆ مۆسکۆ)) ئه‌مه شه‌ریعه‌تی یاسایی به‌ده‌سه‌لاتدارانی ئوسترالی دا له ده‌ستی سۆڤییه‌تیه‌کانی ده‌رکه‌ن.

پاساوڵه ڕوسه‌کان هه‌ڵه‌یه‌کی درامی دیکه‌یان کرد، ویستیان ئه‌و فرمانه‌ی مۆسکۆ پێی داون جێ به‌جێ بکه‌ن و به‌زۆر بیگه‌ڕێننه‌وه... ده‌وره‌یان داو ویستیان ناچاری بکه‌ن به‌زۆر بۆ ناو فڕۆکه‌که‌ی ببه‌ن. ئوسترالیه‌کان داوایان لێ کردن تا زووه لێره نه‌مێنن... ئه‌مه هه‌مووی له‌به‌رچاوی

میدیاکانەوە ڕویدا، ڕۆژنامەکان وێنەی ژنەکەی ((بیترۆڤ))یان بۆ جیهان بلاْوکردەوە، کە دەیویست خۆی لەدەست دوو یاساولْی سۆڤێت دەربهێنێ...

بەتایبەتی ئەمە لەکاتێکدا ڕیودا، حکومەتی سۆڤێتی هەولْی ئەوەی دەدا وێنەی خۆی لەبەر چاو جیهاندا باش بکات، ڕۆژنامەکانی جیهان ڕووی ڕاستەقینەی شیوعیەکانی سۆڤێتی بلاْوکردەوە، سەرکردەکانی موخابەراتی یەکێتی سۆڤێت ئەمەیان بەکارەسات زانیْ.... شەش لەو سیخوڕانە خۆیان کە پەیوەندیان بە مەسەلەکەوە هەبوو بۆ سیبریا دوورخستەوە. کە بترۆڤو ژنەکەی هەستیان بە ئاسایشو ئەمن کرد لە ئوستراليا، گورزێکی دیکەیان گەیاندە موخابەراتی سۆڤێت....

((بترۆڤ)) کۆپی ئەو ڕاپۆرتانەی لە سالْی ١٩٥٢ بۆ مۆسکۆ دەنارد لە لابوو، ناوی ئەو سیخوڕە ئوسترالیانەی ئاشکرا کرد کە بۆ سۆڤێت کاریان دەکرد. ئوسترالیەکان سودێکی زۆریان بە سیستەمی شفرەی موخابەراتی سۆڤێت وەرگرت. کە بیترۆڤ بە ئوسترالیەکانی دابوو، لەو شفرانە ئەمریکا و بەریتانیاش سوودێکی زۆریان لیْ بینی...

هەوالْ پرسینو دواندنی ((بیترۆڤ)) زۆر نهێنی دیکەی لیْ ئاشکرابوو.... لەوانە: ((جای جۆربۆرجیس))و ((ماکلین)) کە دوو دیبلۆماسی بەریتانی بوونو سالْی ١٩٥١ز بۆ مۆسکۆ هەلاْتن، لە ڕاستیدا خائینی ولاْتەکەیان بوونو موخابەراتی سۆڤێتی نزیکەی ٢٠ سالْ لەوەو پێش بەکارهێنابوون بۆ سیخوڕی....

کە لێبوونەوە وەلاْمی هەموو پرسیارەکانی دانەوە، بیترۆڤ وەکو هاولاْتیەکی ئوسترالی ژیانی دەبردەسەرو ناوێکی نوێی بۆ خۆی دانا ((سفین ئەلیسۆن)) گوایە پەناهەندەیەکی ئەسکەنەنافیە... پیترۆرڤو ژنەکەی لەبارەی ئەزموونی خۆیانەوە کتێبێکیان نووسیو دوکانێکی

بچکۆڵەیان کردەوە، تا ((ئیفدۆکیا)) ساڵی ١٩٩٠ز کۆچی دوایی کرد.
ساڵی ١٩٩١ز بیترۆڤ کۆچی دوایی کرد

## ◆ ◆ ئەناتۆلی جولستین، لیهاتوو بوو یا شێت؟ ◆ ◆

ئەفسەرانی قەڵاچۆکردنی سیخوڕی، کۆمەڵێ کاغەزیان لەسەر مێزی ڕائید ئەناتۆلی جولستین دانا،...... ئەناتۆلی ئەفسەرێکی موخابەراتی سۆڤێتی بوو.... وتیان ((تکایە ئەم ڕاپۆرتە جیابکەرەوە بزانە کامەیان لە مۆسکۆ سەرنجت ڕادەکێشێ.....))

ئەوانەی کە بەدوای سیخوڕی وڵاتدا دەگەڕان لە ئەمریکی و فرەنسی و بەریتانیەکیش دانیشتبوون.... کە ناوی نهێنی ((تولکا)) بوو کاغەزەکانی دەخوێندەوە.

ئەمە لە مایسی ساڵی ١٩٦٢زدا دابوو، بەر لەچەند هەفتەیەك لە هەڵاتنی ((جولیستین)) بۆ ناو موخابەراتی ئەمریکی، کە وەکیلی موخابەرات بوو لە ((هلسینکی)) لە فلەندا، وای پێشاندابوو کە زانیارییەکی گرنگ و زۆری لەلایە لەبارەی موخابەراتی سۆڤێتیەوە لە هەموو جیهاندا. وتی دەمەوێ بەتەنها بە گژ سیخوڕیدا بچم و ئەوانەی بۆ موخابەراتی سۆڤێتی کار دەکەن لەبن دەریان بهێنم....وەکو نموونەیەك لە زانیارییەکانی، بۆ ئەوانەی پرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرد وتی: بەڵگەیەکی زۆر نهێنیم لێرەدا لەبارەی ((ناتۆ))ەوە خوێندەوە، چونکی سیخوڕەکانی سۆڤێت بەردەوام بڕیارەکانی ((ناتۆ))یان، ئەوانەی لە ئاستێکی بەرزدا بوون دەگەیاندە مۆسکۆ.

ئەگەر ئەمە ڕاستبێ، ئەوا موخابەراتی سۆڤێتی توانیوەیەتی دزە بکاتە ناو پەیمانی ئەتڵەسییەوە..... هەندێ لەوانەی لەوێ بوون، بڕوایان نەکرد کارێکی وا هەبێ، ئەوانەش وا هەڵدەگەڕێنەوە یان هەڵدێن، لەم جۆرە قسانە دەکەن تا شوێنی خۆیان خۆش بکەن و پایەو دەسکەوتیان

دەسست کەوێت. بۆ دڵنیابوون و تاقیکردنەوەی ((جولیستین)) کەوا موخابەراتی سۆڤێتی دزەی کردۆتە ناو پەیمانی ناتۆوە، بەڵگەنامەیەکی زۆریان خستە بەرچاوی . لەوانە چەند ڕاپۆرتێکی ساختە، ئەگەر زانیاری تەواوی هەبێ ئەوا ئەو ڕاپۆرتە ساختەیە ڕەتدەکەنەوە.... سەریان سووڕما کاتێ ئەو تاقیکردنەوەیەی بە گەکەیەکی منداڵانە دانا. بەدەنگی بەرز هاواری کرد: ((ئەم بەڵگەنامەیە ساختەیە)). ((جولیستین)) لەماوەی نیو سەعاتدا هەموو بەڵگەنامەکانی جیاکردەوە بەبێ هەڵەکردن بەڵگەنامە ساختەکانی لادا.... کە لێیان پرسی، چۆن بەم خێراییە توانی جیایان بکاتەوە، وتی: ((زۆرئاسانە، من پێم نەگۆتن ئەم بەڵگەنامانەم پێشتر لە مۆسکۆ خوێندۆنەتەوە.......؟)).

بەسەرکەوتویی لەم تاقیکردنەوەیە ((جولیستین)) چووە ناو داستانی سیخوڕییەوە، زۆر ناوی پیاوانی موخابەراتی سۆڤێتی ئاشکرا کرد کە لە ڕۆژئاوادا کاریان دەکرد.

لە ڕابردووی ((جولیستین)) هیچ شتێکی ئەوتۆ نەبوو ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە کارێکی ڕوخێنەری کردبێ. لەوەوی زیاتر ڕۆڵی هەبووە دژی موخابەراتی سۆڤێتی. لەساڵی ١٩٢٦ز لە خێزانێکی جوتیاردا لە ئۆکرانیا لە دایك بووە، ڕابردووی ئەوەی دەرخست کە یەکێکە لە پیاوانی موخابەراتی سۆڤێتی و دڵسۆزانە کارەکانی ئەنجام دەدا: قوتابخانەی سەربازی تەواوکردووە، ئەندام بووە لە بزوتنەوەی لاوانی حیزبی شیوعی. چۆوەتە قوتابخانەی سەربازی و لەوێدا بووە بە ئەندامی حیزبی شیوعی. چۆتە ناو تیپی قەلاچۆکردنی سیخوڕی سەربازییەوە، دواجا موخابەراتی سۆڤێتی وریگرتووە. کە موخابەراتی سۆڤێتی ناردوویەتی بۆ قوتابخانەی موخابەراتی باڵا، ئەو قوتابخانەیەی کە بۆ پایە بەرزەکانی سیخوڕ ئامادە دەکات، سەرکەوتوو بووە تیایدا.....

ساڵی ١٩٥٣ز بۆ ڤییەننا گوازراوەتەوە، کە لەوێ وێستگەیەکی گرنگی دەرەوەیە. دووای دوو ساڵ گەڕاوەتەوە بۆ موخابەراتی سۆڤێتی لە مۆسکۆ. کراوە بە ئەفسەر لە شوێنێکی هەستیاردا، ئەویش بەڕێوەبەرایەتی ((ئەنگۆ _ ئەمریکی))یە. لەوێدا بەڵگەنامە نهێنییەکانی ((ناتۆ))ی بینیوە... لەساڵی ١٩٦١ز بۆ ((هلسینکی)) گوێزرایەوە، لەوێش وێستگەیەکی گرنگی موخابەراتی سۆڤێتی هەبوو. ئێوارەیەکیان بەفر دایدابوو، خۆی و ژنەکەی و کچە حەوت ساڵیەکەی چوونە باڵیۆزخانەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و داوای پەناهەندەی سیاسی کرد.

((جولیستین)) نەیدەزانی موخابەراتی ئەمریکی پێی سەیر نەبووە کە داوای پەناهەندەیی کردووە. بەر لە حەوت ساڵ ئەفسەرێکی موخابەراتی سۆڤێتی بەناوی ((((بیتر دیریابم)) چووبووە باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە ڤییەننا، لە باڵیۆزخانەکە داوایان لێ کردبوو، کەسایەتی پیاوانی موخابەراتی سۆڤێتی شی بکاتەوە بەتایبەتی ئەوانەی ڤییەننا. کامیان پێشبینی لێ دەکرێ لە سۆڤێت هەڵگەڕێتەوەو هەڵبێ، خوویان بە هەوڵی موخابەراتی ئەمریکی بێ..... ((دیریباین)) ئەوکاتە ناوی ((جولیستین))ی هێنابوو کە ئەگەری ئەوەی هەیە داوای پەناهەندەیی سیاسی بکات لە پاشەڕۆژدا.... هەرچەند هیچ شتێکی لەسەر تۆمار نەکرابوو، ئەوەشی وتبوو: کابرایەکی لووت بەرزە، زیادە ڕۆیی دەکات لە ئاواتەکانی و هەمیشە حەز دەکات ئەوانەی لەسەرووی ئەوەوەن توڕەیان بکات..... کە چەند ساڵێك لەمەوبەر کاتێ لە مۆسکۆ بوو پێشنیاری سەرلەنوێ ڕێکخستنی بونیەی بەڕێوەبردن و کارگێڕی و کارمەندی موخابەراتی سۆڤێتی کردبوو. بە پێی ئەو پلانە، خۆی لە پۆپەی موخابەرات دانابوو.... ((دیریباین)) ئەوەشی وتبوو کەوا ((جولیستین)) ئاژاوەگێڕەو

بەوەناسـراوە کـە جێگـەی مەترسـییە. ((دیربایـت)) پێـشبینی ئـەوەی کردبوو ئەوا ویستو خوازەکانی ((جولیستین)) ڕۆژێك دێ دەتەقێتەوەو پەنا بۆ لایەکی تر دەبات.....

دەرکـەوت کـەوا ((دیـراین)) ڕاسـتی کـرد، ((جولیـستین)) پیاوێکـە زوو دەگۆڕێ. بۆ ئەوەش بەشداری گەمەی سیخوڕی کردووە چونکی کارێکی وروژێنەرەو سەرکێشی تێدایە، هەڵخەڵەتاندنی تێدایە........

بەلایەو گرنگ نییە بۆ ڕوسیا یا بۆ ئەمریکا یا بۆ بەریتانیا کار بکات بەلایـەوە یەکـە...... چـونکی لەبەشـی ئـەنگۆ _ ئـەمریکی لـە وەکالـەتی موخابەراتی سۆڤێتی کاری دەکرد، زانیارییەکی زۆری دەربارەی پیاوانی ڕوسیا لە ڕۆژئاوا کۆکردبووەوە. لەوانە دەربارەی ((هـ. ر. فیلی))یەوە، کە دەمێـك لەوەوبـەر بـە خـائینی دانـابوو، کـە بـۆ ڕوسـیا کـار دەکـات....

((جولیـستین)) بـووە هـۆی ڕووبـەروو بوونـەوە لـە نێـوان موخابـەراتی بـەریتانیو ((فیلبـی)). کـەزانی نـاتوانێ ئـەو تۆمەتانـە ڕەتبکاتـەوە، هەڵهات....

((جولیستین))دەستی بە لابردنی سیخوڕەکانی سۆڤێت کرد. لەوانە سێ کەسیان دزەیان کردبووە ناو قەڵاچۆکردنی سیخوڕییەوە، وەکو ((جـۆن فاسـال)) کـە کارمەنـد بـوو لـە ئەدمیرالیـەتی بـەریتانیا، کـە سـاڵی ١٩٥٣ گوێزرایـەوە بـۆ مۆسـکۆ وەریـان گرتبـوو. لـە پرۆسـەیەکدا گرتبوویـان بـەناوی ((تـۆڕی هـەنگوین)) کـە موخابـەراتی سۆڤێـی سـازاندبووی تـا تووشـی بکـەن. هەڕەشـەی ئـەوەیان لێ کـرد، ئـەو وێنانـەی گرتبـوونی لـە ((تـۆڕی هـەنگوین))دا بیخەنـە بەردەسـتی گـەورەکانی خـۆی، ئەگـەر ڕازی نـەبێ کـار بـۆ موخابـەراتی سۆڤێـی نـەکات. ((فاسـال)) هەرچـی دەهاتـە بەردەسـتی دەیگەیانـدە موخابـەراتی سۆڤێـی، بەتایبـەتی ئـەو لەبەشـی موخابەراتی دەریاییدا کاری دەکردو ڕاپۆرتەکانی گەلێ گرنگ بوون.

لە پرۆسەیەکی دیکەدا کە لە ((تۆڕی هەنگوین)) دەچوو، موخابەرتی سۆڤێی، دیبلۆماتکارێکی کەنەدیان تووش کرد ناوی ((جۆن واتکنسی)) بوو، ڕازی بوو یارمەتیان بدات، کە ساڵی ١٩٥٨ز بووە باڵیۆز لە مۆسکۆ، بەهۆی کارەکەیەوە گەڵێ نامەی دیبلۆماسی گرنگی دەست کەوت، لە کەنەداو وڵاتانی دیکەوە، لە ڕێگەی ئەوەوە گەیشتە دۆزینەوە شفرەی ڕۆژئاوا.

سێهەمیان: ((جۆرج باکس))بوو، کە مولحەقی فرەنسی بوو لە پەیمانی ((ناتۆ))، ساڵی ١٩٤٦ز کەوتە کارکردن لەگەڵیاندا، زۆر زانیاری پێدان، بەتایبەتی لەبارەی پەیمانی ((ناتۆ))وە، ((جولیستین)) ئەوەشی ئاشکرا کرد کەوا ((باکس)) یەکێك بوو لە زنجیرەی خیانەتکاران کە بۆ موخابەراتی سۆڤێتی کاریان دەکرد..... لەناو گەڵێ ئاستی حکومەتی فرەنسیدا پیاویان هەبوو. وتەکانی ((جولیستین))جێگای بێزاری بوون. سەرۆکی ئەمریکا ((کینیدی)) نامەیەکی بۆ ((شارل دیگول)) نووسیوە، وشیاری پێ دەدا، لەبارەی ئەو کارانەی کە شانەیك ناوی حەرەکی ((سافیر)) بوو، دەیکات و سەر بە موخابەراتی سۆڤێتیە.....

وەکالەتی فرەنسا بۆ قەڵاچۆکردنی سیخوڕی هەوڵێکی زۆری دا بۆ بەدواداچوونی ئەو شانەیە. ئەم هەوڵدانە بووە بابەتی ڕۆمانێکی ((لیون یووریس))و فیلمی ((توبان)) کە ((ئەلفرید هیتشکوك)) دەرهێنەرەکەیەتی...... لەکۆتایی ساڵی ١٩٦٣ز ((جولیستین)) ئەوەی دەزانی لەبارەی دزەکردنەکانی موخابەراتی سۆڤێتیەوە هەمووی ئاشکرا کرد. ئەمجا کەوتە ناو بابەتێکی گرنگ و وروژێنەری ترەوە، هەرچەندە زانیاری تەواوی لەبارەوە نەبووب، ئەو بابەتەش: دزەکردنی بۆ ناو موخابەراتی سۆڤێتی بۆ قازانجی ڕۆژئاواز

موخابەراتی ئەمریکی ((جولیستین))ی بە شێوەیەکی کاتی دایە

موخابەراتی بەریتانی، تا کاری تیا بکات، دەیانزانی ڕەزیلەو پارەی خۆش دەوێ بەریتانیا مانگانە ٢٨٠٠٠ دۆلاریان پێدەدا تاکو ڕاوێژکاری بۆ پرۆسەی ((فلونیسی)) کار بکات. کە لەبنەڕەتدا بۆ سەرلەنوێ دامەزراندنی موخابەراتی بەریتانی بوو، ((جولیستین)) دەبوایە هەموو شتێکی بەوردی پێوانە بکردایەو لەبەر چاو بگرتایە..... ئەفسەرێکی موخابەرتی سۆڤێتی بۆ بەریتانیا هەلآت، ناوی ((والتر کریفتسکی)) بوو، ئەو ڕایگەیاندبوو، کەوا لەناو موخابەراتی بەریتانیادا، خائین هەیەو بۆ یەکێتی سۆڤێت کار دەکەن..... هەرچەندە ناوی نەدابوو، بەلآم هەندێ ئاماژەی کردبوو بۆ نموونە وتبووی: لە ((سکۆتلندی کریم المولد)) بیستوویەتی _ ئەم کابرایە لەوەزارەتی دەرەوە کاری دەکرد ئەگەر حکومەت شوێن ئەو ئاماژەیە بکەوتایە ئەوا مەزنەیان بۆ ((ماکلین))و ((هـ. ر. فیلبی)) دەڕۆیشت........ موخابەراتی بەریتانیا ئەو قسانەی کەوا خائینێك لەناو موخابەراتی بەریتانیادا هەیە بە هەند وەرنەگرت و نەکەوتە دوای....... هەر لەودەمەدا ((پلانت)) ناوی دوو سیخوڕی ئاشکرا کردکە بۆ سۆڤێت کاریان دەکرد، بەلآم ناوی نێچیرە گەورەکە لە ئارادا نەبوو، ((ڕایت)) لەو بڕوایەدا بوو کەوا، بەڕێوەبەری موخابەراتی بەریتانی خۆی خائینە ((ڕوجر هولیس))......

کاری ((جولیستین)) لە بەریتانیا کۆتایی پێهات لەوکاتەی کە لە ڕۆژنامەکان ڕاپۆرتێکی لەبارەی پرۆسەی ((فلوینسی))یەوە بلآوکردەوە... کە گەڕایەوە ئەمریکا کەوتە ژێر چاوەدێری سەرۆکی قەلآچۆکردنی سیخوڕی نەیاران. ئەو پیاوە داستانیە بەناوی ((جیمس ئینجلیتۆن)) بوو، بە موخابەراتی ئەمریکی ڕاگەیاند کەوا ڕوسەکان دزەیان کردۆتە ناو موخابەراتی ئەمریکییەوەو دزەکردنەکەش لە ئاستێکی بەرزدایە، ئەوەشی ڕاگەیاند کەوا ئەو خائینە ناوێکی

خوازراوی هەیە ئەویش ((ساشا))یە، بەوەشەوە ناوەستێ و یارمەتی گەلێ خائینی کە دەداو پشتگیریان لێ دەکات.

((ئینجلیتۆن)) کەوتە هەڵوەشاندنەوەی موخابەراتی ئەمریکی تا ئەو خائینە بدۆزێتەوە. ((جولیستین)) تێبینی پێدەدا کەوا پشت بە هیچ کەسێك نابەسترێ ئەوانەی لەبەشی ڕوسی دان لە وەکالەتی موخابەراتی ئەمریکی. بەتایبەتی ئەوانەی بە زمانی ڕوسی قسە دەکەن، بەمجۆرە کارەکانی موخابەراتی ئەمریکی دژی یەکێتی سۆڤێت پەکی کەوت. گومانکردنەکە کە کاری ١٠٠ ئەفسەری هەوڵگری ئەمریکی شلەژاند ئەم گەڕان و بەدواداچوونە گەیشتە ئەوپەڕی لە ساڵی ١٩٦٤زدا، کاتێ کە ئەفسەرێکی موخابەراتی سۆڤێتی بەبێ ڕەوا زیندانی کرا. کە پەنای بردبووە ئەمریکا ناوی ((یوری نوسینکۆ)) بوو سێ ساڵ لە زیندان مایەوە. چونکی ((جولیستین)) بە ((ئەنجیلیتۆن))ی ڕاگەیان کەوا ((نوسینکۆ)) لەلایەن موخابەراتی ڕوسییەوە دزەی کردووە تا ئاژاوە بنێتەوە. ((نوسینکۆ)) بە وانەی لێپێچینەوەیان لێ دەکرد: هیچ خائینێك لە موخابەرای ئەمریکی دا نییە، بە پێچەوانەی وتەی ((جولیستین)) موخابەراتی سۆڤێتی قازانجی لەوەدا نییە ((لی هارڤی ئوزوالد)) سەرۆکی کەنەدی بکوژێ، ئەوەش ڕاست نییە کە کاتێ لە ڕوسیا بووە بۆ ئەمە ئامادە کراوە..

ساڵی ١٩٧٤ز، دەسەڵاتی ((جولیستین)) کۆتایی هات، کاتێ ((ئەنجیلیتۆن)) وای بەباش زانی ڕۆڵی خۆی لە پرۆسەی سیخوڕی لەناو موخابەراتی ئەمریکی ئاشکرا بێ. دۆست و هاوڕێی جولیستین لەناو موخابەرات ئەمریکی و بەریتانیدا هەر مایەوەو ئامادە بوون بۆ یارمەتیدانی لە دەرکردنی کتێبی ((توحفەی هونەری)) کە دەستنووس بوو، کە بەجارێ ڕای ڕۆژئاوایی دەگۆڕی، هەوڵی دا کەلك لە نووسەرە

ناوداره‌كان وه‌رگرێ‌و ئه‌وه‌ی نووسیویه‌تی بكه‌نه كتێبێك بخوێنرێته‌وه. به‌لام كه‌س به‌مه ڕازی نه‌بوو، ئیتر هاوڕێكانی له موخابه‌راتی ئه‌مریكی‌و به‌ریتانی هه‌موویان ئه‌و ده‌ستنووسه‌یان كورت كرده‌وه‌و له ژێر ناوی ((درۆ نوێكانی به‌سالاچواندا)) به‌چاپ گه‌یاند.

جولیستین له شانۆی موخابه‌رات ناوی نه‌ما، هاوڕێكانی زۆربه‌یان مردن یا وازیان هێنا، یه‌كێ له‌وانه ((ئه‌نجلیتۆن)) بوو، له‌سالی ١٩٩٠ن، جولیستین له ئه‌مریكا ده‌ژیا له‌ژێر ناوێكی نهێنیدا........

## ◆ ◆ فلادیمیر ا. فیترۆف ◆ ◆

تاوانی كوشتن زۆر ڕووی نه‌ده‌دا له مۆسكۆ له سالی ١٩٨٢زدا پیاوانی پۆلیس خۆیان له‌به‌رده‌م حاله‌تێكی نا ئاساییدا بینی، كاتێ له باخچه‌یه‌كی گشتیدا لاشه‌یه‌ك كه‌وتووه‌و به چه‌قۆ كوشتوویانه، ژنێكیش به خه‌ستی برینداره، ده‌ركه‌وت كوژراوه‌كه ئه‌فسه‌رێكی گه‌وره‌ی موخابه‌راتی سۆڤێتیه‌و ژنه‌كه‌ش سكرتێره‌كه‌یه‌تی به‌واتایه‌كی كه، ئه‌و كاره پڕ بوو له ئالۆزییه‌كی سیاسی، پۆلیس به زه‌حمه‌ت بۆی ساغ بووه‌وه..... كۆمه‌لێكی زۆر له پیاوانی موخابه‌راتی سۆڤێی گه‌یشتنه شوێنی تاوانه‌كه، كولۆنیل ((فلادیمیر فیترۆڤ))یان له‌گه‌لدابوو، ته‌مه‌نی ٤٥ سال بوو، سكرتێره زامداره‌كه ئاماژه‌ی بۆ كرد كه ئه‌مه ئه‌و كابرا بكوژه‌یه‌و خه‌ریك بووه ئه‌میش بكوژێ. پیاوانی پۆلیس هه‌ر له‌وێدا گرتیان‌و چه‌قۆیه‌كی خویناویان له گیرفان ده‌رهێنا.

((فیترۆڤ)) به‌دوورودرێژی دانی پێدا نا، ڕایگه‌یاند كه‌وا له‌گه‌ل سكرتێره‌كه‌دا برده‌ری هه‌بووه، شه‌وێكیان ئۆتۆمبێله‌كه‌ی له باخچه‌كه‌دا ڕاگرتووه، سكرتێره‌كه‌شی له‌گه‌لدا بووه، له پڕ ئه‌فسه‌رێكی موخابه‌راتی سۆڤێتی دیكه هات‌و ده‌ستی به پیاسه‌كردن كرد، له جامی ئۆتۆمبێله‌كه‌یدا، ناسی‌و ویستی چاك‌و چۆنی له‌گه‌لدا بكات، به‌لام

((فیترۆڤ)) لەبەر هۆیەکی نادیار تووشی ترس و شڵەژان هات، ڕەنگە وای بۆ چووبێ، کەوا ئەو ئەفسەرە دەیەوێ بیگرێ، بۆیە چەقۆی لێ ڕاکێشاوەو داویەتیە بەر چەقۆ، کە سکرتێرەکە ویستوویەتی ڕابکات ((فیترۆڤ)) دوای کەوتوەو چەند چەقۆیەکی لێداوەو ئەوێی بەجێ هێشتووە وای زانیوە مردووە. بەڵام دوای سەعاتێك کە گەڕاوەتەوە شوێنەکە تا بزانێ مردووە یا نە.

پیاوانی موخابەراتی سۆڤێتی دژ بە هەواڵگری بیانی کەوتنە گومانەوە، لەم دیمەنە درامایییە، بۆ کاتێ ((فیترۆڤ)) ئەفسەری موخابەراتەکەی بینیوە تێکچووە؟ دەبێ ڕاستیەکە چی بێ؟ چ فشارێکی لەسەر بووە تا ئەو ئەفسەرە بکوژێ؟ موخابەراتی ڕوسی نەگەیشتە وەرامێکی کوت و پڕ، بڕیاریان دا ((فیترۆڤ)) بخەنە ژێر چاودێرییەکی توندەوە. تۆمەتی کوشتنیان دایە پاڵ و دوانزە ساڵ حوکمیان داو موخابەرات سانسۆرێکی توندی لەسەر دانا، چاودێری نامەکانیان دەکرد، ئەو نامانانەی بۆی دەهاتن دەیانخوێندەوە.... لە دوایدا کلیلی نهێنی تاوانەکەیان دەست کەوت، ((فیترۆڤ)) لە نامەیەکدا بۆ ژنەکەی نووسیبووی، ئەو تاوانی کوشتنە ناچاری کرد دەست لە شتێکی گەورە هەڵبگرێ.

موخابەراتی سۆڤێتی کەوتە تەنگ پێ هەڵچنین بە ((فیترۆڤ)) کەس نازانێ ئایا ئازار درا یا ناء.. بەڵام ئەنجامەکەی گەیشتە ئەوە بەدەستی خۆی بنووسێ.... ناونیشانەکەشی بۆ دانا ((دانپێدانانی خائینێك)) ئەو بەڵگەیە وەکو گورزێك بوو بەسەر موخابەراتی سۆڤێتیدا درابێ..... فیترۆڤ ئاشکرای کرد، کەوا بۆ موخابەراتی فرەنسی خیانەتی لە وڵاتەکەی کردووە، لەوە خراپتر گەورەترین نهێنی هەواڵگری سۆڤێتی ئاشکرا کردووە.....

((فیترۆڤ))یان بە ئەفسەرێکی دڵسۆزی سۆڤێت دادەنا، چۆن وا خیانەتی کردووە؟ ئەندازیارێکی زیرەك بوو، هەر دوای تەواوکردنی خوێندنەکەی، موخابەرات هێنابوویە ڕیزەکانی خۆیەوە.... رایان سپاردبوو، نهێنی ترین یەکەی موخابەراتی سۆڤێتی دامەزرێنێ، کە بە ((هێڵی ئیکس)) ناسرابوو. ئەرکی ڕزگارکردنی یەکێتی سۆڤێت بوو، ساڵی ١٩٦٤زدا، کاتێ ((هێڵی ئیکس)) دامەزرا، موخابەراتی سۆڤێتی و لیژنەی مەرکەزەی حیزبی شیوعی دەیانزانی لە شەڕی ساردا زیان دەکەن، مەسەلەش، مەسەلەی تەکنەلۆژی بوو، ڕژێمی سۆڤێت تا دەهات دوا دەکەوت و لە بواری تەکنەلۆژیا و زانستدا نەدەگەیشتە ڕۆژئاوا، بە تایبەتی لە تەکنەلۆژیای سەربازیدا، زانایانی کۆمپیتەری سۆڤێت، لیژنەی تەنفیزی حیزبی شیوعیان ئاگادار کردەوە، کەوا تەکنەلۆژیای سۆڤێت ٢٠ ساڵ لە دوای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوەیە. ئەو نێوانەش تادێ فراوانتر دەبێت، ئەنجامەکەشی دواکەوتنی یەکێتی سۆڤێتە.

ئابووری سۆڤێت لاواز بوو، بنکەی پیشەسازی لاوازتر بوو، ئومێدی ئەوە نەدەکرا سۆڤێت بگاتە ئاستی ڕۆژئاوا، دەستیان کردە سەرلەنوێ دامەزراندنی موخابەراتی سۆڤێتی، بەو ئاراستەیەی کە هەوڵ بدرێ تا دەتوانرێ تەکنەلۆژیای ڕۆژئاوا بدزن، ((هێڵی ئێکس)) ئەم کارەی لە ئەستۆ گرت، کەوا ژمارەیەکی زۆر لە سیخوڕە ئەندازیارەکان بۆ ئەم لایەنە تەرخان بکرێن، کەدەزانن چی وەدەست بهێنن و چۆن پەیدای دەکەن. ((هێڵی ئێکس)) لە کارەکەیدا سەرکەوتنی وەدەست دەهێنا، لەماوەی ساڵێکدا موخابەراتی سۆڤێت زیاتر لە ٥٠٠٠ نموونەی پیشەسازیان لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان وەدەست هێنا.

شارەزایانی سەربازی ڕۆژئاوا سەریان سوڕما چۆن بەم ماوە کورتە سۆڤێت پێشکەوتووترین تەکنەلۆژیان خستە ناو دیزاینەکانی

خۆیانه‌وه. ((هێلی ئیکس)) به‌یارمه‌تی موخابه‌راتی سۆڤێتی توانیان ئه‌وه‌ی نه‌یانتوانی وه‌ده‌ستی بهێنن دزییان. وه‌کاله‌تی موخابه‌راتی رۆژئاوا به‌ره‌به‌ره ئاگاداری چۆنیه‌تی گواستنه‌وه‌ی ئه‌و ته‌کنه‌لۆژیانه‌یان بوون، که به‌گه‌لێ شێوه‌و رێگا بۆ به‌ره‌ی رۆژهه‌لات ده‌گه‌ێنرا، تا پاره‌یان ده‌دایه ئه‌ندازیارو زاناو کارمه‌ندانی گومرگ تا ئه‌و نه‌خشه سازیانه بگه‌یێنن.

سه‌ره‌رای ئه‌م سه‌رکه‌وتنانه، ((لفیترۆن)) گومان‌و رای تایبه‌تی خۆی هه‌بوو، بیری له هاولاتی سۆڤێت ده‌کرده‌وه، هیوای ئه‌وه‌ی ده‌خواست پێشکه‌وتنی ته‌کنه‌لۆژیا بگه‌یێنێته ئاستی ژیان‌و بژێوی گه‌لی روسیا. به‌لام ده‌یدی که‌وا مانگه ده‌ست کرده‌کانی ئاسمانی سۆڤێت به‌ده‌وری زه‌ویدا ده‌خولێنه‌وه، ئامرازو جبه‌خانه‌ی سه‌ربازی سۆڤێتی له‌گه‌شه‌کردندایه، به‌لام میلله‌ت هیچ پێشکه‌وتنێك له ژیانیاندا به خۆیه‌وه نابینێ.....

یه‌کێتی سۆڤێت هه‌میشه مه‌ترسی له هێزی سه‌ربازی خۆی هه‌بوو، بودجه‌ی ولات زۆربه‌ی بۆ چه‌ك‌و جبه‌خانه خه‌رج ده‌کرێت. له کاتێکدا موشه‌که‌کانی سۆڤێت به‌به‌رده‌م کرملیندا تێده‌په‌رین‌و پێشان ده‌درێن له جه‌ژنی کرێکاران‌و نواندنی سه‌ربازیدا، میلله‌تیش بۆ شت‌و مه‌کی پێویست‌و خوارده‌مه‌نی ریز ده‌گرن، تا بۆ نان کرینیش ریز ده‌گرن.....

((فیترۆڤ)) ئه‌م گومانه‌ی له‌دلێ خۆی ده‌هێشته‌وه، له‌سالی ١٩٦٥ز، بۆ جێ به‌جێ کردنی کارێك بۆ پاریس نێردا .... تا ((هێلی ئێکس)) بپشکنێ، له‌وێ ئه‌و جیاوازییه‌ی بینی له نێوان روسیه‌ك‌و فره‌نسیه‌کدا، تا هه‌ژارترین خێزانی فره‌نسی گوزه‌ران‌و ژیانێکی زۆر باش ده‌ژیا.... گومانه‌که‌ی زیادی کرد، موخابه‌راتی فره‌نسی به‌مه‌ی زانی......

((فیترۆڤ)) رۆژێکیان تووشی رووداوێکی هاتوچۆ بوو، زیانی پێنکه‌وت

بەلاّم ئۆتۆمبێلی کابرای فەرەنسی تێکشکا.... کابرای فەرەنسی چاککردنەوەی ئۆتۆمبێلەکەی ئەویشی خستە ئەستۆی خۆی.
برادەری لەنێوانیاندا پەیدا بوو، کابرای ڕوسی دەستی کردە ئاشکراکردنی ئەوەی لە دلّدا هەلّگرتبوو و نەیدەدرکاند. بەلاّم کابرای فەرەنسی لە پێشدا وا خۆی نیشاندا خاوەن کارە تومەز سەر بە موخابەراتی فەرەنسیەو لە بەشی دژ بە سیخوڕی بیانی کار دەکات.
زانییان کەوا ((فیترۆڤ)) دیبلۆماسی نییە، و بڕیاریاندا زۆر بە وشیاری هەلّس و کەوتی لەگەلّدا بکەن، چونکی بۆیان دەرکەوت سەر بە موخابەراتی سۆڤێتیە....... ڕەنگە دەستی هەبێ لە دزینی زانیاری تەکنەلۆژیا. بە پێی زانیارییەکان فەرەنسا دەیزانی نهێنیەکی زۆری تەکنەلۆژیا دەدزرێت، بۆیە زانییان، ڕاکێشانی ((فیترۆڤ)) بۆ لای خۆیان، ئەو دزی کردنە ڕادەوەستێ..... لە سالّی ١٩٧٠ز، گەشتەکەی بۆ فەرەنسا کۆتایی پێهات، بانگیان کردەوە بۆ مۆسکۆ تا لە بارەگای سەرکردایەتی موخابەراتی سۆڤێتی کار بکات.... هاوڕێ فەرەنسیەکەی بەردەوام بوو لەگەلّیا، بەلاّم ڕاستەوخۆ هەولّی نەدەدا، بەلاّم دلّنیای کرد، کەوا هاوڕێیەکی لە فەرەنسادا هەیەو هەر کاتێ پێویستی کرد دەتوانێ یارمەتی بدات، فیترۆڤ سالّی ١٩٨٠ز داوای لە هاوڕێ فەرەنسیەکەی کرد سەردانی مۆسکۆ بکات. لەگەلّ ((فیترۆڤ)) یەکیان ببینی داوای کرد کەوا ئامادەیە بۆ موخابەراتی فەرەنسی کار بکات.
دوای چەند دیتنێ، لەپالّ دیوارەکانی کرملندا بەلگەنانەی نهێنی گرنگی پێدا، هەمووی لەسەری نووسرابوو، وێنە گرتنی ئەم بەلّگانە قەدەغەیە. ئەو بەلّگانە زانیاری تەواوی ئەو دزینانە بوو کە لە بواری تەکنەلۆژیادا کرابوون و سۆڤێت ئەنجامی دابوون. موخابەراتی فەرەنسی ئالەتێکی وێنەگرتنی گەلێ پێشکەوتووی دابووە ((فیترۆڤ)) بۆ وێنەگرتن.

((فیترۆڤ)) ئەو فلیمانەی دەدایە دەستی ئەفسەرێك کە لە مولحەقیەتی سەربازی فرەنسی لە باڵیۆزخانە کاری دەکرد.

هاوپەیمانانی ڕۆژئاوا هەموویان سوودیان لەو بەڵگەنامانە وەردەگرت. دوو قازانجیان لەو بەڵگانە دەست دەکەوت: ئەو تەکنەلۆژیانەی سۆڤێت پیویستی پێیان هەبوو، لەلایەکی ترەوە خاڵی لاوازی تەکنەلۆژیای سۆڤیەتیان زانی.... سەرەڕای ئەوەش ٣٠٠ سیخوڕیان بۆ ئاشکرا بوو، کاریان دزینی تەکنەلۆژیا بوو.... هەروەها ١٠٠ کەسیشیان کە لە ڕۆژئاوابوون و یارمەتی سۆڤێتیان دەدا، بۆ ئاشکرا بوو ئەمە کارەساتێکی گەورە بوو بۆ موخابەراتی سۆڤێت، کارەساتەکە گەورەتر دەبوو، ئەگەر ئەو تاوانەی لە باخچەکەدا ئەنجام نەدایە. هەر کە فرەنسا زانی ((فیترۆڤ)) گیراوە. لەگەڵ هاوپەیماناندا بڕیاریان دا، بەرەکە لە ژێر پێی ((هێلی ئێکس)) ڕابکێشن.... لە فرەنسا ٤٧ ئەفسەری موخابەراتی سەر بە سۆڤێت دەرکران، کەلەژێر پەردەی دیبلۆماسیدا کاریان دەکرد، لەوڵاتەکانی تریشدا ١٥٠ سیخوڕیان دەرکرد.

سۆڤێت خۆشی بەپەلە، ٢٠٠ سیخوڕی لە ڕۆژئاوا کیشایەوە. هەندێکیشیان لە رۆژئاوا زیندانی کران.

بەمجۆرە ((هێلی ئێکس)) ڕوخا، سۆڤێت تا دەهات دوادەکەوت و کەچی دروستکردنی بینای سەربازی ئەمریکی ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی دەسەندو لە پێشکەوتندا بوو، لە سەردەمی ((ڕۆنالد ریگن))دا. ناچار سۆڤێت پشتی بەسەرچاوەی تایبەت بەست، بەڵام ئاشکرای نەکرد چییە... ئەم سەرلێشێواندنە بووە هۆی ڕوخانی باری ئابووری سۆڤێت، کە هۆی سەرەکی ڕوخانی یەکێتی سۆڤێت بوو.

ڕق و تووڕەیی موخابەراتی سۆڤێت کەوتە سەر فیترۆڤ هیچ سیخوڕێك جگە لە ((ئولیج بنکۆفسکی)) کەسی تر، زیانی ئاوای لە موخابەراتی

سۆڤێت نەگەیاندبوو. موخابەراتی سۆڤێتی ویستیان دادگایی بکەن، بەڵام ئاشکرا ڕایگەیاند، دادگایکردنی دەکاتە سەکۆیەك بۆ قسەکرد لەبارەی سەرنەکەوتنی سەرکردایەتی یەکێتی سۆڤێتو تاوانباترکردنی موخابەرات. سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەم وتانە بخاتە سەر دان پێدانانەکەی:

((داخی ئەوە دەخۆم نەمتوانی زیانی زۆرتر بە یەکێتی سۆڤێت بگەیەنمو خزمەتی فرەنسا زۆر بکەم....)).

لە بەیانیەکی بەهاری ساڵی ١٩٨٣، بەبێ دادگایکردن گوللەبارانیان کرد

## ◆ ◆ ئولیج بنکۆفسکی سەربازی ئاشتی !!؟ ◆ ◆

چوار ناوی حەرەکی هەیە: ئەلیکس، وتشۆك، هیرو، یوجا... هەندێ سەرچاوە لایان وایە، بازنەیەکی دیاری سیخوڕی لە شەڕی ساردا شەوی ١٢ ئاب ١٩٦٠ دەستی پێکرد، لە یەکێ لە مەلهلاکانی مۆسکۆدا، کاتێ کابرایەکی قەڵەوی دامەزراو، چوارشانە، قژ سوور، بەرامبەر دوو گەشتیاری ئەمریکی ڕاوەستاوەو دوو زەرفی دایە دەستیان، داوای لێ کردن ئەو زەرفانە بگەیننە موخابەراتی ئەمریکی، ئیتر دیار نەماو لەبەر چاو ون بوو.......

ئەو دوو گەشتیارە سەریان سوڕما، چونکی ئاگادار کرابوونەوە کەوا موخابەرتی سۆڤێتی، تەڵە بۆ گەشتیارە بیانییەکان دەنێتەوە شتیان بە دەستەوە دەدەن، دواجا دەیانگرنو دەیانکوژن.... دوای وتووێژ لە نێوان خۆیاندا، بڕیاریان دا ئەو دوو زەرفە بدەنە باڵیۆزخانەی ئەمریکی لە وتنێکی دیکەدا، ڕۆژێ لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ز، ئەو ساڵەی ((فیلبی)) هەڵات... پیاوێکی ڕێكو پێکی ڕوس لە یەکێ لە شەقامەکانی مۆسکۆدا پیاسەی دەکرد، بزەی هاتیو هەندێ شیرینی دا بە یەکێ لەو منداڵانە. کە پیاوەکە ڕۆیشت، منداڵەکە شیرینییەکەی بۆ دایکی برد،

دایکی ژنی دیبلۆماسییەکی بەریتانی بوو باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە مۆسکۆ، ئەو قوتوە شیرینیە، چوار فیلمی تیادابوو، کە بەڵگەنامەی نهێنی ڕوسی بوون. گرنگ نییە. کام لەو دوو قسەیە ڕاستن، گرنگ، دیبلۆماسیەکە کە دوو زەرفەکەی کردەوە لە باڵیۆزخانە، زانی ئەوەی ئەمەی ناردووە، تەماشای لەوە دوورتر دەکات.... نامەیەکی بینی بە ئیمزای کۆلۆنیل ((ئولیج بنکۆفسکی)) داوای کردووە، ببێتە سیخوڕ بۆ ئەمریکا. لەناو نامەکەشدا هەندێ زانیاری سەربازی دانابوو، زەرفی دووەم، هەندێ ڕێنمایی تێدابوو دەربارەی چۆنیەتی پەیوەندیکردن بە مۆسکۆوە......

وێستگەی موخابەراتی ئەمریکی لە باڵیۆزخانە، بڕیاریاندا ئەمە هەوڵێکە بۆ چاندنی کرێگرتەیەکی ساختە لەناو وەکالەتی موخابەراتی ئەمریکیدا. دوای گەڕان بەدوای مێژووی کەسایەتیدا، دەرکەوت، ساڵی ١٩١٩ز لە دایك بووە، لە قوقاز، باوکی ئەندازیاری کانەکان بووە، ساڵی ١٩٣٩ هاتۆتە ناو سوپای سوورەوە. ئەندامێکی حیزبی شیوعیەو بۆ پلەی بەرپرسی حیزبی بەرزکراوەتەوە. لەشەڕی ڕوسیا _ فنلەندی ساڵی ١٩٤٠ بەشداری کردووە، دواجا لە چەند شەڕێکدا بەشداری کردووە. تا لە ١٩٤٤ زامدار بووە. دوای دوو ساڵ لە موخابەراتی سۆڤێتی وەریان گرتووە. لەساڵی ١٩٥٥ز بووەتە سەرۆکی موخابەراتی سۆڤێتی سەربازی کە بارەگاکەی لە ئەنقەرە بووە. وەکو مولحەقی سەربازی ڕوسی خۆی نیشانداوە... زۆر ئە ستەمە یەکێك ئەوە ڕابردووی بێ بڕوای پێ بکرێ، و ببێتە موخابەراتی ئەمریکی، بۆیە موخابەراتی ئەمریکی زۆر بە وریاییەوە لە گەڵیا جوڵایەوە. بەڵام ئەو گومانەی موخابەراتی ئەمریکی ڕوایەوە کاتێ ((بنکۆفسکی)) کۆمەڵێ زانیاری گرنگی پێ گەیاندن. دەیگوت دەمەوێ ببمە سەربازێکی ئاشتی.... بەوەوە نەوەستا کە

بەڵگەنامـەی نهێنـی وێنـەی دەگـرت، زانیـاری خۆشـی دەدا لـەبارەی تەکنەلۆژیای سەربازی سۆڤێتیەوە....

وردترین زانیاری لەبارەی سیستەمی موخابەراتی جەنگی سۆڤێتیەوە گەیانـدە موخابـەراتی ئـەمریکی و سـەدان زانـای سـۆڤێتی لـە دەرەوە دەستنیشانکرد.

زانیارییـەکانی ((بنکۆفـسکی)) هەمـە لایـەن هـەبوو، بـەربلاو بـوو، موخابـەراتی بـەریتانیاش کەوتـە نـاوەوەو سوودیان لێ بینـی، بـەمجۆرە بووە سیخوڕی ڕۆژئاوا. ئەوەی پەیوەندی دەکرد پیاوێکی کاری ئینگلیـز بوو، بەناوی ((جریفیل واین)) کارەکانی وای گـەرەك بوو هەندێ جار سـەردانی مۆسـکۆ بکـات، لـە ڕێگـای ئـەوەوە پارەیـان دەدایـە ((بنکۆفیسکی)) لەگـەڵ کامێرایـەکی مینوکسی هەستیارو بـێ تـەلێکی ئـەکتیڤ، لـەماوەی ١٨ مانگـدا تـوانی لـە ڕێگـای ((وایـن))ەوە نزیکـەی ٥٠٠٠ فیلمی شوێنە سەربازییەکانو بەڵگەنامەی نهێنی پێ بدات.

((موریس ئولد فیلد)) _ سەرۆکی موخابەراتی بەریتانیا لە واشنتۆن وتی: بنکۆفسکی بە دەنگی خواستەکانمانەوە هات. لە کاتێکدا ئەم هاتە مەیدانـەوە بـە زەحمـەت دەتـوانرا بزانرایـە تـا چـەند سـۆڤێت هێـزی سـەربازی بـەهێز کـردووە بەتایبـەتی دەربـارەی پرۆگرامـی موشـەکی سۆڤێتی کیشوەربڕ. سەرۆکی سۆڤێت ((نیکیتنا خرۆشۆڤ)) ئاشکرای کرد، کەوا موشەکەکانمان دەتوانن تانکەکان بپێکن، کە ئەمە جیاوازی دەخستە نێوان هێزی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوە. کە جارێکیان ساڵی ١٩٦١ بۆ لەندەن نێردرا، لەگەڵ وەفدێکی بازرگانیدا، لە ڕاستیشدا پیاوانی موخابـەرات بـوون تـا زانیـاری کۆبکەنـەوە لـەبارەی پیـشەسازیو تەکنـەلۆژیای بـەریتانیا، سـەردانەکەیان شـەش ڕۆژی خایەنـد، ((بنکۆفسکی)) ئێواران درەنگ خۆی دەدزییەوەو چاوی بە موخابەراتی

ئینگلیزو ئەمریکا دەکەوتو نهێنی سەربازی مۆسکۆی بۆ ئاشکرا دەکردن. پیان وانەبوو کەوا سۆڤێت ناردبێتی بۆ ناو موخابەراتی بەریتانی، چونکی یەکێ نیردراو بێ ئەو هەموو زانیاریانە نادات.... کە لە ژیانی کۆڵانەوە، زانییان باوکی ساڵی ١٩١٩ز لە شەڕی ناوخۆی ڕوسیا کوژراوە. بەڵام دایکی پێی وتبوو بە نەخۆشی مردووە..... موخابەرات لەمە دوو شتی هەڵێنجا... یان باوکی نەیاری کۆمۆنیست بووە، ئەمەش وا دەکا دڵسۆزی بۆ شیوعیەت نەبێ، یاخود ((نیکۆفسکی)) هۆی مردنی باوکی لەبەر هۆیەکی گرنگ دەشارێتەوە..... لەبەدبەختی موخابەراتی سۆڤێت لە هاتوچۆی لەندەندا کەوتنە گومانەوە لێی..... بۆ ماوەیەك لەکارەکانی ڕایان گرت، بۆ هێند گوازرابووەوە ڕایانگرت. ئەنجامێکی ترسناك چاوەڕێی دەکرد. ئەوەندە ڕقی لە ڕژێمی سۆڤێت بوو، ڕۆژئاوای ئاگادار کردەوە کەوا ڕوسیا نیازی شەڕێکی گەورەی هەیە لەگەڵ ڕۆژئاوادا.

((بنکۆفستی)) بڕوای وابوو، ئەوانەی گوێیان لێ بوو، بەنەخۆشی ((داء العظمة)) یان دانا..... بەتایبەتی کاتێ داوای چاوپێکەوتنی ((شا ژن ئەلیزابیت))ی کرد. داوای بینینی سەرۆکی کەنەدی کرد، بەڵام داواکەی جێ بەجێ نەکرا.... بۆ ڕازی کردنی موخابەراتی بەریتانی و ئەمریکی، جلی کۆلۆنێلیان بۆ دووری و لەبەریکرد و وێنەی لەگەڵ موخابەراتەکانەوە پێ گرت....

((بنکۆفسکی)) ئەم هەموو زانیاریانەی دەدا لەباتی ٨٢٠٠٠ دۆلار یەکێ لە پیاوانی موخابەراتی بەریتانی بەناوی ((ڕۆدریك شیشولم)) ژنێکی هەبوو بەناوی ((جانیت)) سکرتێرەبوو لە موخابەراتی بەریتانی، جانیت منداڵەکانی هەموو هەفتەیەك دەبردە باخچەیەك لە کاتێکی دیاریکراودا. ((بنکۆفسکی)) لێی نزیك دەکەوتەوە، منداڵەکانی دەلاواندەوەو شیرینی

پـێ دەدان. ((جانیـت)) ئـەو قوتـووە شـیرینییەی دەبـرد کـە لـە ڕاسـتیدا ((میکـرۆفیلم)) بـوو، لـە هەنـدێ بۆنـەدا ((نیکۆفـسکی))و ((جانیـت)) نامەیان دەگۆڕییەوە، موخابەراتی ئەنگو _ ئەمریکی کاتێکی زێڕینی پڕ لە زانیاری دەسکەوت لەبارەی موشەکەکانی سۆڤیتیەوە، ئەم زانیاریانـە ((بنکۆفـسکی)) ئاگـای لێ نـەبوو، گوایـە ((خروشـۆڤ)) بڕیـاری داوە بنکەیەکی موشەکی لە ((کوبا)) دامەزرێنێ بە بیانووی پارێزگاریکردن لـە کوبا. هەموو چیرۆکەکانی تێکچون کاتێ ئەو زانیاریانەی بەراورد کـرد لەگـەڵ ئەوانـەی ((بنکۆفـسکی))دا لـەبارەی دامـەزراوی سـەربازی و، موشەکی (اس، اس ٤))و موشەکی ئەتۆمی سۆڤێتی.. ئیتر لەوە گومان نـەما، کـەوا ئـەو دامەزراوانـەی کوبـا بـۆ هێـرش بردنـە بـە موشـەکی ئەتۆمی.... ئەمە ئەو قازانجانە بوو کە ((نیکوفسکی)) بەخشی، سەرەرای زانینی ئەو ماوەیەی کە دەیەوێ بۆ دامەزراندن و بڵاوکردنەوەی موشەکی ((اس، اس ٤)). ((بنکۆفسکی)) کاغەزی بـراوەی دایـە دەسـتی سـەرۆك کەنەدی، کە تەنگژەی موشەکەکانی کوبا بوون.....

سـۆڤێت لـە بارێکـدا نـەبوو بتـوانێ ڕووبـەڕووی ئـەمریکا بوەسـتێت لـە شـەڕێکی ئەتۆمیـدا.... کێشەی موشەکەکانیش لە ئارادا بـوو..... بـەڵام کاری ((بنکۆفسکی)) کۆتـایی پێهات. بەر لەکۆتایی ١٩٦٢ز، بەدوایـەوە بـوون بۆ گرتنـی، لـەپڕ دیـار نـەما. جارێکیـان لـە کاتێکـدا پەیوەنـدی بـە ((جانێـت))ەوە دەکـرد چـەند کەسـێکی لـە ئۆتۆمبێلێکـدا چـاودێریان دەکرد. لە ٢٢ تشرینی یەکەمی ١٩٦٢ز کە کیشەی موشەکەکانی کوبا گەیشتە پلەیەکی ناسك، گرتیان، لەوکاتەی خەریك بوو هەڵدەهات

## ♦ ♦ چۆن وەکالەتی موخابەراتی سۆڤێتی گرتیان؟ ♦ ♦

سەرەڕای ئەو هەنگاوانەی موخابەراتی بەریتانی و ئەمریکی لە بەریان نابوو بۆ پاراستنی. کەم کەس لەو دیو ئەتلەسیەوە دەیانناسی و ژمارەیەکی کەمیش چاوی بەو زانیاریانەی ئەو دەکەوت. گرتنی کارەسات بوو بۆ موخابەراتی ڕۆژئاوا، بۆیان دەرکەوت، گرتنی ((بنکۆفسکی)) هەوڵدانی ئەو هەواڵگرانە بوو کە دژی سیخوڕی بیانی کاریان دەکرد، لەگەڵ ئەفسەرێکی سوپای ئەمریکی.... لەگەڵ ئەو هەڵە گەورەیەی موخابەراتی بەریتانی کردبووی.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٦١ز، موخابەراتی سۆڤێت ئاگادار بووەوە، کەوا نهێنی سەربازی گرنگ وا بەرەو ڕۆژئاوا بەڕێوەیە.... ئەفسەورێکی ئەمریکی بەناوی ((جاك دانلوب)) توانرا قەناعەتی پێ بکرێ، ئەو زانیاریانەی دەهاتە بەردەستی بە موخابەراتی سۆڤێتی دەدا. دواجا ئەو ئەفسەرە خۆی خنکاند چونکی موخابەراتی ئەمیکی گوشاری خستبووە سەر. موخابەراتی سۆڤێتی شێتگیر بوو کاتێ هەندێ لەو بەڵگەنامانەی ((دنلوب))یان بینی، چونکی زۆربەی زانیارییە سەربازییەکان ڕۆژئاوا لێی ئاگادار بوو.... سەرچاوەکە ئاشکرا نەبوو، بەلاّم گەیشتنە ئەو ڕایەی کەوا موخابەراتی بەریتانی و ئەمریکی، پیاوێکی گەوەریان لە سوپای سۆڤێت کردۆتەوە سیخوڕی خۆیان.... بەلاّم کێ یە؟ . لە موخابەراتی سۆڤێتی ١٠٠٠ کارمەند مافی بینینی ئەم زانیاریانەیان هەیە. بۆیە دەبێ لەناو ئەو ١٠٠٠ کەسەدا بگەڕێن.... لەوانەی ((بنکۆفسکی))یش بپشکنن....

هەروەها ئەوەشیان زانی، کەوا زانیارییەکان لە مۆسکۆ تەسلیم کراون، مانای وایە ئەوانەی لە ژێر پەردەی دیبلۆماسی کار دەکەن، ئەوان زانیارییەکان وەردەگرن. بۆیە کەوتنە پشکنینێکی بەربلاّوی هەموو

وەکیلەکانی موخابەراتی بەریتانی و ئەمریکی... دەیانزانی ((رودیریك تشیشولم)) کێیە،چونکی ((جۆرج بلیك)) لەگەڵ ((تشیشولم)) بۆ مۆسکۆ هەڵیەکی گەوەربوو، ساڵی ١٩٦١ز بەهۆی موخابەراتی بەریتانیەوە ((بلیك)) گیراو دانی بە ناوی ئەو کەسانە نا کە دەیناسی بۆیە، تشیشولم و ژنەکەی لە ئەنجامەکانی موخابەراتی سۆڤێتی بوو لە مۆسکۆ. چونکی دەیانزانی ((جانێت)) سکرتێرەیە لە موخابەراتی بەریتانی لە بەرلین بینیبوویان لەگەڵ ((بنکۆفسکی))دا دەدوێ. موخابەراتی سۆڤێتی مۆمێکی ژاراویان لەسەر مێزەکەی دانابوو، ژاراوەکە وایکردبوو بنکۆفسکی ببەن بۆ نەخۆشخانە، هەفتەیەك مابووەوە. لەو ماوەیەدا جیهازێکی وێنەگرتنیان لەناو چرای سەر مێزەکەیان دانابوو، کە گەڕایەوە هەرچی دەنووسی ئەو کامێرایە وێنەی دەگرت.

لە تشرینی ١٩٦٢ز لە کاتێکدا خەریکی پلان دانان بوو بۆ هەڵاتن گرتیان. بنکۆفسکی درایە دادگا لەگەڵ ((جریفیل واین))دا بنکۆفسکی بەو پەڕی خوێن ساردییەوە هەموو شتێکی درکاند، بە مردن حوکمیان دا، لەناو فرنیان دانا، کە بە ئاستەم دەسوتا. هاوڕێکانیشی ئامادەبوون و سووتانەکەیان بینی، ((واین))یش لە مەجەر ڕفاندیان و هێنایانە ڕوسیا، دادگایی کراو هەشت ساڵ حوکم درا، زۆر نەمایەوە ساڵی ١٩٦٤ز لەگەڵ سیخوڕێکی ڕوسیدا ((جۆردن لونسدیل)) گۆڕیانەوە.

## ◆ ◆ ئیسرائیل بیر پیاوێك بوونی نیە ◆ ◆

لە هاوینی ساڵی ١٩٦٠زدا، پیاوێکی ئەمریکی بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری خۆی گەشتی ئیسرائیل دەکات. ئێوارەیەکیان لە یەکێ لە چێشتخانەکانی ((تل ئەبیب)) نان دەخوات، ئەم پیاوە دەستی لەکاری موحابەراتیدا هەبوو.... کاتێ خۆی لە مەکتەبی خزمەتگوزارییەکانی

ئیستراجی سەر بەوەکالەتی موخابەراتی ئەمریکی کاری دەکرد. هەروەها لە شەڕی ناوخۆیی ئیسپانیاشدا بەشداری کردبوو. خەسڵەتی سیخوڕێتی هەرمابوو. ئەویش تێ ڕامان و تەماشای وردی ئەوانەی دەورو بەری بووو هەوڵی خوێندنەوەی بیرکردنەوەیان...

چاوی بە چێشتخانەکەدا گێڕا. چاوی بە پیاوێ کەوت لەولایەوە دانیشتبوو، هەر تەماشای کردو بیریشی بۆ ڕابردوو گەڕایەوە: دواجا ئەم پیاوەی بینیوە لە ((مەدرید)) بوو، ئەویش لە ساڵی ١٩٣٦ دابوو، لە زینداندا بینیبووی، لە یەکێکی دەداو داوای دەکرد بڵێ من سیخوڕم، کە بۆ موخابەراتی سۆڤێتی کاری دەکرد..... ئەو پیاوە ئەمریکیە، ئەو پیاوەی ناسیەوە. کە ڕوویەکی غەمباری تێکشکاوی هەبوو.. وا ئێستا دوای بیستو چوار ساڵ ، لە دووری پانزە پێوە دانیشتووە، هێمن و لەسەرخۆ خەریکی نان خواردنە.... ئەوەی سەیرە جلوبەرگی کۆلۆنیلی ئیسرائیلی لەبەردابوو، چۆن درندەیەکی موخابەراتی سۆڤێتی ئاوا دەبێتە ئەفسەرێکی گەورەی ئیسرائیل؟ پێی ناخۆش بوو.... هەستاو چووە نزیکترین بنکەی سەرکردایەتی مۆساد...

کابرای ئەمریکی سەری سوڕما کە بینی کارمەندانی مۆساد پیان ناخۆش نەبوو، چونکی دیارە هەڵەیەکی گەورە لە ئارادایە دەربارەی کولونیل ((ئیسرائیل بیر)).

وەکو زۆرێ لە یەهودییەکان ((بیر)) لەترسی نازییەکاندا هاتبووە فەلەستین، بەگوێرەی تۆمارەکانی وەزارەتی بەرگری، ((بیر)) لە نەمسا لە دایک بووە، چۆتەپاڵ ئیسرائیلیەکان لە ساڵی ١٩٣٤زدا دواجا لە شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا بەشداری کردووە. لە ساڵی ١٩٣٨ بۆ فەلەستین کۆچی کردووەو چووەتە ناو ڕێکخراوە نهێنیەکانی یەهودی...... ((بیر)) چووەتە ناو باندی ((هاجانا))وە، کە سوپای

نهێنـی سـەهیۆنیەتە، لـە بەشـی ئـەڵمانیا لـە موخابـەراتی ئینتیـدابی بـەریتانی کـاری کـردووە، تـا جولاّنـەوەکانی سـەرکردەکانی سـەهیۆنی بزانیێ.

ئینگلیزەکـان نـەیان دەزانـی ((بـییر)) پەیوەنـدی بـە ((هاجانـا))وە هەیـە، دەسەلاّتیان پێدا تـا تەماشـای تۆمـاری سەرکردە سـەهیۆنییەکان بکـاتو زانیارییەکانی دەگەیاندە هاجانا لەهەمان کاتدا ((بییر)) ئەو یەهودیانەی دەناسی کە زانیاریان دەداتە ئینگلیزەکان.

لـەو سـەرکردە سـەهیۆنیانە کـە ((بـییر)) یارمـەتی دەدان لـە فەلەسـتین ((دیفید بن گوریون)) بوو. بوون بە هاورێ کە ڕۆڵێکـی گرنگـی هـەبوو لە ژیانی ((بییر))دا لە ساڵی ١٩٤٥ز. دواجا بییر بووە سەرۆکی عەمەلیات لـە ((جـەلیلی سـەرو))، لـە شـەڕی سـاڵی ١٩٤٨زدا، ((بـییر)) گـەلێ سـوودی گەیانـدە ئـەرکانی ((هاجانـا)) لـە تـەل ئـەبیب.... کـە بـە یـەکێ لـە ئەندازیارانی سەرکەوتنی دادەنێن.....

دوای شـەڕ، ((بـییر)) پایـەکی بـەرزی لـە سـوپای ئیـسرائیلیدا وەرگـرت. لەهـەمان کاتـدا موخابـەراتی بـەڕێوە دەبـرد، بـەهۆی ئـەو پەیوەندییـەی لەگەڵ ((بن گوریون))دا هەیبوو....

لـەو کارانـە پێـی ڕاسـپێردرا لـە لایـەن بـن گورونـەوە: ڕێکخـستنی کـاری ڕۆژانەی بن گوربون بوو... کە ئەمە گەلێ نهێنی خستە ژێر دەستی.

((بـن گوربـون)) بـڕوای پـێ دەکـرد، بـەلاّم ((ئیزراهاریـل)) سـەرۆکی موخابەرات پێچەوانەی ئەو بوو، بڕوای بە ((بییر)) نەدەکرد.

هیـچی لێ نـەدەدی بـەلاّم دەیگـوت شـتێك هەیـە وام لێـدەکات بـڕوای پـێ نەکەم..... بۆیە هەمیشە لەژێر چاودێریدا بـوو. ((هاریـل)) دەیزانـی، زۆر بە وریایی بجوولێـەوە، چونکی دەیزانی پەیوەندییەکی توندی لەگەڵ ((ین گویورن))دا هەیە.

لەساڵی ١٩٥٢، کە ناوی ((مۆساد))یان دانا، لەجیاتی موخابەراتی ئیسرائیلی و ((هاریل)) بە فەرمی بووە سەرۆکی وەکالەتە نوێکە، گومانەکانی بییر هاتەدی.... کە لەپڕیکا ((بییر)) لە سوپا دەرچوو و ڕوویکردە سیاسەت....و چووە ناو پارتی ((بالماباm)) کە چەپڕەوترین حیزبی ئیسرائیلە...... دوای ساڵێك بەسەر ئەم گۆڕانەدا، لە حیزب دەرکرا بەهۆی توندڕەوییەوە..... بەڵام ((ئینکاری)) ڕاکانی خۆی کرد بووە سەرۆکی دایەرەی ڕاگەیاندی حیزب. ئەمە گومانی ((هاریل))ی بەهێزتر کرد، ڕێگای لە ((بییرت))گرت تا نەگەڕێتەوە ناو سوپا. بەڵام بییر پشتی بە ((بن گوریون)) بەستبوو، بووە کارمەند لە وەزارەتی بەرگری، تادەست بە لێکۆڵینەوەی ستراتیجی بکات. ((هاریل)) پێی ناخۆش بوو بەم پێشەوە چوونەی ((بییر)). تەواو بڕوای هێنا کەوا ((بییر)) سیخوڕی موخابەراتی سۆڤێتیەوەو دەبێ ((بن گوریون)) لەمە ئاگادار بکرێتەوە. بەڵام ئامۆژگاریەکانی بەفیڕۆ چوو، داوای بەڵگەیان کرد، بەڵام تا ساڵی ١٩٥٩ هیچ بەڵگەیەکیان پێ نەبوو، لەم ساڵەدا بوو ((میخیائیل جولیفوسکی)) کە سیخوڕێکی پۆڵەندی بوو، بەڵام بۆ موخابەراتی سۆڤێتی کاری دەکرد، بۆ موخابەراتی ئەمریکی ئەو سیخوڕە سۆڤیەتیانەی ئاشکرا کرد لە ولاتاندا کاردەکەن. موخابەراتی ئەمریکی، ئەم ڕاپۆرتەیان گەیانە ((هاریل)) کەوا ((جولیونسکی)) ئاشکرای کردووە، کەوا موخابەراتی سۆڤێتی یەکێکی لە ئیسرائیل هەیەو ناوی حەرەکی ((کومرید کیرت))ە. لە شوێنێکی گرنگی وەزارەتی بەرگری ئیسرائیل کاردەکات.

((جیولۆنسکی)) ئەو کەسەی نەدەناسی، بەڵام ئەو زانیاریانە ئامارژەبوون و ((ئیسرائیل بییر))ی پێ تاوانبار دەکردا.

دوای چەند مانگێك ((هاریل)) بەڵگەیەکی دیکەی دەسکەوت.

موخابەراتی ئەڵمانی ڕۆژئاوا ئاگاداری کردەوە، کەوا ((بیر)) کاتێ سەردانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوای کردووە تا موحازەرەیەك بۆ کارمەندانی سەربازی ئەڵمانی پیشکەش بکات. بەدزییەوە چۆتە ئەڵمانیای ڕۆژهەلاٚت و چەند سەعاتێکی پێ چووەو گەڕاوەتەوە.... نەخۆی نەیەکێکی تر باسی ئەو گەشتەی ((بیر))ی نەکرد بۆ ئەڵمانیای ڕۆژهەلاٚت.

کۆلۆنێلێکی ئیسرائیل، بۆ بە نهێنی دەچێ بۆ ئەڵمانیایی ڕۆژهەلات،...... تا ئەو زانیاریانەی پیاوکاری ئەمریکی. کە دەیسەلمێنێ کەوا ((بیر)) خائینەو زانیارییەکی زۆری لەلایە. هەوڵی داوە ((بن گوریون)) هەموو دەسەلاٚتێکی پێبدات ئێوارەیەکی ساڵی ١٩٦١ز، چەند مۆسادێك چاودێری ((بیر))یان دەکرد، دوای کەوتبوون، جانتایەکی بەدەستەوە بوو، چووە ناو چێشتخانەیەکەوە لە ((تەل ئەبیب)) هەر چەند کەسێکی تیادابوو، دوای دانیشتن پیاوێك هات جانتایەکی لە جانتاکەی ((بیر))ی پێیە.... مۆساد زانی ئەوە دیبلۆماسیەکی سۆڤێتیە، لە ڕاستیشدا پیاوێکی سەر بە موخابەراتی سۆڤێتی بوو، ((بیر)) و پیاوە ڕوسەکە ماوەیەك تەماشای یەکتریان کرد، دواجا هەڵسان و جانتاکانیان گۆڕی، مۆسادەکان زانیایان ئەو جانتایەی ((بیر)) بە ڕوسییەکەی دا کۆمەڵێ بەڵگەنامەی تێدایە. دوای چەند مانگێك ((بیر)) بە تۆمەتی سیخوڕیکردن گیراو دوای دادگایکردنی دە ساڵ حوکم درا.

وا دەردەکەوێ ئەمە کۆتایی چیرۆکەکە بێ... بەلاٚم مۆساد ئاشکرای کرد کەوا نهێنی ((ئیسرائیل بیر)) تازە دەستی پێکردووە... ((بیر)) هیچ هاوکارییەکی لەگەڵ پاسەوڵەکانیدا نەکرد، بۆیە ڕێنمایی درایە مۆساد بۆ گەڕانەوەی شریتی ژیانی و چالاکیەکانی ((بیر))) یەکەم شتیان بۆ

دەركەوت كه بەلایانەوه سەرسوڕهێنەر بوو، تارماییەكیان گرتووه. ئەو پیاوەی بەناوی ((ئیسرائیل بیێر)) ناوی خۆی ناوه، بوونی نییه !!

لێكۆڵینەوه ئەوەیان دەرخست ئەوەی لەبارەی ڕابردووی ((بیێر))ەوه زانراوه، درۆیەكی پەتییه.

ئەم پیاوه كەوا لەزیندانێكی ئیسرائیلی دایه نەمساوی نییه، هەرچەنده ئەڵمانیش دەدوێ، هەروەها له حیزبی ئیشتراكی نەمساوی ئەندام نەبووه. لەشەڕی ناوخۆی ئیسپانیادا لەوێ بووه، بەڵام له لیوای نێودەوڵەتی كاری نەكردووه.....و لەبەر چەوساندنەوەی نازییەكان هەڵنەهاتووه...

## ♦ ♦ ئەی ئەمه كێیه؟.... ♦ ♦

مۆساد نەیتوانی وەڵامی ئەم پرسیاره بدۆزێتەوه، ((بیێر)) هەر بەبێ دەنگی مایەوه تا ساڵی ١٩٦٦ دڵی وەستاو مرد... له دواییدا، مۆساد گەیشته بڕیارێك ئەو پیاوەی ناوی خۆی نابوو ((ئیسرائیل بیێر)) كاری سیخوڕی ئاسایی دەكرد بۆ موخابەراتی سۆڤێتو خیانەتی له یەهودییەكان دەكرد. بەر له شەڕی دووەمی جیهانی له فەلەستین دایان نابوو، تا دزه بكاته ناو ڕێكخراوه سەهیۆنیه نهێنیەكانەوه....

مۆساد گەیشته ئەوەی كەوا دوو كەس لەناو پرۆژەكەدایه..... یەكێكیان ئیسرائیلیەو ((بیێر))ی ڕاستەقینەیه، كه ئەندامێكی چالاكی بزوتنەوەی ئیشتراكی نەمساوی یه. دواجا چووەته ئیسپانیا و لەوێ بەشداری شەڕەكانی كردووه، بەڵام مۆساد لەو بڕوایەدا بوو كەوا ((ئیسرائیل بیێر))ی ڕاستەقینه هەر له ئیسپانیادایه. موخابەراتی سۆڤێتی لەسەردەمی شەڕی ناوخۆیی ئیسپانیدا دەستی بەسەر پاسەپۆرتو ناسنامەی جەنگاوەراندا دەگرت ئەوانەی له تیپی بیانی بوایەن.....

ئەگەر یەكێكیان بكوژرایه، ئەوا كەسایەتی مردووەكەیان دەدایه

کەسێکی کە کە سیخوڕی بۆ دەکردن، ناوو ناسنامەکەی ئەویشی هەڵدەگرت....

◆ ◆ ئەی پیاوەکەی کە دەبێ کێ بێ؟ ◆ ◆

ئەوەی تر ئاشکرا نەبوو.... بەلآم مۆساد، وای دەزانی کەوا کۆمۆنیست بووەو زۆر توندڕەو بووەو لە نەمسا بووە.... چووە ناو حیزبی شیوعیەوە. لە ساڵی ١٩٣١ز موخابەراتی سۆڤێتی خستویەتیە کار بو سیخوڕیکردن لەسەر ئەندامانی حیزبی شیوعی.... کارەکەی بە باشی بەڕێوە بردووە، بۆیە ساڵی ١٩٣٤ بۆ مۆسکۆیان بانگ کردووە، بۆ ڕاهێنان، دوای دوو ساڵ بۆ ئیسپانیا نێردراوە، سەرۆکایەتی تیپێکی لەناوبردنی لەڕێ لادەرانی مارکسی کردووە، وادیارە سوودی لەکارەکەی وەرگرتووە، ساڵی ١٩٣٦ز بۆ مۆسکۆ بانگیان کردووە. کەوتۆتە ژێر لێپرسینەوە گوایە ((هەڵەی گەورەی)) کردووە، کە جەزاکەی هەڵواسینە، بەلآم پرۆسەی چاکسازیان بۆ کردووە، دواجا، بووە بە ((ئیسرائیل بییر)) وەکو سیخوڕێك کاری کردووە. ((ئیسرائیل بییر))ی ڕاستەقینەش نهێنیەك بوو و نەدۆزرایەوە.

◆ ◆ سەرەتاکانی وێنەگرتنی ئاسمانی ◆ ◆

کە ساڵی ١٩١٤ز شەڕی یەکەمی جیهانی بەرپابوو، فەیلەقی هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانیا کەوتە سووسەکردنی ((استطلاع)) ئاسمانی. پۆلی ((سرب)) سێیەمی هێزی ئاسمانی دەستی کردە زانیاری پەیداکردن لە ئاسمانەوە بۆ مەیدانی شەڕەکان. لە ١٥ مایسی ١٩١٥زدا، بۆ یەکەمین جار بەشی وێنەگرتنی ئەزموونی بە فەرمی دانرا..... هەر لە هەفتەی یەکەمدا کاریگەری دیاریدا.

هێرشی ئینگلیز _ فرەنسی لە شوباتی ١٩١٥ز ڕاگیرا کاتێ بەهۆی وێنە گرتنی ئاسمانیەوە ئەو سەنگەرە نهێنیانەیان دۆزییەوە کە لە لایەن

دوژمنەوە لێدرابوو... دوای ئەوە بە مانگێك هێرشێکی سەرکەوتوانەیان ئەنجامدا لە شەڕیَ ((نیف شاییل)) وێنەگرتنی ئاسمانی لە هاوینی ۱۹۱۵ز ڕەهەندێکی دیکەی وەرگرت. کاتیَ ((سومتون بیکارد)) کامێرایەکی بەکارهێنا دژی زەبزەبات بوو.

لەهەمان کاتدا پۆلی ((سرب))ی یانزەهەم نموونەیەکی خوێنراوەی سیَ ڕەهەندی بەرهەمهێنا، لە مایسی ۱۹۱٦ز قوتابخانەیەك بۆ وێنەگرتن لە ((فامبۆرد)) کرایەوە.

لە شەڕی ((سوم))دا، لە یەکی حوزەیران بۆ ۱۷ تشرینی ۱۹۱٦ز فەیلەقی هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانی زیاتر لە ۱۹۰۰۰ وێنەی ئاسمانی گرتووە، زیاد لە ٤۳۰۰۰۰ چاپکرا. لەسەرتای سالَیَ ۱۹۱۷زدا، هەندیَ ئەفسەری شارەزایان دامەزراند، زۆربەی فڕۆکەکانیش کامێرایان بەکار دەهێنا بۆ وێنەگرتن.

لەگەڵ بەردەوامبوونی شەڕدا، خوێندنەوەی وێنە بووە کارێکی هەواڵگری ((استخباراتی)) گرنگو ڕاپۆرتی لێکۆڵینەوەکانیان بە ڕێكو پێکی بۆ سەرکردایەتیەکان دەنێردرا..... لە ناوەڕاستی ساڵی ۱۹۱۷زدا، فەیلەقی هێزی ئاسمانی هێزی شاهانەی بەریتانی دەیتوانی وێنەکان وەربگێڕێتە سەر خەریتەو ڕۆژانە بەرەکانی شەڕی لیَ ئاگادار دەکرایەوە، بەتایبەتی جێگای دوژمنو هێڵی ئازوقەو شوێنەکانی

لە ساڵی ۱۹۱۸ز، شیکەرەوە فرەنسییەکان، بە وێنەکاندا جێگای کۆبوونەوەی سەربازو جبەخانەو ئازووقەی دوژمنیان لە هێڵەکانی پشتەوەی ئەڵمان دەزانی، ڕێژەی ئەگەرەکانیان زیادی دەکردو زیاتر بەرچاوی فەرماندەکانیان ڕوون دەبووەوە بە هۆی ئەو وێنانەوە... لە هەفتەی یەکەمی مانگی مارتدا توانیان ۱۰٤٤۰ وێنە بگرن، کە زانیارییەکی زۆری تێدابوو.

لەکاتی هێرشی ئەلمانەکاندا کەوا دانرابوو لە ئەیپرلی ١٩١٨دا ئەنجام بدرێ، بەشێوەیەکی سەرەکی وێنەکانیان دەخوێندەوە. بۆ ئاراستەکردنی تۆپەکان ، تا جێگاکانی دوژمن تۆپ باران بکەن کە شوێنەکانیان بەهۆی وێنەوە دیاری کرابوون.

تەنها لە ڕۆژی ١٢ ئەیپرلدا ٣٣٥٨ وێنەی ئاسمانی گیرابوو. لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وێنەگرتن بە شێوەیەکی چڕ بەردەوامی هەبوو، لە ٢٧ تشرینی ساڵی ١٩١٧ز، توانرا ١٢١ فەوجی تۆپخانەی تورکی لەناوچەی ((بیرشیبا)) وێنە بگیرێ...... وێنەکان بۆ بەشی لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەیان نێردران تا لەسەر خەریتە جێگاکانیان دیاری بکەن‌و بیننێرن بۆ هێڵی شەڕکردن ئەمە هەمووی پێنج سەعاتی خایەند. لەساڵی ١٩١٨زدا توانرا بە درێژی ١٦١٦ کیلۆمەتر وێنەی بگرن. کە لە ژێر دەستی تورکیا بوو.. کە ڕێکەوتنی ئاگر بەست لە ١١ نۆڤێمبری ساڵی ١٩١٨ز مۆرکرا، فەیلەقی ئاسمانی بووە هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانی‌و گەیشتە شارەزاییەکی گەڵێ زۆر لە سووسەکردن بۆ مەبەستی پێوانەو مووخابەرات.

## ◆ ◆ وێنەگرتن لە نێوان هەردوو شەڕەکەدا: ◆ ◆

کە ئاشتی بەرپابوو، ئەوەندە گرنگی بە هونەری شیکردنەوەی وێنەی فۆتۆگرافی نەدەدرا.... لەگەڵ ئەوەشدا قوتابخانەی هێزی ئاسمانی بۆ وێنەگرتن لە ((فارینورو)) فراوانتر بووەوە، بووە بەشێك لە سوپا، پڕۆگرامی بۆ دانرا بۆ شیکردنەوەو لیکۆڵینەوەی وێنە. لە ئەیپرلی ١٩٣٥ز وەزارەتی هێزی ئاسمانی بەریتانی ناچار بوو سیخوڕەکانی وەگەر بخات بۆ کۆکردنەوەی زانیاری. ئەویش بەهۆی دەست درێژیکردنی ئیتالیا بۆ سەر حەبەشە، خەریك بوو، ئەو شەڕە بتەنێتەوە لە ناوچەکانی دەریایی سپی ناوەڕاست، دەستیان کردە دامەزراندنی کامێرای سەرەتایی لە

فڕۆکەکاندا تا هەندێ وێنەیان دەست بکەوێت ....
لەکۆتایی سییەکاندا، ئەگەری شەڕێکی سەرتاسەری لە ئارادابوو، بۆیە موخابەراتی ئاسمانی پێویست بوو، لە ساڵی ١٩٣٨زدا میجور ((وینتر بوسام)) چەند وێنەیەکی ئەڵمانی لە موخابەراتی بەریتانیەوە دەست کەوت، ئەو وێنانە ڕاستەوخۆ لەسەر هێلی ماجینو بوو. بەلای ئینگلیزەوە زۆر گرنگ نەبوو. لێرەدا؟، موخابەراتی بەریتانی پێویستیان کەوتە سەر خزمەتگوزارییەکانی وێنەگری ئاسمانی هەڵکەوتوو ((سیدنی کوتون))، زنجیرەیە وێنەی زۆر نهێنی لە ئاسمانەوە گرت. لەسەرەتای ساڵی ١٩٣٩ز، ئەفسەرە خانەنشینەکانیان بانگهێشت کرد وەکو ئەفسەری موخابەرات و شارەزایانی تەقینەوە....

## ◆ ◆ وێنە گرتن لە شەڕێ دووەمدا ◆ ◆

بێجگە لە ((سیدنی کوتون)) کە بۆ هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانیا کاری دەکرد، کەسێکی دیکە ئەو گرنگیەی بە وێنەگرتنی ئاسمانی نەدا لە مانگەکانی یەکەمی شەڕدا. ((کوتون)) خۆی چەند وێنەیکی گرنگی هێلەکانی ئەڵمانی گرت، ئەو وێنانە لە بەرزایی ٢٠٠٠٠ پێی دەگیرا.... بەلام چەکەکانی دوژمنی بۆ لەیەك جیا نەدەکرایەوە. بەتایبەتی لەو هێرشەی کە بۆ هۆلەندا کرا.....بەهۆی وێنە گرتنەوە گەلێ شوێنیان بۆ ئاشکرا بوو. ساڵی ١١٩٤٢ز بەشی دۆزینەوە، بەوێنە یارمەتی هێزەکانی هاوبەشی دا. بە نهێنی دۆڵی ((سانت نازیر))یان وێنە گرت، لەوێ بنکەی ڕاداریان دۆزییەوە لە برونفیل، هەروەها بنکەی لیکۆڵینەوەی موشەکەکانی نازی لە ((بینمیوند)) ئاشکراکرا. کەنارەکانیشیان سووسەکرد بەر لە هێرش کردنە سەر ((دییب)). ئەوانەی وێنەکانیان دەخوێندەوەو شی دەکردەوە سوودێکی زۆریان بە شەڕکەران دەگەیاند بە تایبەتی لە سێ ساڵی دوای شەڕدا. شوێنی

تۆپه‌كانیان به‌ر له هێرشكردن پێده‌زانی، جێگای جبه‌خانه‌و بنكه‌كانی پیشه‌سازیان ده‌ستنیشان ده‌كرد، له‌گه‌ڵ پردو هێڵی هاتووچۆو په‌یوه‌ندییه‌كاندا، ئه‌و ئه‌نجامانه گرنگ‌و به‌نرخ بوون، تا فڕۆكه‌كان بۆردومانیان بكه‌ن.

بنكه‌ی سه‌ربازی بۆ شیكردنه‌وه‌ی وێنه‌كان ۳۸۱۰ وێنه‌یان له‌گه‌ڵ راپۆرتی دوورودرێژدا به‌رهه‌مهێنا، گه‌لێ ئه‌ركی گرنگیش تا ئه‌ڵمانیا خۆی له ۷ مایو ۱۹٤٥ به‌ده‌سته‌وه‌دا، به ئه‌نجام گه‌یاند. وێنه‌گرتنی ئاسمانی‌و خوێندنه‌وه‌یان، ڕه‌گه‌زێكی گرنگ بوو له سه‌ركه‌وتنی هاوپه‌یمانانندا، چونكی سه‌رچاوه‌یه‌كی گرنگی زانیاری بوون له ڕووی ستراتیجی ته‌كنیكیش......

## ◆ ◆ تاقیكردنه‌وه‌كانی دوای شه‌ڕ ◆ ◆

له پێشدا فڕۆكه‌ی دۆزینه‌وه‌یان به‌كارهێنا، به‌سه‌ر هێڵی دوژمندا ده‌فڕی‌و شوینه‌كانیانی وێنه ده‌گرت. ئه‌مه له‌كاتی شه‌ڕی یه‌كه‌مدا بوو به‌لاَم له شه‌ڕی دووه‌می جیهانیدا فڕۆكه‌ی سه‌راسۆكردم (())ی هێزی ئاسمانی شاهانه‌ی به‌ریتانیایان به‌كار برد بۆ دیاریكردنی جێگاكانی موشه‌كه‌كانی ئه‌ڵمانیا.... كه شه‌ڕ كۆتایی هات سیخوڕێتی ئاسمانی پێی خۆی چه‌سپاندبوو، به‌لاَم فڕۆكه‌كانی سه‌راسۆكردن، كێشه‌یه‌كی نوێیان ڕوو به‌ڕوو بووه‌وه، ئه‌میش ڕاداره‌كان ببه‌هێ. كران. تا بووه چه‌كێكی كاریگه‌ر له به‌رنگاری كردنی سیخوڕی ئاسمسانی. بیریان له‌وه كرده‌وه جۆره فڕۆكه‌یه‌ك به‌رهه‌م بهێنن ڕادار نه‌یدۆزێته‌وه......

له‌لایه‌كی تره‌وه، یه‌كه‌كانی وێنه گرتن كه مابوونه‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی سوود له ئه‌زموونی ڕابردوو وه‌رگرن، سه‌رله‌نوێ گه‌ڕانه‌وه سه‌ری، له سه‌نگافوره یه‌كه‌ی نوێیان بۆ وێنه‌گرتن دامه‌زراند، له حوزه‌یرانی ۱۹٤۸ز یه‌كه‌یكیان له ڕۆژهه‌لاَتی دوور كرده‌وه، تا له‌و شه‌ڕه‌ی دژی

شیوعیەکان لەمەلایو سوودی لێ ببینن.
بەر لە کۆتایی ساڵی ١٩٥١ز، هاوپەیمانان ١٠٤ بەشی وێنەگرتن و شی کردنەوەی وێنەیان دامەزراند، بۆ کۆریایان نارد

## ♦ ♦ تەنگژەی فڕۆکەی یو ح ♦ ♦

فڕۆکەی ئەمریکی ((یو ح)) یەکەم فڕۆکەی سیخوڕی نوێیە.... وا دروست کراوە لە بەرزایەکی زۆرەوە توانای فڕینی هەبێ و بکەوێتە سەرووی ڕادارەکانی دوژمنەوە، ئەم فڕۆکەیە دەتوانێ بەسەر ئەنجامەکانیدا بفڕێ و هەستی پێ نەکەن. کامێرای هەستیاری نزیککەرەوەی پێیە، دەتوانێ لە بەرزی ٢٠٠٠٠ مەترەوە وێنە بگرێ... لە ٣٠ ئەیپرلی ١٩٦٠زدا، موشەکەکانی ڕوس فڕۆکەیەکی سیخوڕی ((یو ح))یان کردە ئامانج و لەوکاتەی بەسەر خاکی ڕوسیادا دەفڕی کەوانیان. فڕۆکەوانەکە ((جاری باورز)) کاتی نەبوو ئامێری تێکدانەکە بەکار بهێنێ بەلاّم خۆی ڕزگاری بوو.... ڕوسەکان گرتیان و دەستیان بەسەر فڕۆکەکەدا گرت، خەریك بوو بەهۆیەوە کارەساتێکی نێودەوڵەتی بقەومێ. ئەوە یەکەمجار بوو ڕوسەکان سەلماندیان کەوا ئەمریکا سیخوڕ لە ئاسماندا بەکار دێنێ لەسەر خاکی ڕوسیا فڕۆکەوانەکە ((جاری باورز)) فڕۆکەوانی سیخوڕی ((یو ح)) خۆی یەکێك بوو لە سیخوڕەکانی ئەمریکا. دەسەلاّتدارانی ڕوسیا دادگاییان کرد. دە ساڵیان بۆ بڕییەوە. بەلاّم ئەمریکا لەگەڵ سیخوڕی ڕوس کۆلۆنیل ((ڕودۆلف ئابل)) دا گۆڕییەوە. لە ساڵی ١٩٦٢، بەلاّم لە ساڵی ١٩٧٧ بەهۆی کەوتنە خوارەوەی هەلیکۆپتەرەکەی کۆچی دوایی کرد.
((جاری باورز)) لەکاتی لێکۆڵینەوەی دا وتی : ((کولونیل شیلتون پێی وتم ئەگەر شتێك ڕوویدا دەبێ پەنا بۆ هەندێ شت بەرم کە لە گیرفاندان. پارەی ڕوسی تێدا بوو، لەگەڵ هەندێك زێڕدا ڕەنگە بەکارت

بێتو وەکو بەرتیل بیدەیتە هاولاتیانی ڕوس بۆ یارمەتیدانت. هەروەها کولونیل دۆلارێکی زیوی پێدام دەرزییەکی بەسەرەوەبوو، فرۆکەکەت دوورە لە مەترسیو موشەك پێ ناگاتو فرۆکەی دیکەش ناگاتە بەرزایی تۆ. بەلام ئەگەر بەدیل گیرایو تووشی ئازاردان بوویو بەرگەت نەگرت دەتوانی بەو دەرزییە خۆت بکوژی... کە دەست بەجێ دەتکوژێ....

ئێستا، موخابەرات فڕۆکەی سەراسۆکردنی پیشکەوتوو بەکار دێنێ. لەگەڵ ئامرازی وێنەگرتنێ کە تەکنەلۆژیایی نوێ بەکار دەهێنێ، بێ ئەوەی تووشی مەترسی ڕادارەکانی دوژمن ببێت.

هەرچەندە مانگە دەست کردەکان زۆر کاری سیخوڕی ئاسان کردووە. بەلام مانگی دەستکرد هەموو ولاتێك نیەتی، تەنها ولاتە زا هێزەکان بەکاری دەبەن. بۆیە هەر پێویستی بە فڕۆکەی استتلاع دەمێنێ. وەکو فڕۆکەی ((بلاك بیرد اس . ار_ ٧١)) کە خێراییەکەی لە ٣٠٠٠ کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا تێدەپەڕێ . هەروەها خێرای ((لوکهیلد من _ ا _ ١١))، ((باڵندەی ڕەش اس . ار _ ٧١))و ((ئەواکس)). فڕۆکەی بێ فڕۆکەوانیو هی تریش.

## ♦ ♦ فڕۆکەی بێ فڕۆکەوانی ئیسرائیلی ♦ ♦

ئیسرائیل گرنگی بە فڕۆکەی بێ فڕۆکەوان دا، تاکو بتوانێ زانیاری کۆبکاتەوە. لە ساڵی ١٩٧٩وە فڕۆکەی ((ماستیف _ ١)) بەکارهێناوە، زۆری نەبرد، جۆرێکی دیکەی بەکارهێنا ((تادیران _ ئیسرائیل _ ماستیف _ ح)) کە دوو کلکی هەیە لەگەڵ دوو باڵی بەرزدا، پاڵپێوەنەرەکەشی کێشەکەی ١٠٠ کیلۆ کەمترە... دەتوانێ ٢٥ کیلۆ بۆ ماوەی چوار سەعات هەڵگرێو لەبەرزی ٣٠٠٠م بفڕێت.... دەتوانرێ لە بنکەیەکی سەرەو لێژ کە لەسەر لۆرییەکی ئاسایی دانرێ،

هەلفڕێ....
سەرکەوتنی فڕۆکەی ((ماستیف ح)) وای کرد، پارەیەکی زۆرتر خەرج بکەن بۆ چاکترکردنی و بەرهەم هێنانی فڕۆکەی ((ماستیف _ ٣))و ((سکاوت v_ b_ r)) کە لەوەی پێشوو گەورەتر بوو، درێژییەکەی ٣م درێژی باڵەکانی ٣,٦، قورسایی ١١٨ کغم ، دەتوانێ ٤٥ کیلۆگرام هەڵگرێ خێراییەکەشی ١٤٥ کیلۆمەترە لە سەعاتێکدا، دەتوانێ ١٠٠٠٠ پێ بەرز بێتەوەو ٤,٥ سەعات لە ئاسمان بمێنێتەوە لە بازنەیەکدا مە تیرەکەی ١٠٠ کیلۆمەتر بێ....
فڕۆکەی ((سکاوت)) ئیسرائیل بەچڕی لەساڵی ١٩٨٢ بەکاری هێنا. لە دژی ڕێکخراوە فەلەستینیەکان و هێزەکانی بەرگری لوبنانی لە باشووری لوبنان، هەروەها بەو فڕۆکانە گەلێ زانیاری لەبارەی شوێنە سەربازییەکانی سوریا وەدەست کەوتووە، لەگەڵ چاودێری کردنی بنکە موشەکەکانی سام....

◆ ◆ تیپی ژمارە ٤٠ ◆ ◆

لە نیوەشەوی ٤ ئابی ١٩١٤زدا، بەریتانیا جاری شەڕی لە دژی ئەڵمانیادا دا. هەموو جیهان کەوتە کێشەی ئەو ململانێیە خوێناوییە، هێزی دەریایی بەریتانی لە بەندەرەکان دیار نەما. کەوتە هەڵپەی شکاندنی ئەو ئابلۆقەیەی دوورگەکانی بەریتانیا, ئەو دوو ئەستولە تووشی یەك نەهاتن، دووجار نەبێ، جارێکیان لە ((دوگر بانك)) ئەوی تریان لە شەڕی ((گوتلاند)). بەریتانیا ئەنجامی خۆبەدەستەودان و برسی بوو، ئەگەر هێزی دەریاییەکەی ئاوا بەهێزو یەکگرتوو نەبوایە.... ئەوەی ڕاست بێ هێزی دەریایی بەریتانی قەرزاری بەڕێوەبەری موخابەراتەکەی بوو، ئەویش کابتن ((ریجینالد بلینیکر)) بوو. کەدواجا بووە ئەدمیرال. هەروەها ئەو پیاوانەش کە شفرەکانیان

دەخوێندەوەو شی دەکردەوە لە تیپی ((٤٠)) لەبارەگای ئەدمیرالی کۆن، ڕۆڵی گرنگیان هەبوو..... بناغەی مەرجەکانی سەرکەوتنی تیپی ((٤٠)) لە سێ مانگی یەکەمی شەڕدا دانرا... کە زنجیرە ڕووداوێك ڕویاندا، وا دەزانرا شتێکی ئەوتۆ نین و جیهان ئاگای لێ نەبوو، بەلاّم ساڵی ١٩١٢ لیژنەی بەرگری ئیمپراتۆری ناچار کرد بڕیارێك وەرگرێ ئەویش بڕینی هەموو کێبلەکانی تەلەگرافی ئەڵمانی بوو، ئەگەر هات و شەڕ دەستی پێکرد...... لە ٥ ئابی ١٩١٤ بڕیارێك دەرچوو بۆ پاپۆڕی کێبلەکان ((تیلکونیا)) کەوا پێنج کێبڵی ئەڵمانی کە ((ئیمدین))ی دەگەیاندە سنووری ئەڵمانی، دەربکەن و بیانبڕن.....

ناچار ئەڵمانیا پەنای بردە بەر بێ تەل یان پۆستە کە یان درەنگ دەگات یان دەست یەکێ تر دەکەوێ و ئاشکرا دەبێت یان ون دەبێت.

لە ساڵی ١٩١٤زدا، تەلەگرافی لاسلکی داهێنانێکی نوێ بوو، هەرچەند لە هەموو کەشتیە جەنگییەکاندا بەکار دەبرا.... هەروەها پاپۆرە بازرگانییەکانیش بەکاریان دەهێنا. هەموو دەوڵەتەکان شفرەیان بەکار دەبرد دوو دەوڵەت نەبێ: فڕەنسا و نەمسا کە لەگەڵی مەجەردا یەکی بوو ئەو دەمە، ئەم دوو دەوڵەتە تیپی کردنەوەی شفرەیان بەکار دەهێنها، بەریتانیاش دەستی کردە کردنەوەی شفرە.... زۆری نەبرد، هەر دوای دە ڕۆژێك شەڕ هەڵگیرسا.

ئەڵمانیا بە سێ شفرەی سەرەکی دەستی بەشەڕ کرد بەلاّم هەر زوو گەیشتە دەستی ئەدمیرالی دەریایی بەریتانی لە ماوەی چوار مانگدا، یەکێکیان کەوتە ژێر دەستی بەریتانیا لەوکاتەی کە پاپۆڕێکی ئەڵمانی _ ئوسترالی ((هوبارت)) چووە ناو ئاوی ((ملبورن))ەوە. ئاگای لێ نەبوو شەڕ بەرپا بووە بۆیە بەدیل گیرا.

شفرەی دووەم، ڕوسەکان دەستیان بەسەردا گرت کاتێ لە ((ئەستونیا))

یەکێ لەو پاپۆڕانەیان گرت.

شفرەی سێیەم، بەریتانیەکان لە سندوقێکی قورقشمدا بینیانەوە کە لە پاپۆڕی جەنگی ((اس _ ١١٩))دا دەریان کرد کە بەدەستی پاپۆڕێکی ئینگلیزی ژێر ئاویان خستبوو، بەمجۆرە ئەدمیرالیەت توانی هەموو نامە شفرەدارەکان بەدرێژیی شەڕەکە بخوێنێتەوە. تیپی ٤٠ ژمارەیە شارەزای شفرەی تێدا بوو، لەسەرووی هەموویانەوە ((سیر ئەلفرید ئوینگ)) ئەندازیارێك بوو لە زانکۆی ((ئیدنبیرگش)) خوێندنی تەواو کردبوو، چەند ساڵێك لە کارگەکانی کێبل کاری کردبووو گەڕایەوە زانکۆ تا هەندێ لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات، دواجا وەك مامۆستایەك لە زانیاری میکانیك دامەزرا، لە ساڵی ١٨٩٠ _ ١٩٠٢ لەوێ مایەوە. دواجا بووە بەڕێوەبەری فێرکردنی دەریایی، لە ساڵی ١٩١٤ز بووە بەڕێوەبەری تیپی ژمارە ٤٠.

لە پێشدا تیپی ٤٠ پشتی بە دایەرەی پۆستە دەبەست لەگەڵ چەند وێستگەیەکی بێ تەلدا، لەگەڵ وێستگەی گوێگرتنی ئەدمیرالی لە ((ستوکتون))، سەرەڕای سێ کەس کە شفرەکانیان دەخوێندەوە، کە ئەندامەکانی شارەزاییان پەیدا کرد، وێستگەی پاسەوانی کەنارەکان ((هنستانتون)) کەلەسەر کەناری ((تورفولك)) بوو بەستراپەوە بە وێستگەی ((بستوکتون)).

بەرە بەرە کارەکانیان باشتر دەبوو تا توانیان هەموو نامەو ئاماژە دەریایی و نامە دبلۆماسیەکان بخوێننەوە کە دەسەلاّتدارانی ئەڵمانیا دەیناردن.

## ♦ ♦ شەڕی شفرە ♦ ♦

ئەڵمانیا پێی زانی، کەوا بەریتانیا هەموو سیستەمە شفرەکانی دەریایی لەبەر دەستدایە. بە پێی ئەوە هەڵوێست و هەڵسوکەوت و

شێوازی کارکردنی گۆڕی. ئەمە دوای شەڕێ ((جوتلاند)) ڕوویدا. ئێستگەی دەریایی ئەڵمانی لە ((نایوان)) لە دوای بەرنامەکانی ئێواران، هەندێ ئامازەی خێرای دەنارد، تا کەس نەزانێ ئەوە نامەی ڕاستەقینەیە، دەستیان کردە لێکۆلینەوەی ئەو ئامازانە. چەند نموونەیەکیان لەسەر قەوان تۆمارکردو خستیانە سەر فۆتۆگراف بەخێراییەکی کەم. تەماشایان کرد ئەو دەنگە ئاڵۆزانە دەبێتە زمانێکی شفرەی ئاشکراو تێگەیشتوو .

لایەنەکان بە ئەنقەست زانیاری ناڕاستیان دەنارد، هەر کە بیانزانیبا شفرەکانیان ئاشکرا بووە. بەم ڕێگایە بەریتانیا ڕێگای خۆشکرد بۆ خستنە ژێر ئاوی ((هامبشایر)). لە ٢٦ مایسی ١٩١٦زدا، کارمەندێکی موخابەراتی ئەڵمانی، کە نرویجی بوو، بەناوی ((لابخ)) بەرێکەوت لە وێستگەی ((نیومنستر))ەوە گوێێ لە نامەیەك بوو، لە پێشدا وادیاربوو کەوا گرنگیەکی ئەوتۆی نییە، نامەکە لە پاپۆڕێکی جەنگی بەریتانیاوە بۆ ئەدمیرالیەت نێردرابوو، دەڵێ: کەناڵێك لە ڕۆژئاوایی ((ئورکنی)) لە مین پاککراوەتەوە..... ((لابخ)) هەستی بە سەیروسەمەرەی نامەکە کرد. پاپۆرە جەنگیەکە بۆ ئەدمیرالییەتی دەناردو لەماوەی سەعاتێکدا چوار جار دووبارە بووەوە..

کولونیل ((نیکۆلای)) فەرماندەی وێستگەی گوێگرتن لە کەوتە گومانەوە کەوا بەریتانیەکان ڕێگایان لە مینی دەریایی پاك کردۆتەوە تاکو هەندێك پاپۆری گرنگ بتوانن بەوێدا تیپەڕن. فەرمانی بە غەواسە ((یو _ ٧٥)) درا بە پەلە بڕوات بۆ کەناری ((ئورکنی)) ڕۆژئاوا تا لەو ڕێگایە مین دابنێت. یەکێ لەو مینانە بووە هۆی ئەوەی ((هامبشایر)) بکەوێتە ژێر ئاوەوەو تێکبشکێ......

## ♦ ♦ بەندکردنی رۆجر کیسمنت ♦ ♦

((سیر رۆجر کیسمنت)) نەتەوە خوازێکی ئیرلەندی بوو، ((تیپی ژمارە ٤٠)) _ موخابەراتی دەریایی بەریتانی _ چاودێری هات و چۆو جولانەوەکانیان دەکرد لە ئەڵمانیا و دەرەوەی ئەڵمانیا پارەیەکی زۆریشیان تەرخان کردبوو بۆ چاودێری کردنی، بەجۆرێ یەختێکیان لە کەنارەکانی ئیرلەندا بۆ چاودێریکردنی تەرخان کردبوو تا بزانن کەی لە ئەڵمانیا دەگەڕێتەوە. تیپی ٤٠ نامەیەکی بێ تەلی شفرەداری دەسکەوت لە بەرلینەوە دەڵێ: کەوا ((کیمسنت)) لە غەواسەیەکی ئەڵمانیەوە لە کەناری ئیرلەندا دادەبەزێ. بەهۆی ئەو نامەیەوە توانیان لە ئەیپرلی ١٩١٦ز دەستگیری بکەن لە نزیکی ((ترالی)) لەو کاتەی لە غەواسەکەوە دەرچووە کەنار. لە لەندەن دادگایی کراو دواجا بە مردن حوکمیان دا.

((کیسمنت)) لە بریتانیا زۆر ریزی لێ دەگیرا، نەك لەبەر ئەوەی دبلۆماسییەکی زیرەك بوو، بەڵکو لەبەر چالاکی بۆ پشتگیریکردنی لە مافی کرێکارانی ئەفریقیا. بۆیە خەڵکێکی زۆر هاو سۆزی بۆ دەبڕی... ئەدمیرال ((هول)) ناچار بوو هێمنی بکاتەوە و بلاّونامەیەك بلاّو بکاتەوە هێرشی دەکردە سەر کابرای ئیرلەندی، یادەوەری درۆشی بلاّودەکردەوە تیایدا دانی بە تێکشکان دەنا، بەلاّم ئەم تۆمەتانە لە کاتی دادگایی کردنیدا باس نەکران و بە لێ سەندنەوەی پایەی سوارەیی و هەڵواسینی حوکم درا، دوای ٥٠ ساڵ تەرمەکەی بۆ ئیرلەندا گوێزرایەوە و لە ئاهەنگێکی شایستەدا نێژرا......

## ♦ ♦ شەڕی بەلەم - یو - ♦ ♦

ئەو شەڕانەی لە ئۆقیانووسی ئەتلەسیدا ڕوویدا کەم وێنەیە لە مێژووی شەڕدا.... ئەو جەنگە لە ساڵی ١٩٤٠ مانگی تەمووز دەستی

پێکرد، کاتێ کە ئەڵمانەکان گەیشتنە کەنارەکانی فرەنساو دەستیان بەسەر کەنداوی ((بسکای))دا گرتو بەندەرەکانیان داگیرکرد. غەواسەکانی ئەڵمان بە تواناتر دیار بوون....... لە تەموزی ۱۹٤۰زدا پاپۆڕێکی بازرگانی ئەڵمانی دەستی بەسەر نوسخەیەك لە شفرەی هێزی دەریایی شاهانەدا گرت، کەهەموو کەشتییەکان ئەوەیان بەکاردەهێنا، فەرمانەدەی پاپۆڕەکانی _ یو _ زۆر بە ئاسانی توانی نهێنی ئەو نامانەی دەگۆڕانەوە لە نێوان کەشتیەکانی بەریتانیاو ئەدمیرالیەتدا بزانێو ئاگای لێ بێ، بەمە چالاکی غەواسەکان گەیشتنە ئەو پەڕی. لە شوباتی ۱۹٤۳زدا، غەواسە ئەڵمانیەکان بە تەواوی دەستیان گرت بەسەر سیستەمی پەیوەندیە شفرەکانی بەریتانیا، کە زۆر نهێنی بوون. بە جۆرێ ڕاپۆرتی غەواسەکانی بەریتانیا هەر لە شوێنەکانی خۆیەوە دەخوێنرایەوەو دەزانرا بۆ کوێ دەڕۆن.

بۆ مانگی داهاتوو گەورەترین شەڕی ئەتلەسی بەرپا بوو، لەماوەی سێ ڕۆژدا، غەواسەکانی ئەڵمان توانیان ۱٤۱۰۰۰ تەن لە کەشتی هاوپەیمانان تێك بشکێنن، لە بەرامبەر زیانی غەواسێکی ئەڵمانی...... لە بەهاری ۱۹٤۳ دا، بارەکە گۆڕا..... هاوپەیمانان ۲۱ غەواسەی ئەڵمانیایان تێکشکاند.

## ♦ ♦ ئامرازی دەرایی نوێ ♦ ♦

لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانیدا، ئامرازی نوێتر بۆ سیخوڕی هاتەکایەوەو بەکار هێنرا، بەلەمی ڕاوکردن بەکار هێنرا، غەواسەی هەمەجۆر هێنرایە ئاراوە..... لە ئابی ۱۹٤۲ز، کەشتی مین چێن ((ئار جونوت))و ((نوتیلاس)) نزیکەی ۲۱۱ سەربازی دەریایی ئەمریکیان بۆ دوورگەی ((ماکین)) گواستەوە. هەموو سەربازە یابانییەکان لەو سەربازگەیە کوشت، کە ژمارەیان حەفتا سەرباز بوو، بنکە

دەریاییەکەشیان تێکدا. لە ١١ مایسی ١٩٤٣ز دوو کەشتی تر لە دورگەی ((ئەتو)) کارێکی دیکەی وەك ئەوەیان ئەنجامدا. ئەستولی دەریایی ئیتالی، بەسەرکەوتویی، غەواسەی بچووك و پیاوانی بۆقی بەشەریان گەیاندە نزیکی بنکەکانی دوژمن و توانیان ٦٣٠٠٠٠ تەن کەشتی هاوپەیمان و ٥٠٠٠٠ تەن کەشتی بازرگانی بخەنە ژێر ئاوەوە و زانیاری گرنگیش لەبارەی جم و جۆڵی کاروانی دەریایی لە تەنگەی ((جبل تارق))ەوە، بە هێزەکانی ئەو ئەو دەورو بەرە بگەبەنن....

زۆربەی دەوڵەتەکان، کە هێزی دەریایی دیاری هەیە، هێزی دەریایی تایبەت بەکار دێنی بۆ کاری سیخوڕی و چاودێری و هێرشی تێکدەرانە، هەندێ دەوڵەت دان بەوەدا نانێ هێزێکی وای هەیە. بۆ نموونە بەریتانیا، تیپی بەلەمی تایبەتی هەیە، کە لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانیدا چاودێری هێرش بردنە سەر کەنارەکانی ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی لە ئەستۆ گرتبوو... لە بیست ساڵی دواییدا هێزی تایبەت دانرا بۆ چاودێری و سیخوڕی لە دژی کەنارەکانی چین لە کاتی شەڕی کۆریادا. چەندین کاریش ئەنجام درا دژی یاخی بوونەکەی نیمچە دوورگەی مەلایوو یارمەتی سوپای بەریتانی داوە لە بورینو، هەروەها یارمەتی ((مەناویر))یش لە عەدەن درا..... بۆ ئەو هەموو کارە کە ئەنجامیاندا، ساڵی ١٩٧٧ ناویان لێ نا ((تیپی بەلەمی تایبەت)) و لە باکووری ئیرلەندا بلاوەیان پێکرد. کە کاری پاراستنی کەنارەکانی لەکاتی ئاشتیدا لە ئەستۆ بوو. لە شەڕی فوکلاندا یەکەم تاخم ئەوان بوون گەیشتنە ئەو دەوروبەرەو زانیاری گرنگیان بە هێزی دەریایی دا لەکاتی هێرشی بۆ سەر فوکلاند. ژمارەی تیپی بەلەمی تایبەتی ١٥٠ ئەندام بوون. کە پێکهاتبوون لە فەرماندەو سێ پەل، بەشێکی دیکەشیان هەبوو، زۆر بەوردی دەستنیشان دەکران کە ژمارەیان ٥٠

کەس بوو....

## ♦ ♦ مەلەوانیی و چوونە ژێر ئاوەوە ♦ ♦

سیخوڕی کردن بە بەلەم پێویستی بەوە دەکات ئەو کەسانە دەبێ مەلەوانی بزانن و بتوانن بچنە ژێر ئاوەوە ((الغواص)).

فرەنسا لەم ڕووەوە مێژوویەکی درێژی هەیە لەگەڵ مەلەوانیی و چوونە ژێر ئاوەوە و دزەکردن بۆ کەنارەکانی دوژمن.... بۆ ئەم ئەرکە کۆمەڵێکیان دانا بەناوی ((تەپلە سەوزەکان)). ئەوانە لەسەر شەڕی ناو ئاوو وشکانی مەشقیان پێکرا.... چۆن خۆیان دەگەیننە کەنارەکان بە بێ دەنگیی و کەس پێیان نەزانێ، بۆ چاودێری کردنی ئەو جێگایانەی پاپۆڕی نەیارانی لێ لەنگەری دەگرت.... هەروەها تیپی بیانی پەرەشووتیان دانا لەگەڵ مەلەوانداو مەشقیان لەسەر خۆ هەڵدانە خوارەوە دەکرد بە پەڕەشووت، و بەلەمی بچووکیان بەکار دەهێنا.

ئیتالیا شانازی بە تیپێکی خۆیەوە دەکرد لەم بارەیەوە. کە چەندەها جار زیانی بەهێزی دەریایی بەریتانی لە دەریایی سپی ناوەڕاست گەیاندبوو، لە شەڕی دووەمی جیهانیدا ... ئەم تیپە لە ((فاریجینانۆ)) لەنگەریان گرتببوو، لە نزیکی ((لاسبیربا))دا. کە دەکەوێتە کەناری باکووری ڕۆژئاواوە، ڕاستەوخۆ سەرۆکی ئەرکانی دەریایی ئیتالیا سەرپەرشتی دەکرد. پێنج یەکە بوون و لە ٢٠٠ جەنگاوەری هێرش بەر پێکهاتبوون.

بەسەر چەند دەستەیەکدا دابەش کرابوون، هەر دەستەیەکی ٢ _ ١٢ کەس بوون.

لە یەکی یەنایری ١٩٦٢ز هێزی دەریایی ئەمریکی تیپێکی لەمجۆرەی سەربەخۆی دامەزراند، کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی یاخی بووان دامەزرابوو لە نهێنیی و ئاشکرادا، لە دەشتایی و دەریاو ئاسماندا.ناویان

نــا ((تیپــی ڕووخێنــەری ژێــر ئــاو)). بــۆ دۆزینــەوەی جێگــای ((بەرمائیات))ی دوژمن دانرابوون لە ((گرینادا))و شەڕی کەنداو بەکار بران.........

ساڵی ١٩٨٤ سۆڤێت دەست درێژی زۆری کردە سەر ئاوی هەرێمایەتی سوید، ساڵی داهاتوو، سوید هێزەکانی خۆی بە تواناتر کرد لە دژی شــەڕی غەواســەکان....و چــالاکی ڕاگەیاندنیشی گەیانــدە ئاســتی جیهانی. کارەکانی سۆڤێت کەمی کرد، بەلاّم هەر بە نهێنی کاریان دەکرد.

سوید، بۆ جارێکیش نەیوتوانی غەواسەیەکی سۆڤێتی سەرئاو بخات. لە ٢٤ شوباتی ١٩٩٠ز ڕوداوێك ڕوویدا چەند ڕۆژێکی خایاند، کۆمەڵێ لە دژە غەواســی ســویدی کەوتنــە دوای غەواســەیەکی بیانیــەوە لــە باشــووری ڕۆژهــەلاّتی ((ســتۆکۆڵم)) مینیــان لــە قــولاّیی ئاوەکــە دانــاو بۆمبی دژە غەواسیان لە هەلیکۆپتەر خستە ئاوەوە بەلاّم بێ سوود بوو.

غەواســـی ڕوســـی ((ویـــسکی _ ح)) ســـاڵی ١٩٨١ز لـــە کـــەناری ((کاریـسکرونا)) کـە بنکەیـەکی دەریـایی سـویدی لێ بـوو، لەنگـەری گرتبوو... سۆڤێت داوای لێبووردنی کرد کە بە هەڵە چوونەتە ئەوێ. بەلاّم سوید بڕوای نەکرد. ئەم ڕووداوە جیهان پێی زانی، دەرکەوت ئەوا غەواسەیە چەکی ئەتۆمی هەڵگرتبوو.....

## ◆ ◆ ئەزموونی سویدی ◆ ◆

ئـەوەی ئاشـکرایە تیپـەکانی ڕوسـی لـە ئـاوی سـویددا بـە غەواسـەی ئاســایی خــەریکی ســیخوڕی بــوو. هەرچــەندە یەکێــتی ســۆڤێت هەڵوەشـابووەوە، بـەلاّم ڕوسـیا دەسـەلاّتی هـەر هـەبوو بەسـەر چـەند بنکەیەکی سیخوڕیداو بەردەوامی دەدا بەکاری هەواڵگری، لە ساڵانی هەشتاکاندا هەوڵێ ئەوەی دەدا جێگایەك بۆ خۆی دانێ لە نزیك خاکی

سوید تا غەواسەکانی لەوێ دابنێ.....

لە تشرینی ١٩٨٢ سۆڤێت هێرشی کردە سەر چەند بنکەیەکی سویدی بەهۆی غەواسەکانیەوە. لەو کارەش سێ کەشتی بچووکی لە ژێر ئاوەوە بەکار هێنابوو، سوید جۆرەکانی پێ نەدەزانی، لەکاتی ئەنجامدانی پرۆسەکەدا غەواسەیەکی بچووك چووبووە ناو بەندەری ((ستۆکۆڵم))ەوە. ڕۆژنامەی پراڤدا کاتی خۆی وتبووی ئەو کەشتیە بچووکانە بۆ ڕزگارکردنی غەواسە بەکاردێن.... بەڵام دواجا فەرماندەی ئەو غەواسەیە درایە دادگاو بە سێ ساڵ بەندی حوکم درا.

## ♦ ♦ کەشتی سیخوڕی ♦ ♦

تا ئێستا هێزە دەریاییەکانی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا بە ئۆقیانووسەکاندا دەگەڕێن، خەریکی ((موناوەرات))و مەشق کردنن، بەڵام کەشتیە سیخوڕییەکان خەریکی چاودێری کردنو گوێگرتنن، یەکێتی سۆڤێت نزیکەی ٤٠ کەشتی بۆ سیخوڕی تەرخان کردبوو، دوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت، ئەو ژمارەیە کەم کرایەوە، بەڵام ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر سەرکەوتو نەبوو لە هێزی هەواڵگری دەریاییدا....

لە ساڵی ١٩٦٧ بۆ ١٩٦٩ دوو کەشتی سیخوڕی لەناو چوو.

## ♦ ♦ ڕوداوی لیبرتی ♦ ♦

لیبرتی کەشتیەکی بارهەڵگری کۆن بوو، توانای هەڵگرتنی ١٠٠٠ تەنی هەبوو. بۆ کاری سەربازی بەکار هێنرا، کە شەڕی ١٩٦٧ز لە نێوان میسرو ئیسرائیل ڕوویدا. لە کەنارەکانی سینا دەرکەوت... بۆ کاری تێکدانی پەیوەندییە بێ تەلەکانی سەرربازی میسری بەکار هێنرا لەلایەن ئیسرائیلەوە. بەڵام بەهەڵە ئیسرائیل هێرشی کردە سەر کەشتیەکەو وایزانی کەشتیەکی میسرییە، فڕۆکەو میراجو مستیرەکان

بۆمبارانیان کردو جیهازە ئەلکترۆنیەکانیان تێکدا، دواجا سێ بەلەمی توربیدا هێرشی بۆ برد، لەگەڵ چەند هەلیکۆپتەریکدا، ژمارەی کوژراوی سەر کەشتیەکە گەیشتە ٣٤ و زامدارەکانیش ٧٥ کەس بوون. پەرچەکرداری ئەمریکی درەنگ بوو. فڕۆکەیەکی ((فانتوم _ ٤)) لە هەڵگری فڕۆکەکانەوە ((ئەمریکا))ی نارد، بەلاّم درەنگ پێ گەیشت، هەموو شتێك تەواو بوو بوو، ئیسرائیل داوای لێ بووردنی کرد. کە وای زانیوە کەشتیەکی سیخوڕی میسرییە... بەلاّم کەس بڕوای بەمە نەکرد، چونکی ئالاّی ئەمریکی دیار بوو، و موخابەراتی ئیسرائیلی دەیانزانی کە ((لیبرتی)) پێکرا ئەم ڕووداوە ئەمەی سەلماند، نابێ کەشتیە سیخوڕییەکان ئامرازی خۆ پاراستنی نەبێ....... بەتایبەتی دەبێتە ئامانجی ئەوانەی کە پارێزگاری لە نهێنیەکانی خۆی بە پێویست دەزانێ....

## ♦ ♦ ڕوداوی بوبلو ♦ ♦

لە نیسانی ساڵی ١٩٦٧ز روداوی ((بوبلو)) ئەم راستیەی سەلماند ..... ((بوبلو)) کەشتیەکی سیخوڕی ئەمریکیە، لە نزیکی کەنارەکانی کۆریای باکوور کاری دەکرد. لە پەڕ، کەشتیەکی جەنگی کۆریای باکوور هێرشی کردە سەری و بەرەو کەنارەکانی کۆریای برد. دەریاوانەکانی بەدیل گرت و دەستی بەسەر کۆمەڵێ نووسراوی نهێنی و کەرستەی سیخوڕیدا تیادا گرت، دەریاوانە ئەمریکیەکان فریایان نەکەوتبوون لەناویان ببەن. لە نێوان ئەمریکا و کۆریای باکووردا کێشە پەیدابوو، ساڵێکی خایەند، بۆ ئەوەی ئەمریکا دەریاوانەکان ئازاد بکات، ناچاربوو، لە ٢٣ نیساندا دان بەوەدا بنێ کە سیخوڕی کردووەو داوای لێبوردنی لە کۆریای باکوور کرد......

((بولبو)) کەشتیەکی بارهەڵگری ئاسایی بوو، جیهازی گوێگرتنی زۆر

هەستیاری هەڵگرتبوو، ئەرکی ئامادەکردنی راپۆرت بوو دەربارەی پەیوەندییەکانی رادیۆو رادارەکانی کۆریای باکوور. هەروەها رادارێشیان دانابوو بۆ دەستنیشانکردنی و قۆزتنەوەی ئاماژەکانی مانگە دەستکردەکان و وەڵام دانەوەیان.....

دوای رووداوی ((بولبو)) ئیتر ئەمریکییەکان دەستیان لە بەکارهێنانی کەشتی سیخوڕی ئاسایی. ئەمجا روسیەکان دەستیان کردە بەکارهێنانی بەلەمی راوکردن. هەردوولاشیان کێبڕکێیان دەکرد بۆ دزینی زانیاری بە غەواسەی سیخوڕی لە زەریاکاندا لە قوڵی هەزاران مەتر...... سۆڤێت کەشتی راوکردنی بەکار دەهێنا دوای ئەوەی گۆڕانکاریان تێدا کرد لە جۆری ((ئۆکیان)) کە لە دروستکردنی ئەڵمانیای رۆژهەڵات بوو، ۳۲ دەریاوانی هەڵدەگرت، دواجا کەشتی نوێترو گەورەتریان بەکارهێنا لە جۆری ((بلزام)).

کە ٤٠٠٠٠ تەمی هەڵدەگرت و ١٨٠ دەریاوان کاری تێدا دەکرد.

بەمە زانیاریان زۆر دەست دەکەوێت لە هێزی پەیمانی ناتۆ...

دەربارەی تەکتیکی پەیمانەکەوەو جمو جۆڵی و چۆنیەتی هەماهەنگیان لەگەڵ هێزی دەریایی و غەواسەکانی دیکەدا. ماوەیەك ئەو کەشتیانە لە دەریاکاندا دەگەڕان بە پێی پلانێکی دانراو بۆ دەست کەوتنی زانیاری.... هەندێکی کەش، بەمانگ دەمانەوە چاودێری کەشتیەکانیان دەکرد، لە دەرچوون و چاتنە ژوورەوەیاندا، هەر نەبوایە ئەوا یەکێ لەو کەشتیانەیان لە کەناری رۆژئاوای ئەسکەتلەندە دەمایەوە بۆ چاودێری جمو جووڵی غەواسەکان لە جۆری ((بولاریس))ی ئینگلیزی و ((بوزیدون))ی ئەمریکی.

## ♦ ♦ شەڕی ڕادار ♦ ♦

ڕادار تازەترین ئامرازی کۆکردنەوەی زانیاری دەریایی و ئاسمانیە لەکاتی ئاشتی و شەڕدا. زانیاری وردی ئاسمانی پێویستیەکی بنەڕەتیە بۆ پاراستنی فڕۆکە مەدەنیەکان و نەفەرو فڕۆکەوانەکان لەکاتی ئاشتیدا.

پاراستنی سەربازو چەك و جبەخانەو شارو کارگەو دامەزراوەکان لەکاتی شەڕدا.

بۆیە، چاودێریکردنی ئاسمانی زۆر پێویستە بۆ هێزی ئاسمانی و ڕێنمایکردنی فڕۆکەوانەکان لەکاتی فڕیندا، لەلایەن فڕۆکەخانەکان و وێستگەی چاودێری سەر زەوییەوە، چ مەدەنی بێ یا سەربازی ......

سەرەڕای ئەوەی فڕۆکەکان ئامرازی وەرگرتنی زانیاریان تێدایە کە بە سیستەمێکی ئەلکترۆنی کار دەکات، ڕۆژ بە ڕۆژیش ئەو جیهازانە لە پیشکەوتندان و وێستگەکانی سەر زەویش زانیاری وردیان پێ دەدەن کە لە ڕادارەکانەوە وەریدەگرن.

## ♦ ♦ ڕاداری سێ ڕەهەند ♦ ♦

بۆ وەدەست هێنانی ئەو جۆرە زانایاریانە، دوو جۆر ڕادار هاتە ئاراوە.... کە پێویستی بە دامەزراندنی بنکەی گرانبەها هەبوو، بۆ چاودێریکردنی هەموو جۆرە فڕۆکەیەك، لەبەرزی جیاجیاوە... بەجۆرێ ئەو بنکانە بلاّوەی پێ بکرێت لە شوێنی جیاجیا دابنرێت تا هەر وێستگەیەك ڕووبەرێکی دیاریکراوو بواری دیاردا چاودێری بکات، بەگوێرەی توانای ڕادارەکە....

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، گەلێ لیکۆڵینەوە لە لایەن وڵاتە پیشەسازیەکانەوە کە لە تەکنەلۆژیادا پێشکەوتوون ئەنجامدرا.... کەرستەی پیشکەوتوتر بەکارهێنرا کە دوای فڕۆکەکە دەکەوێ، دووری

دیاری دەکات، دەزانێ بەرزی چەندە، تا لەهەمان کاتدا جۆری فڕۆکەکەش دیاری دەکات، ئەوە پێی دەڵێن ((ڕاداری سێ ڕەهەند)).
گەلێ گۆڕانکاریان تێدا کرد، تا گەیشتە بەرهەمهێنانی جۆرێك پێوەرێکی ڕاستەوخۆی بەرزی فڕۆکەکە ئاشکرا دەکات، لەگەڵ هەر لەرینەوەیەکی ڕاداری، جیهازێکی تایبەت ئەو زەبزەبانە دەپێوێ کە ڕادارەکە بەرەو فڕۆکەکەی دەنێرێ. جا لە زەبزەبەکان لە فڕۆکەکە دەکەون و دەگەڕێنەوە. جا بە حیسابێکی ورد بەرزی فڕۆکەکە دەژمێرن......
هەندێ فڕۆکە ڕاداری پێشکەوتوو هەڵدەگرێ. تا بە وردی چی لەسەر ئەرز بێ، پێێ دەزانێ، ئەو ڕادارانە، شێوو دۆڵ و گردو چیاو بەرزی شوێنەکان کار ناکاتە سەر کاری ڕادارەکە.
بۆ نموونە: فڕۆکەی بەریتانی جۆری ((گرود)) دەتوانێ فڕۆکەی نەیار بە نزمیش بفڕێ هەستی پێ بکات.

## ♦ ♦ چاودێری دەریایی ♦ ♦

لەبواری کۆکردنەوەی زانیاری دەریایی، بایەخدانی دەریاوان لەکاتی ئاشتی و شەڕدا وەك یەك نییە، بایەخدانی ئەویش لەگەڵ جیولوجیەکدا، لەگەڵ زانایەکی زیندەوەردا، لەگەڵ شارەزایانی سروشتدا وەك یەك نین. دەریاوان لەکاتی ئاشتیدا بایەخ بە ئاراستەی ئاو ((با)) دەدا، لەگەڵ هەندێ دیاردەی سروشتی وەکو ((باو))و ((تەم))…. لەسەردەمی شەڕیشدا، ناسنامەو قەبارەو جۆری کەشتیەکەو شتی تر بەلایەوە گرنگە….. چەندی لێوە دوورە….
خێراییەکەی چەندە، ڕوو لە کوێ دەکا، جیولۆجیش جەو جۆڵ و شێوەی بنی ئاوەکە لێکدەداتەوە، زانای زیندەوەرەکان لە بارەی زیندەوەرەوە باس و لێکۆلینەوە دەکات، گرنگی بە ژینگەی ئاژەل و

وەرزی زاوزێو کۆچی زیندەوەرە دەریاییەکانی مەبەستە.... زانیارێکی سروشتی گرنگی بە ((مەد))و ((جەزر)) دەدات..
بۆ وەدەست هێنانی ئەو هەموو زانیارییانە، جیهازی جۆراوجۆر بەکار دەبرێن.... بەڵام هێشتا ئەو زانیاریانە بۆ ئەم سەردەمەو ئەمرۆ کەمن، بەتایبەتی ئەگەر شەڕ بەرپابوو، دەریاو ئۆقیانووسەکان هەزاران کەشتیو غەواسیان تیادا دەگەڕێن، جگە لە کەشتی ڕاوو ئەوانەی بۆ لێکۆڵینەوەی زانیاری لەناو ئاودان، بە تایبەتی ئێستا مرۆ دەریاکان بۆ گەلێ مەبەستو نیاز بەکار دەبەن. بۆیە ئەمە وای کردووە ڕۆژ بەڕۆژ کەرستەی پێشکەوتوو تر بەکار ببرێ لەم بوارەدا.

## ♦ ♦ مانگی دەستکرد بۆ سیخوڕی ♦ ♦

ساڵی ١٩٦١ز، ئەمریکییەکان یەکەم مانگی دەستکردیان بۆ مەبەستی سیخوڕی بۆ ئاسمان نارد، بەگوێرەی بەرنامەی موشەکو مانگە دەستکردەکان ((ساموس)).... تاکو بەدەوری زەویدا بسوڕێتەوە، گەلێ ئامێری تۆمارکردنی دەنگیو فۆتۆگرافی بەهێزو هەستیاریان تێدا سازاندبوو... ئەو فیلمو شریتە دەنگیانە بەهۆی پەرەشووتەوە فڕێدەدرایە زەریایی ئارامەوە، لەوێشدا _ لە شوێنی دیاریکراودا _ کارمەندی وەکالەتی ئاسایشی نەتەوەیی کۆیان دەکردنەوە ((ناسا)).
دوا مانگی دەستکردی ((ساموس))ی لەوجۆرە بەناوی ((باڵندەی گەورە))ەوە بوو، درێژییەکەی ١٦م و پانیەکەشی لە سێ مەتر زۆرتر بوو، لەبەرزی ١٦٠ کیلۆمەتر لە زەوییەوە، کارەکانی ئەنجام دەدا.
دەڵێن: کامێرای ئەوەندە بەهێزو هەستیار بوون توانای وێنە گرتنی ئەو ڕۆژنامەیەو نووسینی ڕۆژنامەکە بگرێ کە بەدەستی کەسێکەوەیە لە ڕێگادا. هەروەها ئەو ئامێرو کەرستانەی تیایەتی دەتوانێ ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنانە تۆمار بکات کە لەنێوان دوو کەسدا لە زەویدا

دەکرێ.....

## ◆ ◆ موشەکی سکور ◆ ◆

چیرۆکی مانگە دەستکردەکان بە موشەکی ((سکور)) لە ١٩ ئەیلولی ١٩٥٨ز دەستی پێکرد، کاتێ ئێستگەکانی ڕادیۆی جیهان یەکەمین نامەی دەنگی بەهۆی مانگی دەستکردەوە گوێزرایەوە. کە لە ئاسمامدا دەخولایەوە.

ئەوەی دەدوا ((دوایت ئیزەنهاو)) بوو. _ سەرۆکی ولایەتە یەیکگرتووەکانی ئەمریکا _ قسەکردنەکەی ڕاستەوخۆ نەبوو لەو ئان و ساتەدا بیگوازنەوە.... بەڵکو تۆمارکرابوو لەسەر شریتێك و لە موشەکێکدا دایان نابوو تا بە دەوری زەویدا بخولێتیەوە.... موشەکی ((سکور)) یەکەم موشەکی لەو جۆرە نەبوو، بەر لەوە حەوت موشەك تاقیکرابوونەوە. یەکەم موشەك ((سپۆتنگ _ ١)) بوو. کە لە ساڵێ ١٩٥٧ز بەرەڵلای ئاسمان کرا. گرنگی ((سکور)) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، بۆ یەکەمین جار چالاکیەکی پێ کرا سەلمێنرا کەوا دەتوانرێ پەیوەندی لاسکی بەهۆی مانگی دەستکردەوە ئەنجام بدرێ.....

لێرەدا دنیا یادی ڕۆماننووسی زانستی ((ئاراس کلارك)) کردەوە، کە لە ڕۆمانێکدا بیرۆکەی وێستگە ئاسمانیەکانی وروژاندووە، کە لەساڵی ١٩٤٥زدا بلاّوبۆتەوە. لەوێدا وتوویەتی: پەیوەندی پاشەڕۆژی پەیوەندی لاسکی کوتوپڕ لە نێو خەڵکیداو لە هەموو ولاّتانی جیهاندا بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە تەلەفزیۆنەوە هەیە، جێ بەجێ کردنی لەسەر بیرۆکەی مانگە دەستکردەکانەوە بەندە.....

ئەوەی ئاشکرایە، تەلەفزیۆن زەبزەبەی بەرز وەکو شەپۆڵ بەکار دێنێ، ئەو شەپۆلە زەبزەبیانە توانی ئەوەی نییە هەموو گۆی زەوی بەیەکەوە ببەستێتەوە، بۆیە بۆ پەیوەندی کردن بە شوێنە دوورەکانەوە لە ڕێگای

تەلەفزیۆنەوە، پێویستی بەوە هەیە وێستگە دابنرێت تا ئەو زەبەزەباتانە دووبارە بنێرێت....

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە کەس شتێکی ئاوای نەخوێندبووەوە نە بیستبووی لە زانایەکی ترەوە، بەر لە نووسەر ((ئاراسەر کلارك)) کەوا ئەو ئامازانەی لە وێستگەیەکی ئاسمانیەوە یان مانگێکی دەستکردەوە پەیدا دەبن، دەتوانێ ئەم کارە بکات، وە دەشتوانێ ڕووبەری نیوەی گۆی زەوی بگرێتەوە، سێ لەو مانگە دەستکردانە دەتوانن بە هەموو دنیای گرتۆتەوە.

ئەمە هەستێکی ڕاستەقینیە، پێشبینییەکی سەیرە.... ئارسەر، ئەندازیار نەبوو، زانایەکی تەکنەلۆجیا نەبوو.... بەلاّم موشەکی ((سکۆر)) ئەو بۆ چوونانەی ((ئارسەر))ی بەدیهێنا.... دوای سێ ساڵ هەنگاوێکی گەورەی دیکە نرا، کاتێ مانگی دەستکردی ((ئیکۆ)) _ یانی دەنگدانەوە _ بۆ ئاسمان نێردرا....

## ♦ ♦ کوریرو تلستار و هی تز ♦ ♦

ئەم مانگە دەستکردە، تا ڕادەیەکی زۆر لە باڵۆنێکی گەورە دەچێ.... تیرەکەی نزیکەی ٣٠م، ئەرکی وەرگرتنی ئامازە لاسیکیەکانە، کە لە وێستگەیەکەوە لەسەر ئەرز بۆی دەنێرن و دواجا دەیگەڕێنێتەوە بۆ وێستگەیەکی کە لە شوێنێکی کەدایە، یان بۆ چەند شوێنێکی دەنێرێت...

هەنگاوێکی لەمە پێشکەوتوتر ئەنجام درا، کاتێ مانگی دەستکردی ((کوریر _ b _ ١)) لەهەمان سساڵدا بەرەللاّی ئاسمان کرا. بە یەکەمین مانگی دەستکرد دەژمێردرێ لە لایەن چالاکی و بزوتنەوەو ناردنەوەی ئامازەکانیشیەوە. زانیارییەکانی وەردەگرت، کۆی دەکردەوەو دەیناردەوە بۆ وێستگەکانی زەوی.... لەتوانای هەبوو ٦٨٠٠٠ وشە لە

دەقیقەیەکدا کۆبکاتەوە. تا ئەو کاتەش خەونی ڕۆماننووسەکە بە تەواوی نەهاتۆتە دی، چونکی پێشبینیەکانی لە گواستنەوەی وێنەی تەلەفزیۆنی تێپەڕی کردبوو. بەلاّم خەونەکەی بەناردنی ((تلستار _ ۱)) لە ساڵی ۱۹٦۲ هاتە دی. مرۆڤ چووە ناو سەردەمێکی نوێوە، کاتیّ بەهۆی ((تلستار))ەوە توانرا، وێنە لە ئەمریکاوە بۆ ئەوروپا بنێردرێت. ڕۆژی ۱۱ حوزەیران ساڵی ۱۹٦۲ سەردەمی پەیوەندی وێنەی گیراو دەستی پێکرد. دوای مانگێك بەرنامەیەکی تایبەت بەهۆی ((تلستار))ەوە گوێزرایەوە، دانیشتوانی ئەوروپا لەسەر شاشە بچووکەکانیانەوە ئەو ڕووداوانەیان دەبینی کە لەو کاتەدا لە سروشت ڕویدەدا.......

هەموو ئەو مانگە دەستکردانە کە باسمان لێوە کردن و بۆ ئاسمان نێردراون زۆر بەرز نین لە زەوییەوە، تا هەر لە بواری وێستگەکاندا کە لەسەر زەوین بمێننەوە. زاناکان وایان بینی ئەگەر مانگێکی دەستکرد بنێردرێتە بۆشایی ئاسمان لە ((مداری)) هێڵی ئیستیوادا بسوڕێتەوە _ بەرەو ڕۆژهەلاّت_ و بەبەرزی ۲۲۳۰۰ میل بیّ لە زەوییەوە. ئەوا لەم بارەدا دەتوانیّ بەخێرایی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری زەویدا بجولێتەوە، ئەو کاتە وا دەردەکەویّ کەوا ناجولیّ و وەستاوە.... زاناکان کەوتنە جیّ بەجیّ کردنی ئەم بیرۆکەیە، ساڵی ۱۹٦۳ مانگێکی دەستکردیان هەڵدایە بۆشایی ئاسمان بەناوی ((ساینکم)) ..... مەدای خۆی بەسەر ئۆقیانووسی هیندیەوە وەرگرت.

### ◆ ◆ ئێرلی بێرو ئەنتلستات ◆ ◆

بەم ئەنجام گەیشتنە کۆتایی هیوای زاناکانی ئاسمان نەبوو. توانای ئەو مانگە دەستکردانە دیاریکراو بوو، هەمووکاتیّ وەکو دەیانەویّ کار ناکات. دەستیان بە هەوڵدان کرد تا ساڵی ۱۹٦٥ز مانگی دەستکردی

((ئیبرلی بیرد))یان خستنە مەدای دەرەوە لە بان ئۆقیانوسی ئەتلەسی. ئەمە سەرەتای بەکارهێنانی ((جورمی)) تەلەفزیۆنی بوو، هەروەها توانرا لە وەرگرتن و ناردنی قسەکردنی تەلەفۆنیدا بەکار بهێنرێ و لە دووری ٣٠٠٠ میلەوە بروسکە بنێردرێ. ((ئێرلی بێرد)) توانای بەیەکەوە بەستنی ٢٤٠ قسەکردنی تەلەفۆنی هەبوو. لەکاتێکدا دوای ماوەیەکی کەم لە ناردنی ((ئێرلی بێرد))یان ((ئنتلسات _ ١)) یەکێتی سۆڤێت ((مولینیا))ی بۆ ئاسمان نارد تا لە ڕۆژێکدا ١٢ سەعات پەیوەندییەکان بەیەك بگەیێنێ و بە شێوەیەکی هێلکەیی بە دەوری گۆی زەویدا دەخولایەوە. دوا ئەمە قۆناغێکی پێشکەوتووتر هاتە ئاراوە. چاکسازیان لە مانگە دەسکردەکان کرد، توانرا پەیوەندییە تەلەفۆنیەکان و ئاماژە بێ تەلەکان لە نێوان خۆی و زەویدا ڕێکبخات، سەرەڕای کارپێ کردنی لە کەناڵی تەلەفزیۆنی زیاتر، بەم جۆرە ((ئنتلستات _ ١))یان دروستکردو ساڵی ١٩٦٦ز بەڕەللای بۆشایی ئاسمانیان کرد. دواتر ساڵی ١٩٦٧ز سێ مانگی دەستکردی دیکەیان نارد تا پێکەوە کار بکەن.

لەم ماوەیدا لە نێوان ١٩٦٧ _ ١٩٧٠دا، گۆڕانکاری دیکەیان لە ((ئنتلستات))دا کرد. پێنج مانگیان لە ((ئنتلستات _ ٣ _))یان گەیاندە ئەوانی دیکە. بێگومان گۆڕانکارییەکان قەبارەی مانگەکانیشی گرتەوە بە شێوەیەك لەگەڵ کارو ئەرکەکانی و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیادا بگونجێ، ڕەنگە زیاد کردنی قەبارەکەنیان بەردەوام ببێ، کە کێشی زیاد دەکاو توانای کارکردنیشیان بێگومان زیاتر دەبێت.

## ♦ ♦ مانگی دەستکردی ئێرتنس ♦ ♦

لە حوزەیرانی ١٩٧٢ز مانگی دەستکردی ((ئێرتنس _ ١)) بۆ بۆشایی ئاسمان نێردرا، لە بنەڕەتدا بۆ سیخوڕی دانرابوو.... ئەم مانگە

دەستکردە لەمانە پێکهاتووە.

- ((ئەنیتن)) بۆ وەرگرتنی ئامۆژگارییەکان لە زەوییەوە.
- جیهازی ڕاستکردنەوەی گۆشەی ڕێڕەوی مانگەکە.
- ((لوحە)) بۆ گۆڕینی هێزی خۆر بۆ کارەبا.
- دوو ئەنتی بۆ ناردنی زانیارییەکان بۆ زەوی.
- ئامرازێك بۆ گونجاندنی تیشك بۆ ((عەدەسە))کان و بۆ چاو.
- ئەنتینی کۆکردنەوەی زانیاری.
- ئامێری وێنەگرتنی ئەلیکترۆنی.

مانگی دەستکردی ((ئیرتس)) بنکەیەکی پەیوەندی پێوەکردنی لە بنکەی ((ناسا)) دا هەیە کە بۆ لێکۆڵینەوەی بۆشایی ئاسمان لە ((ماریلاند)) دانراوە. ئامانجی لاوەکیشی هەیە بەسەرکەوتویی بەدی هێناوە.... لەوانە دۆزینەوەی سەرچاوەی جێگای سامانە سروشتیەکانی گۆی زەوی، پێنانەکردنی نرخ و بەهای .... ئەم مانگە دەستکردە لەماوەی ساڵێکدا ئەوەندە زانیاری لەبارەی ژینگەی زەوییەوە کۆکردەوە، کە شارەزایان هەموویان بەڕێگەی ئاسایی بەسەد ساڵ کۆی ناکانەوە. لەو زانیارییانە ئەوەی پەیوەندی بە کشتوکاڵ و دارستانەوە هەیە، بە سامانی دەریایی و دەیاردە جوگرافیەکان و سەرچاوەکانی ئاو، ئەو ناوچانەی ژینگەی پیس بووە، لەگەڵ زۆر ڕاستی دیکەدا کە زانایان دەستکاری تیورەکانیان کرد بە پێی ئەو زانیاریانە هۆی سەرکەوتنی ((ئیرتس)) بۆ ئەو هاوێنە تەینیانە هەمە لایەنانە دەگەڕێتەوە کە لەسەر ئامێری وێنەگرتنی خێراوە دانراون. دەتوانی زنجیرەیە وێنەی فۆتۆگرافی ڕووی زەوی پێکەوە بگرێت، پانی ئەو شوێنەی وێنەکەی دەگرێ ١١٤ میل دەگرێتەوە.

هاوێنەکانی ((عدسات)) پالاوتەی تیشکی هەیە: شین، سوور، ژێر

سوور. لە دوورونزیکیشەوە وێنە دەگرێ، دواجا بۆ جیاکردنەوە لە نێوان وێنەکاندا بەراورد دەکرێن، تا ڕاستی مسۆگەر بزانرێت. بۆ نموونە: بەروبوومی کشتوکاڵ لەسەر ڕووی زەویدا هەیە لە جێگای دیکە نییە، لە وێنەکاندا بەیەك ڕەنگ دەردەکەون. ئەگەر لە ژێر ئەو کشتوکاڵانەوە کانزا هەبێ ئەوا بە ڕەنگێکی تر دەردەکەوێت.

مانگی ((ئیرتس)) زانیارییەکان، وێنەکان کۆدەکاتەوە، دواجا بۆ ١٤٠ وێستگەی لەسەر زەوی دەنێرێ، ئەم کارەش بە شیوەیەکی ئۆتۆماتیك ئەنجام دەدات، لە زەویش، شی دەکرێتەوە لێکۆلینەوەی لەسەر دەکرێ و زانیارییەکان تۆمار دەکرین. زانیارییە سەربازییەکانیش، پەنتاگۆن وەریان دەگرێت، موخابەراتی مەرکەزی هەڵس و کەوتی لەگەڵدا دەکات

## ♦ ♦ دیاریکردنی ئەو ناوچانەی ژینگەیان تێدا پیس بووە ♦ ♦

بەرێکەوت مانگی دەستکردی ((ئیرتس)) وێنەی کارگەیەکی دروستکردنی کاغەزی لە نیویۆرك گرتبوو. دوای خوێندنەوەو لێکدانەوەی وێنەکە، داوایان لەسەر ئەو کارگەیە تۆمارکرد لە دادگا_ کە ئەم کێشەیە کەم وێنەیەو ڕوینەداوە _ حکومەت لە دادگا لەسەر خاوەنی ئەو کارگەیە سکاڵای تۆمار کرد کەوا ژینگەی گۆلی ((شامبلین)) پیس کردووە. بەڵگەکەشی ئەو وێنەیە بوو کە نانگە دەستکردەکە ناردبووی، دوای لێکۆلینەوە دەرکەوت وایە...

ئەرشیفی ئەو وێنانەی ((ئیرتس)) گرتوونی، سەدان کەناری دەریایی لە هەموو جیهاندا تیا دەرکەوتوون، کە ئاویی پیسی تێدا دەڕژێن وەکو پاشماوەی کارگەکان ئەو وێنانە ئەو ڕوبارانەی تیادانە کە بەهۆی جیاجیاوە ئاوەکاینان پیس بووە. کە دەبێتە مایەی مەترسی بۆ خواردنەوەی ئاودێری. بەمجۆرە ((ئیرتس)) کاری دیکەی ئەنجام دا کە

بە هیچ جۆرێ لە نرخ و مەبەستی دروستکردنی سەرەکی کەمتر نییە، ئەویش سیخوڕییە....

## ♦ ♦ دۆزینەوەی پەتای کشتوکاڵی ♦ ♦

ئەمریکا بەهۆی مانگە دەستکردەکانەوە توانی خاکی کیشوەرەکان بخوێنێتەوە. هەروەك كتێبێکی کراوەت لەبەر دەستدا بێ،
بنکەکانی موشەکی سۆڤێتی ئەوانەی سەری ئەتۆمیان هەیە، کەلی ((دفرسوار سالی ١٩٧٣))، جێگاو شوێنی کۆمەڵە سەربازییەکانی عێراق لە کاتی شەڕی کەنداودا.
لە بواری کشتوکاڵیدا، ((ئیرتس)) توانی وشیاری بە جوتیاران بدات سەبارەت بەو نەخۆشی و ئافاتانەی کە بەرهەمەکانیان خەریکە تووشیان دەبن، چونکی ئەو وێنانەی ئەو دەیناردن ڕەنگیان لە بەرهەمە کشتوکالیەکانی دیکە جیاوازبوون، ئەوانەی کە تووشی نەخۆشی نەبووبوون...... بەمجۆرە دەتوانرێ پێش وەخت جووتیارەکان ئاگادار بکرێتەوە. تا قەلاچۆی ئەو نەخۆشیانە بکەن.
هەروەها ئەو لە ٧٥٪ زەوییە کە ئاو داپۆشیوە دەردەخات. جۆرەکانی دیاری دەکات، ڕێژەی پێکهاتەکانی ئاشکرا دەکات، پلەی شۆرینی و سازگاری دەردەخات، بەفرو قولایی بەفرەکەت پێ دەڵێ، هەروەها گەلێ لایەنی دیکەی بۆ ئاشکرا دەکات. ئەو ناوچە مەییوو بەستەڵەکانەشی دیاری دەکات، تا دەگاتە ئەوەی چەندی ئاو تێدایە

## ♦ ♦ کریس بویس... سخوڕی مکانگە دەستکردەکان ♦ ♦

زۆر ئاساییە کەوا ئەمریکاو ڕوسیا، لەبواری پیشەسازی مانگی دەستکردەوە سیخوڕی لەسەر یەکتر بکەن. بە تایبەتی دوای ئەوەی ئەمریکا هەنگاوی گەورەی لەم بوارە هاوێشت.
مانگە دەستکردەکانی بەوە ناونرا: کەوا چاوی ئەمریکان و بەشەوو ڕۆژ

چاودێری جیهان دەکەن، لەناو ولأتەکاندا چی ڕوودەدا وەریان دەگرت، ئەو نامانەی لە نێوانیاندا بوو ئەمریکا پێی دەزانی.....

دەزگای موخابەراتی ئەمریکی ئەو مانگە بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان بەکاریان دەهێنا و ئەو زازنیاریانەی لە مەلەفی تایبەتیدا دادەنا. لە شوێنێکی سەختو قایمو لە ژێر چاودێرییەکی توندا ئەو زانیاریانە هەڵدەگیرێن....

لە چێشتخانەی ئەو بینایە کە زانیارییەکانی تێدایە. گەنجێکی هەژار ناوی ((کریس بویس))ە، خوێندنی ئامادەیی تەواو دەکاو توانای خوێندی زانکۆی نابێ... گەڵ کاربەدەستەوە دەگرێ، لەگەڵ شوێندا کار دەکات، تا ناسیاوێکیان یارمەتی دەداو لەو چێشتخانەیە کارێکی دەدەنێ...... کارکردن لەم شوێنەدا ئاسان نەبوو، شوێنێکی هەستیار بوو. دەبوایە بە گەڵ تاقیکردنەوەو ڕاهێنان تێپەڕێ. ((بویسی)) بۆی کراو ساڵی ١٩٧٤ز لەو کارە دامەزرا.

کە دامەزراو جێ پێی خۆی قایم کرد، توانی هاوڕێیەکی منداڵی خۆی بەناوی (دولتن لی)) لە ئسیتعلامات دامەزرێنێ

زۆری نەخایەند. هەردووکیان شارەزای شوێنەکە بوون. زانییان جێگای نهێنیەکانەو زانیارییەکانیش لە کۆکردنەوەی مانگە دەستکردەکانە...

سێ ساڵ لەوێ بوون هەموو شوێنێکیان پێ زانی.

موخابەراتی ڕوسی کەوتە هەواڵی ئەوەی ((بویسی)) قەناعەت پێ بهێنێ، لە دواییدا سیخوڕێکی ڕوسی توانی ((بویسی)) ڕازی بکات. بکەوێە کارکردن بۆ سۆڤێت. پێویستی بە پارە هەبوو، خەونی دەدی لە هەژاری دەرچێ، هاوڕێکەشی هەروابوو..... لە ڤییەننا لە ساڵی ١٩٧٧ لەگەڵ سیخوڕە ڕوسیەکەدا یەکیان بینی، ڕێنمایان پێ درا، ڕاهێنران خۆیان چۆن لە جیهازی هەستایر کە پاسەوانی ئەوێی دەکرد

لابدەن. فێری ئەوەش بوون، چۆن بەڵگەنامەکان وێنە بگرن و بەبێ تەل و شفرە نامە بنێرن و چۆن بە مەرەکەبی نهێنی بەکاردێنن. لەسەر چاوپێکەوتنەکانی داهاتوشیان ڕێککەوتن و چۆن زانیارییەکان دەگەیەنن و پارە وەردەگرن.

هەردوو هاوڕێکە توانیان خۆیان بگەیننە ئەو شوێنانەی نهێنییەکانی تێدایە، وێنەی هەندێکیان گرت و گەیاندیانە سۆڤێت. بەڵام ساڵی ١٩٧٧ کۆتایی نەهات یەکێ لە یاساوڵەکانی گرتنیانی

هەردووکیان دانیان پێدانا، کەوا هەزاران بەڵگەیان گەیاندۆتە سۆڤێت.... بەحوکمی هەتایە حوکم دران و هەریەکەو بەجیا لە زیندانیکیان دانان

## ♦ ♦ سەرچاوەکان ♦ ♦


- جواسيس غيروا مجرى التاريخ _ تأليف: نر صالح.
- الجاسوسية بين الوقاية والعلاج_ تأليف: احمد هانى.
- Anototmy of Spying _ by Ronagd Seth.
- Timespan Spies _ Tim Healy.
- Espronage _ Mark Flayd.
- War of Wits- Ladislas Jarago.
- The jnvsible Government – David Wise.
- Spies- Arnist Velkman.
- Spy – Richard Deacon – Nigel West.

سیخوڕی پڕۆسەی تینوشکاندنی سەربزێوی‌و تێرکردنی ئارەزوی سووسەکردنە، خولیایەکی زکماکیە بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری‌و، ئاشکراکردنی نهێنیە شارستانی‌و سەربازییەکان لەڕێگای: کۆڵینەوە، بەدواداگەڕان، سەرنج‌و تێبینی‌و، پشکنین و بەدواداچوون و دزینی بەڵگەنامە و دیکۆمێنت و وێنەگرتن و لەبەرگرتنەوەی بەڵگەو ڕاپۆرتەکان.



لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ئاوێر ژمارە ٣٨

چاپخانەی ڕۆژهەلات/هەولێر